


# وەڵامی پرسیارە شەرعییەکانی سایتی بەهەشت

- وەڵامی زیاتر لە (١٠٠) پرسیاری شەرعی گرنگ -

لە لایەن

مامۆستا : (م.ـحمد عبد الر ن لطیف)ـەوە

**پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی شێخ إبراهیم / کەلار**

**چاپی یەکەم** **(١٤٣٣ ك)**

---

لەبڵاوکراوەکانی




**www.ba8.org**

malpariba8@yahoo.com

07701517378

هەمیشە لەگەڵمان بن بۆ بەرهەمی نوێ

**کتێبی ژمارە ﴿١٦٠﴾ لە کتێبخانەی ماڵپەڕی بەهەشت**

بسم الله الرحمن الرحيم

*** پێشەکی :**

**إن الحمد ـ نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذُ بِا ـ من شرورِ أنفُسِنا ومن سيئات أعمالنا من يهده ا ُ فَلا مضل له ومن يضللْ فَلا هادي له .**

**وأشهد أنْ لا إله إلا ا ُ وحده لا شريك لَـه ، وأشهد أن محمداً عبده ورسولُه .**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ **[آل عمران].**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ **[النساء] .**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ **[الأحزاب] .**

**أما بعد :**

**فَإِن أصدق ا َديث كتاب ا ـ وخير ا َديِ هدي محمد (صلى ا ُ عليه وعلَى آله وسلم) وشر الأمور محدثَاتها وكُل محدثَة بِدعةٌ وكُل بِدعة ضلالَةٌ وكُل ضلالَة في النار .**

خوێنەری بەڕێز :

ـ ئەم کتێبەی بەردەستت بریتی‌یە لە ﴿وەڵامی هەندێك لەو پرسیارە شەرعی‌یانەی کە لە ڕێگای (**سایتی بەهەشت**)ـەوە ئاراستەی براتان کراوە﴾ کە بە بەڵگەی ئایەتـەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتڕاستکراونەتەوە .

ـ وە ئەمە هەوڵی چەند ساڵێکی پێش ئێستا بوو .. برای بەڕێزم (کاك جەلیل / سەرپەرشتیاری **سایتی بەهەشت**)* زۆر لە مێژەوەبوو پێشنیاری ئەوەی بۆم کرد کە هەستم بە کۆکردنەوە و ڕێکخستن و پێداچوونەوەی و پاشان بە چاپ گەیاندی لە

---

* خوێنەری بەڕێز لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا پێناسەیەکی پوخت و چڕوپڕ دەخوێنیتەوە سەبارەت بە (سایتی بەهەشت / www.ba8.org) کە لە لایەن خوودی بەڕێز کاك (جەلیل) خۆیەوە ئامادەکراوە و خراوەتە سەر ئەم کتێبە .

دوتوێی كتێبێكدا بۆ ئەوەی بكەوێتە بەر دەستی خوێنەرانی (**ڕێنماییەكانی ڕێگای ڕاست**) و ئەوانیش وەك میوانانی سایتەكە پێی سوودمەند و بەهرەمەند ببن ، بەڵام بە هۆی زۆر سەرقاڵ بوونمەوە نەمتوانی لە كاتی خۆیدا ئاوات و پێشنیارەكەی بە دی بێنم .. ئەبوو ماوەیەك پێش ئێستا دەستمدایە و ووردەووردە و بەیناوبەین كەوتمە كاركردن لەو پێناوەدا و تاوەكو بە فەزڵ و یارمەتی خوا گەیاندمە ئەم ئاستەی كە ئێستا دەبینرێت .

لەم پێشەكییەدا بە پێویستی دەزانم كە چەند زانیارییەك بخەمە بەردەستی خوێنەرانی ئەم كتێبە :

* سەبارەت بە (واجبێتی پرسیاركردن لە كاتی نەزانیدا) .

* هەروەها سەبارەت بە (واجبێتی وەڵامدانەی پرسیارەكان لە لایەن ئەهلی عیلمەوە) .

* هەروەها سەبارەت بە (فەزڵ و پاداشتی وەڵامدانەی پرسیارەكان لە لایەن ئەهلی عیلمەوە) .

* هەروەها سەبارەت بە (ئادابەكانی پرسیار و وەڵام) .

* هەروەها سەبارەت بە (ئادابەكانی كەسی پرسیاركار و كەسی وەڵامدەرەوە / **آداب المستفتي والمفتي**) .

* ئەوەی كە من تێبینیم كردووە لەو پرسیارانەی كە لەم كتێبەدا وەڵامدراونەتەوە .

## * واجبێتی پرسیاركردن لە كاتی نەزانیدا :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((طَلَب الْعِلْمِ فَرِيضةٌ علَى كُلِّ مسلِمٍ))[1] .**

واتە : بەدەست خستن و گەڕان بە دوای زانستی شەرعی دا فەرز و پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك .

---

[1] **صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٢٤) .**

بێگومان پرسیارکردنیش ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی بەدەست خستن و فێربوونی زانستی شەرعی :

**قال الـحافظ : (... أن العلم سؤال وجواب)[٢].**

واتە : بەڕاستی عیلم و زانست بریتی‌یە لە : پرسیار و وەڵام .

بۆیە خوای زانا و دانا فەرمانی کردووە بە پرسیارکردن لە زانایان لە کاتی نەزانیدا :

﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ **[النحل ، والأنبياء : ٧] .**

واتە : پرسیار لە زانایانی شەرعزان بکەن ئەگەر نەتانزانی .

ئەم ئایەتە چەندین سوودی تێدایە گرنگترینیان بریتی‌یە لە :

١ ـ خەڵکی دەبن بە دوو بەشەوە : زانـــا و نەزان .

٢ ـ فەرزە لەسەر کەسانی نەزان پرسیار لە زانایان بکەن .

**وعن جابر (ﷺ) قَالَ : خرجنا في سفَر فَأَصاب رجلاً منا حجر فَشجه في رأسه ثُم احتلَم ، فَسأَلَ أصحابه فَقَالَ : هلْ تجِدونَ لي رخصةً في التيمم ؟ فَقَالُوا : ما نجِد لَك رخصةً وأَنت تقْدر علَى الْماءِ ، فَاغْتسلَ فَمات ، فَلَما قَدمنا علَى النبِي (ﷺ) أُخبِر بِذَلك ، فَقَالَ : ((قَتلُـوه قَتلَهم الله ، ألا سأَلُوا إِذْ لَم يعلَموا ؟ فَإِنما شفَاءُ الْعي الـسؤالُ ، إِنمـا كَـانَ يكْفيـه أَنْ يتيمم))[٣].**

واتە : لە سەفـەرێـکدا دەرچووین و پیاوێك بەردێکی بەرکـەوت و سـەری بریندار کرد ئەنجا لەشگران بوو ، پرسیاری کرد لە هاوەڵـەکانی و وتـی : ئایـا وا دەبیـنن کە مۆڵەتم بۆ هەبێت لە تەیەموم کردندا ؟

ئەوانیش وتیان : وا نابینین مۆڵەتت بۆ هەبێت لە تەیەموم کردندا لە کاتێکدا کـە تـۆ دەتوانیت ئاو بەکار بێنیت .

---

[٢] **فتح الباري شرح صحيح البخاري : (١ / ١٨٨) ،** وە بڕوانە لاپەڕە : **(٣٦)** و **(٢٨)**ی ئەم کتێبە .

[٣] **صحيح أبي داود رقم : (٣٣٦) .**

ئەویش خۆیی شۆرد و بەو هۆیەوە مرد ، جا کاتێك گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەوەیان پێڕاگەیاند .

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : کوشتیان خوا بیانکوژێت ، **ئایا بۆ پرسیاریان نەکرد لە کاتێکدا کە نەیانزانی ؟ چونکە بەڕاستی چارەسەری نەزانین پرسیار کردنە** ، تەنها ئەوەندەی بەس بوو کە تەیەمومی بکردایەت .

لەم فەرموودەیەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەوا : نەزانین نەخۆشیە و چارەسەرکردنیشی پرسیارکردنە و گەڕانەوەیە بۆ لای زانایان .

**قَالَ النضر بن شميلٍ ـ رحمه الله ـ :**

**((جالَست الْخليلَ بن أحمد عشرين سنةً ، فَكُنت أسمعه كَثيراً ينشد :**

**إذَا كُنت لا تدرِي ، ولَم تك بِالْذي**

**يسائلُ من يدرِي فَكَيف إذَنْ تدرِي ؟))[٤].**

واتە : (**النضر بن شميل**) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

بیست ساڵ لەگەڵ (**الْخليل بن أحمد**) دانیشتن و هەڵسوکەوتم کردووە زۆر جار گوێم لێیبوو ئەم بەیتەی دەوتەوە :

ئەگەر تۆ نەتزانی ، وە ئەو کەسەش نەبویت .. کە پرسیار بکات لەو کەسەی کە دەزانێت باشە ئیتر چۆن دەزانیت ؟

**وقَالَ عبد الْملك بن إدريس الْجزيري :**

**(إذَا كُنت لا تدرِي ، ولَم تك سائلاً**

**عنِ العلْمِ من يدرِي جهلْت ولَم تدرِي)[٥].**

واتە : ئەگەر تۆ نەتزانی ، وە پرسیاریشت نەکرد .. سەبارەت بە عیلم و زانست لەو کەسەی کە دەزانێت ئەوا نازانیت و فێریش نابیت .

---

[٤] الـمجالس الدينورية : (١ / ١٢٨) ، نقلاً عن "منتقى الفوائد" لفيصل الـحاشدي ( ٣ / ١٥) .

[٥] مع الـحكم والأمثال .

*** پێویستە پرسیار تەنها لە زانایان بکرێت :**

دەبێت ئەوەش بزانرێت کە پرسیارە شەرعی‌یەکان دەبێت تەنها ئاراستەی زانایان و ئەهلی عیلم بکرێت هەوەکو چۆن خوای گەورە فەرمانی پێ‌کردووە ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ ...﴾ وە نابێت رووبەڕووی کەسانی نەزان بکرێتەوە چونکە نەزانەکان بە ڕاوبۆچوون و هەواوئارەزووی خۆیان و بە بێ‌زانست وەڵامدەدەنەوە و دەبنە هۆی گومڕابوونی خۆیان و گومڕاکردنی ئەو کەسانەش کە پرسیاریان لێ‌دەکەن :

**عن عبد الله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنه) قالَ : سمعت رسولَ الله (ﷺ) يقُـولُ : ((إن اللـه لاَ يقْبِض الْعلْم انتزاعاً ينتزعه من الناسِ ولَكن يقْبِض الْعلْم بِقَبضِ الْعلَماءِ حتى إِذَا لَم يبقِ عالمـاً اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسَاً جُهَّالاً فَسئلُوا فَأَفْتوا بِغير علْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا))[٦].**

واتە : خوای گەورە (عیلم و زانست) هەڵناگرێتەوە بە دەرهێنانی لە ناو سینگی خەڵکدا ، بەڵکو عیلم هەڵدەگرێتەوە بە مردنی (زانایان) هەتاکو زانا نامێنێت ئەو کاتە خەڵك سەرەنەزان بۆ خۆیان دادەنێن ، ئەو سەرە نەزانانەش پرسیاریان لێ‌دەکرێت و ئەوانیش بە بێ عیلم فەتوا دەدەن : ئەو کاتە هەم خۆیان گومڕا دەبن و هەم خەڵکیش گومڕا دەکەن .

وە لە ریوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((يستفْتونَ فَيفْتونَ بِـرأْيِهم فَيضلونَ ويضلونَ))[٧].**

واتە : پرسیاریان لێ‌دەکرێت و ئەوانیش فەتوا دەدەن بە بۆچوونی خۆیان : ئەو کاتە هەم خۆیان گومڕا دەبن و هەم خەڵکیش گومڕا دەکەن .

بۆ زانیاری زیاتر لەم بوارەدا بگەڕێرەوە بۆ نامیلکەی : (**گەڕانەوە بۆ لای زانایانی ئەهلی سوننە پارێزەرە لە گومڕابوون و لە تیاچوون**) .

---

[٦] صحيح البخاري رقم : (١٠٠) وصحيح مسلم رقم : (٦٧٣٧) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٢٦٥٢) .
[٧] صحيح البخاري رقم : (٧٣٠٧) ، وانظر شرح الحديث "فتح الباري" : (٣٤٨/١٣) .

*** واجبێتی وەڵامدانەی پرسیارەکان لە لایەن ئەهلی عیلمەوە :**

خوای پەروەردگار لە قورئاندا هەڕەشە دەکات لە ئەو کەسانەی کە زانستی بە سوودیان پێیە و کە چی دەیشارنەوە و ڕایناگەیەنن و بۆ خەڵکی روون ناکەنەوە ، بۆیە وەڵامدانەوەی پرسیارە شەرعیەکان واجبێکی شەرعی لەسەر زانایان و وەڵامنەدانەوەشیان بۆ پرسیارە شەرعیەکان ـ ئەگەر وەڵامەکە بزانن ـ جۆرێکە لە جۆرەکانی شاردنەوەی زانست :

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ (١٥٩) إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ (١٦٠) ﴾ [البقرة] .

واتە : بەڕاستی ئەو کەسانەی ئەوەی کە ئێمە دامانبەزاندووە لە بەڵگەکان و ڕێنمایی دەشارنەوە لە پاش ئەوەی کە ئێمە لە نێو کتێبەکەماندا روونمان کردووەتەوە بۆ خەڵکی ئا ئەوانە خوا لەعنەت و نەفرەتیان لێدەکات و لەعنەتکارانیش لەعنەت و نەفرەتیان لێدەکەن (١٥٩) جگە لەوانەیان نەبێت کە تەوبەدەکەن و خۆیان چاك دەکەن و ڕاستیەکان روون دەکەنەوە ئا ئەوانە من تەوبەیان لێوەردەگرم و لێیان خۆش دەبم ، وە من لێبووردە و بە بەزەییم .

**وعن أبِي هريرةَ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((من سئلَ عن علْمٍ فَكَتمه أُلْجمه الله بِلجامٍ من نارٍ يوم الْقيامة))[8].**

واتە : هەرکەسێك پرسیاری زانستێکی لێکرا و ئەویش شاردیەوە ئەوا خوا لغاوی دەکات بە لغاوێك لە ئاگر لە ڕۆژی قیامەتدا .

[8] صحيح سنن أبـي داود رقم : (٣٦٥٨) .

*** پێویستە زانایان بە بەڵگەوە وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە :**

خوای گەورە لەبەر ئەوە فەرمانی کردووە بە نەزانەکان کە پرسیارەکانیان ئاراستەی (أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ) بکەن تاوەکو ئەوانیش بە (ٱلذِّكۡرِ) وەڵامیان بدەنەوە ، (ٱلذِّكۡرِ)یش بریتییە لە قورئان .. وە فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) تەفسیر و ڕوونکەرەوەن بۆ قورئان :

خوای گەورە سەبارەت بە قورئان فەرموویەتی : ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ [الحجر] .

واتە : ئێمە خۆمان (ٱلذِّكۡرَ / قورئان)مان دابەزاندووە و خۆشمان دەیپارێزین .

وە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرموێت :

﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ ... ﴿٤٤﴾ ﴾ [النحل] .

واتە : وە ئێمە (ٱلذِّكۡرَ / قورئان)مان دابەزاندووە بۆ تۆ بۆ ئەوەی ڕوونیکەیتەوە بۆ خەڵکی ئەوەی کە بۆیان دابەزێنراوە .

کەواتە پێویستە لەسەر (أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ) لە وەڵامەدانەوەی پرسیاری نەزانەکاندا وەڵامەکانیان پشتڕاستبکەنەوە بە : (ٱلذِّكۡرَ / قورئان) و ڕوونکەرەوەکەی (لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ / فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەر ﷺ) .

ئەگەر هەندێك تێفکران و تێڕمان بکەین لە سیاقی ئەم ئایەتانەی خوارەوە ئەوا ئەم ڕاستیەمان زۆر بە جوانی بۆ ئاشکرا دەبێت :

خوای گەورە سەبارەت بە قورئان فەرموویەتی : ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ [النحل] .

واتە : ئەی پێغەمبەر لە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێكمان نەناردووە ﴿بە بەڵگەكان و كتێبەكان﴾* ئیللا پیاوانێك نەبێت كە وەحییمان بۆ ناردوون ، بۆیە پرسیار لە زانایان (أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ) بكەن ئەگەر نەتانزانی .. وە ئێمە (ٱلذِّكۡرَ / قورئان)مان دابەزاندووە بۆ تۆ بۆ ئەوەی روونیكەیتەوە بۆ خەڵكی ئەوەی كە
بۆیان دابەزێنراوە و بۆ ئەوەی بیربكەنەوە .

تێڕامێنیّ لەم وشانە : (أَرۡسَلۡنَا ) ، (نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡ) ، ( بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ) ، (وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ ) ، (لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ ) :

دەبینیت هەموویان تەعبیر دەكەن لە : ناردنی پەیام و وەحیی بۆ ناردن بە بەڵگەكان و كتێبەكان ، دابەزاندنی (ٱلذِّكۡرَ / قورئان) و ڕاسپاردنی پێغەمبەر
(ﷺ) بە روونكردنەوەی ئەو (ٱلذِّكۡرَ / قورئان)ـەی كە بۆی دابەزیوە لە خواوە .

دەبینین لە میانەی باسەكانی ناردنی (پەیام و وەحیی و بەڵگە و كتێب و
ذیكر / قورئان)ـدا باسی پرسیاركردن لە (ئەهلی ذیكر) كراوە ، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە دەبێت (زانایانیان / ئەهلی ذیكر) تەنها بە وەحیی و بەڵگەوە وەڵامی پرسیارەكان بدەنەوە و زانیاری و ڕێنمایی پێشكەش بە خەڵك بكەن .

هەروەها فەتوادان و وەڵامدانەوەی پرسیارە شەرعیيەكان بە بێبەڵگە بەرپرسیارێتی تێدایە ، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦ ﴾ [الإسراء] .

---

* فائدة لطلبة العلم : قال الط ي تفس هاته الآية : (... فتأويل الكلام إذن : وما أرسلنا من قبلك إلا رجالا نوحي إليهم أرسلناهم بالبينات والزبر ، وأنزلنا إليك الذكر ، والبينات : هي الأدلة وا جج ال أعطاها ا رسله أدلة على نبوتهم شاهدة م على حقيقة ما أتوا به إليهم من عند ا ، والزبر: هي الكتب) .

وقال ابن كث : ( ذكر تعا أنه أرسلهم {بِالْبينات} أي: بالدلالات وا جج ، {والزبر} وهي الكتب ، قاله ابن عباس و اهد والضحاك وغ هم ... قال تعا : {وأنزلْنا إِلَيك الذكْر} يع : القرآن ، {لتبين للناس ما نزلَ إِلَيهم} من ر م ، أي : لعلمك بمع ما أنزل عليك ، وحرصك عليه ، واتباعك له ، ولعلمنا بأنك أفضل ا لائق وسيد ولد آدم ، فتفصل م ما أ ل ، وتب م ما أشكل) .

واتە : قسە لە شتێکدا مەکە کە عیلمت پێی نیە .. بەڕاستی بیستن و بینین و دڵ هەموو ئەوانە بەرپرسیارن سەبارەت بەوە .

وە پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرموویەتی : **((الْقُضاةُ ثَلاثَةٌ قَاضِيان في النارِ وقَاضٍ في الْجنة : قَاضٍ قَضى بِالْهوى فَهو في النارِ ، وقَاضٍ قَضى بِغيرِ علْمٍ فَهو في النارِ ، وقَاضٍ قَضى بِالْحق فَهو في الْجنة))[9].**

واتە : قازیەکان سیانن دوو قازیان لە ناو ئاگردان و یەك قازیشیان لە ناو بەهەشتدایە : قازیەك کە بە هەواوئارەزوو بریاردەدات ئەوە لە ناو ئاگردایە ، وە قازیەك کە بە بێعیلم بریاردەدات ئەویش لە ناو ئاگردایە ، وە قازیەك کە بە حەق و ڕاستی بریاردەدات ئەوە لە ناو بەهەشتدایە .

**و روایة : ((... رجلٌ علم الْحق فَقَضى بِه فَهو في الْجنة ، ورجلٌ قَضى للناسِ علَى جهلٍ فَهو في النارِ ...))[10].**

واتە : پیاوێك حەق دەزانێت و بڕیاری پێدەدات ئەوە لە ناو بەهەشتدایە ، وە پیاوێك بڕیاردەدات بۆ خەڵك لەسەر جەهل ونەزانی ئەوەش لە ناو ئاگردایە .

هەرچەندە ئەم فەرموودەیە باس لە (قازی) و (بڕیاردان) دەکات بەڵام (موفتی) و (فەتوادان)یش دەگرێتەوە چونکە (موفتی)ش بڕیاردەدات لەسەر پرس و بابەتە شەرعیەکان و (فەتوادان)یش (بڕیاردان)ە لەسەر پرس و بابەتە شەرعیەکان .

**وعن يحيى بنِ سعيد قَالَ : (سئلَ الْقَاسم ابن عبيد الله بنِ عبد الله بنِ عمر عن شيءٍ فَلَم يكُن عنده جواب ! فَقُلْت : إني لَأعظم أَنْ يكُونَ مثْلُك وأَنت ابن إمامي الْهدى [ابن أَبِي بكْرٍ وعمر][11] يسأَلُ عن شيءٍ لَيس عندك فيه علْم !**

---

[9] **صحيح الـجامع الصغ رقم : (٤٤٤٧) .** [10] **صحيح الـجامع الصغ رقم : (٤٤٤٦) .**

[11] **و رواية : ((وأَنت ابن إمامي الْهدى يعنِي عمر وابن عمر)) .**

**قال الإمام النووي : (وأَما قَوله في الرواية الْأُولَى للْقَاسمِ بن عبيد الله : "لأَنك ابن إمامي هدى أَبِي بكْرٍ وعمر ﵄" ، وفي الرواية الثانِية : "وأَنت ابن إمامي الْهدى يعنِي عمر وابن عمر ﵄" فَلَا مخالَفَة بينهما : فَإِن الْقَاسم هذَا هو ابن عبيد الله بن عبد**

**فَقَالَ : أعظَم من ذَلك والله عند الله وعند من عقَلَ عن الله أنْ أقُولَ بِغيــرِ علْــمٍ أو أحدثَ عن غَير ثقَة)[١٢].**

واتە : **(يحيى بن سعيد)** فەرموویەتی : پرسیاری کرا لە (**القَاسم ابن عبيد الله بن عبد الله بن عمر**) سەبارەت بە شتێك ئەویش وەڵامی پێنەبوو !

منیش وتم : بەڕاستی بە لای منەوە ناڕەحەتیەکی گەورەیە نموونەی تۆ کە کوڕی (**أبو بكْر و عمر**)ی پرسیارت لێبکرێت سەبارەت بە شتێك و تۆیش زانیاریت پێنەبێت لەبارەیەوە !

ئەویش فەرمووی : سوێند بە خوا لە ئەوە گەورەتر بە لای خوا و بە لای کەسێکیشەوە کە لە خوا تێگەیشتبێت ئەوەیە کە بە بێ عیلم قسە بکەم یان لە کەسێکی متمانەپێنەکراوەوە شت بگێڕمەوە .

**وقال الإمام أ د : (لَا يجوز الْإفْتاءُ إلا لرجلٍ عالمٍ بِالْكتابِ والسنة)[١٣].**

واتە : فەتوادان دروست نی‌یە ئیللا بۆ پیاوێکی زانا و شارەزا بە قورئان و سوننەت نەبێت .

**وقال أبو حنيفة : (إياكم والقول دين ا تعا بالرأي ، عليكم باتباع السنة فمن خرج عنها ضل)[١٤].**

واتە : ئامان قسە لە دین و ئاینی خوای گەورەدا نەکەن بە ڕاوبۆچوون ، پەیوەست بن بە شوێنکەوتنی سوننەتەوە چونکە هەرکەسێك لە سوننەت دەربچێت ئەوا گومڕا دەبێت .

---

الله بن عمر بن الخطاب فهو ابنهما ، وأم القاسم هي أم عبد الله بنت القاسم بن محمد بن أبي بكْر الصديق ، فأبو بكْـر جـده الأعلى لأمه وعمر جده الأعلى لأبيه وابن عمر جده الحقيقي لأبيه رضي الله عنهم أجمع ) شرح صحيح مسلم : (١ / ٥٠) .

[١٢] مقدمة صحيح مسلم رقم : (٣٣) و (٣٤) وأخلاق العلماء للإمام الآجري رقم : (١٠٥) .

[١٣] إعلام الـموقع : (٢ / ٨٤) . [١٤] (الـمستخرج على ا ستدرك للحاكم) للحافظ العراقي : (١/ ٥) .

**وقال ابن أبـي العز الـحنفي : (ومن يتكلم برأيه وما يظنه دين الله ولم يتلق ذلك مـن الكتابِ والسنة فهو مأثوم وإنْ أصاب ، ومن أخذَ من الكتابِ والسنة فهو مأجور وإنْ أخطأ ، لكن إنْ أصاب يضاعف أجره)[١٥].**

واتە : هەركەسێك قسە بكات بە ڕاوبۆچوونی خۆی و بەوەی كە ئەو واگومـان دەبـات دینی خوایە و ئەوەشی لە قورئان و سوننەتەوە وەرنەگرتبێت ئەوا ئـەو كەسـە تاوانبـارە ئەگـەر چـی حـەقیش بپێكیـت ، وە هـەركەسـێك بیروبـاوەڕ و زانیاریـەكانی لـە قورئـان و سوننەتەوە وەربگرێت ئەوا ئەو كەسە پاداشـت دەدرێتـەوە ئەگـەر چـی هەڵـەش بكـات و نەیپێكێت ، بەڵام ئەگەر حەق بپێكیت ئەوا پاداشتەكەی زیاتر و چەند بەرامبەرە .

*** پێویستە لە كاتی نەزانیندا بوترێت : (لا أدري) نـازانـم :**

**عن محمد بنِ جبيرِ بنِ مطعمٍ عن أبِيه (ﷺ) : ((أن رجلاً أتى النبِي (ﷺ) فَقَالَ : يا رسولَ اللـه أي البلْدان شر ؟ فَقَالَ : لا أدري ، فَلَما جاءَه جِبريلُ علَيه السلام قَالَ : يا جِبريلُ أي البلْدان شر ؟ قَالَ : لا أدري حتى أسألَ ربي عز وجل ، فَانطَلَق جِبريلُ علَيه السلاَم فَمكَثَ ما شاءَ الله ثُم جـاءَ فَقَالَ : يا محمد إنك سألتنِي : أي البلْدان شر ؟ فَقُلت : لا أدري ، وإني سألت ربي عز وجل : أي البلْدان شر ؟ فَقَالَ : أسواقُها))[١٦].**

---

[١٥] **شرح العقيدة الطحاوية :**

**فـائدة : سئل فضيلة الشيخ ابن العثيم : هناك من الناس من يفتـي بغ علم ، ما حكم ذلك ؟**

**فأجاب فضيلته بقوله : (هذا العمل من أخطر الأمور وأعظمها إثـماً ، وقد قرن ا سبحانه وتعا القول عليه بلا علم بالـشرك به ، فقال تعا :** ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ **[الأعراف] ...) [كتاب العلم / السؤال رقم : (٥٧)] .**

**ولمزيد الفائدة هذا الباب انظر الكتاب القيم لابن القيم : (إعلام الـموقع ) : (٦ / ٤٩ ـ ٥٢) .**

[١٦] **مسند الإمام أ د رقم : (١٧١٩٩) ومسند أبـي يعلى رقم : (٧٤٠٠) .**

**هذا الـحديث له طرق وروايات وشواهد تصل بـها إ رتبة الـحسن الصحيح ومنها غ هذا :**

**ـ عن محمد بن جبير بن مطعمٍ عن أبِيه (ﷺ) : ((أن رجلًا قَالَ : يا رسولَ ا ـ أي البلْدان أحب إِلى ا ـ ؟ وأي البلْدان أبغـض إِلى ا ـ ؟ قَالَ : لاَ أدرِي حتى أسألَ جِبرِيلَ ، فَأتاه فَأخبره جِبرِيلُ : أن أحب البِقَاعِ إِلى ا ـ المساجِد ، وأبغـض البِقَـاعِ إِلـى ا ـ الأسواق)) [مسند البزار رقم : (٣٤٣٠) ، قال الألبانـي : حسن صحيح كما "صحيح الترغيب والترغيب" رقم : (٣٢٥)] .** واتـە : پیاوێـك وتـی : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا خۆشەویتترین شوێن لای خوا كوێیە ؟ وە ڕقلـێبوترین شوێنیش لای خوا كوێیە ؟ فەرمووی : **نازانم** تاوەكو

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا خراپترینی شوێنەکان کوێیە ؟ فەرمووی : **نازانم** ، جا کاتێك (**جبريل عليه السلام**) هات بۆ لای فەرمووی : ئەی (**جبريل**) ئایا خراپترینی شوێنەکان کوێیە ؟ فەرمووی : **نازانم** تاوەکو پرسیارنەکەم لە پەروەردگاری گەورەم ، (**جبريل عليه السلام**) ڕۆیشت و ئەوەندەی کە خوا ویستی لێبێت مایەوە ئەنجا هات و فەرمووی : ئەی (**محمد**) تۆ پرسیارت لێم کرد : ئایا خراپترینی شوێنەکان کوێیە ؟ منیش وتم : **نازانم** ، وە من پرسیارم کرد لە پەروەردگاری گەورەم : ئایا خراپترینی شوێنەکان کوێیە ؟ فەرمووی : بازاڕەکانیەتی .

**وعن ابن عمر (ﷺ) : ((أن رجلاً سأله عن مسألة فقالَ : لا علْم لي بها ، فلما أدبر الرجلُ قالَ ابن عمر : نِعم ما قالَ ابن عمر سئلَ عما لا يعلم فقالَ : لا علْم لي به))[17].**

واتە : پیاوێك پرسیاری کرد لە (**ابن عمر**ﷺ) سەبارەت بە بابەتێك ئەویش فەرمووی : **زانیاریم پێ نییە لە بارەیەوە** ، جا کاتێك پیاوەکە پشتی تێکرد و ڕۆیشت (**ابن عمر**) فەرمووی : (**ابن عمر**) باشترین شتی فەرموو پرسیاری لێکرا سەبارەت بە شتێك کە نەیزانی فەرمووی : زانیاریم پێ نییە لە بارەیەوە .

**وعن الشعبي قالَ : (لا أدري نِصف العلْم)[18].**

واتە : **نازانم** نیوەی زانستە .

**قال الشيخ بكر أبو زيد : (فإنْ نصف العلم لا أدري ، فنصف الـجهل : يقال وأظن)[19].**

---

پرسیارنەکەم لە (**جبريل**) ، (**جبريل**)یش هات بۆ لای و هەواڵی پێدا کە : خۆشەویسترین شوێن لای خوا مزگەوتەکانە ، وە ڕقلێبوترین شوێنیش لای خوا بازاڕەکانە .

**ـ عن أبي هريرةَ (ﷺ) أن رسولَ الله (ﷺ) قالَ : ((أحب البلاد إلى الله مساجدها ، وأبغض البلاد إلى الله أسواقُها)) [صحيح مسلم رقم : (١٥٢٦) دون ذكر القصة] ، وانظر : "الثمر المستطاب" للإمام الألباني : (١ / ٤٩٧ ـ ٥٠٠) .**

واتە : خۆشەویسترینی شوێنەکان لای خوا مزگەوتەکانیەتی ، وە ڕقلێبوترینی شوێنەکانیش لای خوا بازاڕەکانیەتی .

**(17) سنن الدارمي رقم : (١٨٥) .**

**(18) سنن الدارمي رقم : (١٨٦) .**

**(19) حلية طالب العلم ص : (٦٠) .**

واتە : ئەگەر (**نازانم**) نیوەی عیلم و زانست بێت .. ئەوا (**دەڵێن و وابزانم و پێم وایە**) نیوەی جەهل و نەزانیە .

**عن مجالد قَالَ : (سئلَ الشعبي عن شيءٍ فَقَالَ : لاَ أدري ، فَقيلَ لَه : أما تـستحي مـن قَولك : لاَ أدري وأنت فَقيه أهل الْعراقَين ؟! قَالَ : لَكُن الْملائكَةَ لَم تستحِ حـ قَالَـت : ﴿ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ﴿٣٢﴾ ﴾ [البقرة])[20].**

واتە : پرسیارکرا لە (**الشعبي**) سەبارەت بە شتێك ئەویش فەرمووی : **نازانم** ، پێی وترا : ئایا شەرم ناکەیت لە وتەی : **نازانم** لە کاتێکدا کە تۆ فەقیە و زانای بەصرە و کوفەیت ؟! فەرمووی : بەڵام فریشتەکان شەرمیان نەکرد کاتێك کە وتیان : ﴿پاکیو بێگەردی بۆ تۆ خوایە ئێمە نازانین تەنها ئەوە نەبێت کە تۆ فێرت کردووین﴾ .

**قال النووي شرح حديث جـ يل : (قَوله ﷺ : "ما الْمسئُول عنها بِأَعلَم من السائل" : فيه أنه ينبغي للْعالمِ والْمفْتي وغَير ـا إِذَا سئلَ عما لَا يعلَم أَنْ يقُول : لا أعلَم ، وأن ذَلك لَـا ينقُصه بلْ يستدل بِه علَى ورعه وتقْواه ووفُورِ علْمه)[21].**

واتە : فەرمایشتی : "پرسیار لێکراو زاناتر نیە لە پرسیارکار" : سوودی ئەوەی تێدایە کەوا پێویستە زانا و موفتی و جگە لەمانیش ئەگەر پرسیاری لێکرا سەبارەت بە شتێك کە نایزانێت بڵێت : **نازانم** ، وە بەڕاستی ئەوەیە لێی کەمناکاتەوە بەڵکو ئەوە دەکرێت بە بەڵگە لەسەر وەرع و دونیانەویستی و خۆپارێزی و لەخواترسان و زۆری عیلم و زانستی .

---

**(20) الفقيه والـمتفقه للـخطيب البغدادي رقم : (1118) .**

**[21] شرح صحيح مسلم : (1 / 13) . وحديث جـ يل الـمشار إليه سيأتـي ذكره بتمامه الصفحة : (26) .**

*** یان بوترێت : (الله أعلم) خوا زاناترە :**

**عن عبد الله بن مسعود (رضي الله عنه) قَالَ : ((يا أيها الناس من علم شيئاً فَلْيقُلْ بِه ، ومن لَم يعلَـم فَلْيقُل : الله أعلم ، فَإن من العلْم أنْ يقُولَ لما لا يعلَم : الله أعلم ، قَالَ الله عز وجل لنبيه (ﷺ) : ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ٨٦﴾ [ص]))[٢٢].**

واتە : ئەی خەڵکینە هەرکەسێك شتێکی زانی ئەوا با بیڵێت ، وە هەرکەسێکیش نەیزانی ئەوا با بڵێت **خوا زاناترە** ، چونکە بەشێك لە عیلم ئەوەیە لە شتێکدا کە نایزانێت بڵێت : **خوا زاناترە** ، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەیی (ﷺ) فەرمووە : ﴿بڵێ من داوای پاداشتتان لێناکەم لەسەر گەیاندنی ئاینی خوا ، وە من لەو کەسانەش نیم کە زۆرلەخۆیان دەکەن و لە خۆیانەوە شت دەڵێن لە بارەی ئاینی خواوە﴾ .

**و رواية : ((من علم منكُم علْماً فَلْيقُلْ بِه ، ومن لَم يعلَم فَلْيقُلْ لما لا يعلَم : الله أعلَم ، فَإن العالم إذَا سئلَ عما لا يعلَم قَالَ : الله أعلَم ...))[٢٣].**

واتە : هەرکەسێك لە ئێوە زانستێکی زانی ئەوا با بیڵێت ، وە هەرکەسێکیش نەیزانی ئەوا سەبارەت بەوەی کە نایزانێت با بڵێت **خوا زاناترە** ، چونکە زانا ئەگەر پرسیاری لێکرا سەبارەت بە شتێك کە نەیزانێت دەڵێت : **خوا زاناترە** ...

**و رواية أخرى : ((من علم علْماً فَلْيقُلْ بِه ، ومن لَم يعلَم فَلْيقُل : الله أعلَم ، فَإن من فقْه الرجل أنْ يقُولَ لما لا علْم لَه بِه : الله أعلَم))[٢٤].**

---

[٢٢] **صحيح البخاري رقم : (٤٨٠٩) .**

**فائـدة : قال ابن كث تفس : (يقول تعا : قل يا مد لـهؤلاء ا شرك : ما أسألكم على هذا البلاغ وهذا النصح أجرا تعطونيه من عرض ا ياة الدنيا ﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ﴾ أي : وما أزيد على ما أرسلنـي ا به ، ولا أبتغي زيادة عليه بل ما أمرت به أديته لا أزيد عليه ولا أنقص منه وإنما أبتغي بذلك وجه ا عز وجل والدار الآخرة).**

واتە : خوای گەورە فەرموویەتی : ئەی (**محمـد**) بەو موشریکانە بڵێ : من داوای پاداشتتان لێناکەم لە شتە کۆتاییپێهاتووەکانی ژیانی دونیا بەمدەنێ لەسەر گەیاندنی ئاینی خوا و ئامۆژگاری کردنتان ، ﴿وە من لەو کەسانەش نیم کە زۆرلەخۆیان دەکەن﴾ واتە : وە من زیادە ناخەمە سەر ئەوەی کە خوا منی پێناردووە ، وە ناشمەوێت زیادە بخەمە سەری بەڵکو ئەوەی کە فەرمانم پێکراوە دەیگەیەنم و زیادەی ناخەمە سەر و لێیشی کەم ناکەم ، وە تەنها مەبەستیشم بەوە پاداشت و ڕەزامەنی خوای گەورە و ماڵی دوارۆژە .

[٢٣] **سنن الدارمي رقم : (١٧٩) .**

[٢٤] **صحيح مسلم رقم : (٦٩٩٧) .**

واتە : هەركەسێك زانستێكی زانی ئەوا با بیڵێت ، وە هەركەسێكیش نەیزانی ئەوا بـا بڵێـت **خوا زاناترە** ، چونكە بەشێك لە عیلم و فقـه و تێگەیـشتنی پیـاو ئەوەیـە لـە شـتێكدا كـە نایزانێت بڵێت : **خوا زاناترە** .

**وعن علي بن أبي طالب (رضي الله عنه) قالَ : ((إذا سئلتم عما لا تعلمونَ فاهربوا . قالوا : كيف الهرب يا أم   المؤمنِ   ؟ قالَ : تقولونَ : الله أعلم))[٢٥].**

واتە : ئەگەر پرسیارتان لـێكرا سەبارەت بە شتێك كە نەتانزانی ئەوا ڕابكەن .

وتیان : چۆن ڕابكەین ئەی فەرمانڕەوای باوەڕداران ؟

فەرمووی : دەڵێن : **خوا زاناترە** * .

---

[٢٥] سنن الدارمي رقم : (١٨٣) .

* فائـدة لطلبـة العلـم : قال الآجري    كتابه الـمستطاب "أخلاق العلماء" : (فلو أدب العلماء أنفسهم ، وغ هم ، ثل هذه الأخلاق ا كان عليها من مضى من أئمة ا سلم انتفعوا ا ، وانتفع م غ هم ، وبارك ا م فليل علمهم ، وصـاروا أئمـة يهندى م ، وأما ا جة للعالـم يسأل عن الشيء لا يعلمه ، فلا يستنكف أن يقول : لا أعلم إذا كان لا يعلم ، وهذا طريـق أئمـة ا سلم من الصحابة ، ومن بعدهم من أئمة ا سلم ، اتبعوا فـي ذلك نبيهم (صلى الله عليه وسلم) ، لأنه كان إذا سئل عن الشيء بـما لـم يتقدم له فيه علم الوحي من ا عز وجل فيقول : لا أدري ، وهكذا ب على كل من سئل عن شيء لـم يتقدم فيه العلم أن يقـول : ا أعلم به ، ولا علم به ، ولا يتكلف ما لا يعلمه ، فهو أعذر له عند ا ، وعند ذوي الألباب) ["أخلاق العلماء" ت الرقم : (٩٤)] .

وقال الشيخ عبدالر ن السعدي : (ومن أعظم ما يجب على الـمعلم أن يقولوا لـما لا يعلمونه : الله أعلم ، ولـيس هـذا بناقص لأقدارهم ، بل هذا مما يزيد قدرهم ، ويستدل به على كمال دينهم ، وتحريهم للصواب ، و توقفه عما لا يعلم فوائد كثـ ة : منها : أن هذا هو الواجب عليه .

ومنها : أنه إذا توقف وقال : الله أعلم ، فما أسرع ما يأتيه علم ذلك من مراجعته ، أو مراجعة غ ه ، فإن الـ ـمتعلم إذا رأى معلمه قد توقف جد واجتهد صيل علمها ، وا اف الـمعلم ا ، فما أحسن هذا الأثر !

ومنها : إذا توقف عما لا يعرف كان دليلاً على ثقته وأمانته وإتقانه فيما يجزم به من ا سائل ، كما أن من عرف منـه الإقـدام على الكلام فيما لا يعلم ، كان ذلك داعياً للريب كُل ما يتكلم به ، حتى الأمور الواضحة .

ومنها : أن الـمعلم إذا رأى منه الـمتعلمونَ التوقف فيما لا يعلم ، كان ذلك تعليماً لـهم وإرشاداً لـهذه الطريقة الـحسنة ، والاقتداء بالأقوال والأفعال أبلغُ من الاقتداء بالأقوال) [الفتاوى السعدية ص : (٦٢٨ ـ ٦٢٩)] .

*** فەزڵ و پاداشتی وەڵامدانەی پرسیارەکان لە لایەن ئەهلی عیلمەوە :**

(وەڵامدانەوەی پرسیارە شرعیەکان) بە لای زانایانەوە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێت : (**الإفتاء**) یان (**الفُتيا**) یان (**الفَتوى**) .

وە لە پێناسەی ئەمەشدا وتراوە : **(الفَتوى : هو بيان حكم ا تعا مسألة شـرعية بـمقتضى الأدلة الشرعية)**[٢٦].

واتە : فەتوا : بریتیە لە روونکردنەوەی حوکمی خوای گەورە لە پرسێکی شەرعیدا بە پێی ئەوەی کە بەڵگە شەرعیەکان دەیخوازێت .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ **[النحل ، والأنبياء : ٧] .**

واتە : پرسیار لە زانایانی شەرعزان بکەن ئەگەر نەتانزانی .

ئەم ئایەتە ئەوەی تێدایە کە : خەڵکی دەبن بە دوو بەشەوە : زانـا و نەزان .

ئەرکی سەرشانی کەسانی نەزان ئەوەیە کە : پرسیار لە زانایان بکەن .

وە ئەرکی سەرشانی کەسانی زانـاش ئەوەیە کە : وەڵامی پرسیاری نەزانەکان بدەنەوە .

کەواتە (وەڵامدانەوەی پرسیارە شرعیەکان و ڕێنمایی کردن و ڕێپیشاندنانی نەزانەکان) فەرزی کیفایەیە :

- وە بێگومان هەرکەسێکیش ئەم ئەرك و فەرزە بەجێبێت ئەوا پلە و پێگەی گەورەیە و فەزڵ و پاداشتی زۆرە :

**قال النووي ر ه ا : (اعلم أن الإفتاء عظيم ا طر ، كب ا وقع ، كث الفضل ، لأن الـمفتـي وارث الأنبياء ـ صلوات ا وسـلامه علـيهم ـ ـ وقائـ ـم بفـرض الكفاية)[٢٧].**

---

[٢٦] انظر : الـموسوعة الفقهية الكويتية : **(١١٤٨٢/٢)** وتفسـ أبو حيان : **(٢٧٩/٤)** وتفسـ الآلوسي : **(٢٤٦/١٢) .**

[٢٧] آداب الفتوى والـمفتـي والـمستفتـي للنووي ص : **(١٣) .**

واتە : بزانە کەوا بەڕاستی فـەتوادان (وەڵامدانـەوەی پرسـیارە شـرعـیـەکان) پلـە و پێگـەی گەورەیـە و فـەزڵ و پاداشـتی زۆرە ، چـونکە ئـەو مـوفتی واریـث و میراتگـری پێغەمبەرانە ـ درود و سەلامی خواین لەسەر بێـت ـ وە هەسـتاوە بـە بـەجێهێنانی فـەرزی کیفایە .

خوای گەورە لە قورئـانی پیـرۆزدا فەرموویـەتی : ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ١٢٢﴾ [التوبة] .

واتە : بۆ ئیمانداران نیـیە هەموویان بڕۆن بۆ جیهاد کردن لە بەرەی جەنگدا ، بـەڵکو بـا لـە هـەموو گروپێـك کۆمەڵـە کەسـانێك بـڕۆن بـۆ ئـەوەی لـە دیـن شـارەزابن و تێبگـەن و گەلەکـەیان وریـا و ئاگـادار بکەنـەوە ئەگـەر گەڕانـەوە بـۆ لایـان بـەڵکو وریاببنەوە .

**قال البغوي ر ه ا تفس هذه الآية : (والفقه : هو معرفة أحكام الدين ، وهو ينقسم إ فرض ع وفرض كفاية ، ففرض الع مثل : علم الطهارة والصلاة والصوم ، فعلى كـل مكلف معرفته ، قال الن (ﷺ) : ((طَلَب الْعِلْمِ فَرِيضةٌ علَى كُل مسلمٍ))[28] ، وكـذلك كـل عبادة أوجبها الشرع على كل واحد ب عليه معرفة علمها ، مثل : علم الزكاة إن كان لـه مال ، وعلم ا ج إن وجب عليه .**

**وأما فرض الكفاية : فهو أن يتعلم حـ يبلغ درجة الاجتهاد ورتبة الفتيا ، فإذا قعد أهـل بلـد عن تعلمه عصوا يعا ، وإذا قام من كل بلـد واحد فتعلمه سقط الفرض عن الآخرين ، وعليهم تقليده فيما يقع لـهم من ا وادث)[29].**

واتە : وە (**فیقـە**) بـریتـیـیە لـە شـارەزابوون لـە ئەحکامـەکانی دیـن ، وە ئەمـەش دەبێت بە دوو بەشەوە : (**فرض ع** ) و (**فرض كفاية**) ، جا (**فرض ع** / فەرزی سەر تاکە

---

[28] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٢٤) .

[29] تفسـ البغوي : (٢ / ٤٠٥) .

كەسێك) وەكو : زانستی پاك‌وخاوێنی و نوێژ و ڕۆژوو ، كە فەرز و پێویستە لەسەر هەموو ئەرك لەسەرێك شارەزای ببێت و بیزانێت ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : "بەدەست خستن و گەڕان بە دوای زانستی شەرعی‌دا فەرز و پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك" ، وە هەروەها هەموو پەرستش و عیبادەتێك كە خوا واجب و پێویستی كردبێت لەسەر هەموو تاكە كەسێك پێویستە لەسەری فێری ببێت و شارەزای ببێت ، وەكو زەكاتدان ئەگەر ماڵ و سامانی هەبوو ، وە زانستی حەج ئەگەر لەسەری واجب بوو .

وە (**فرض كفاية** / فەرزی سەر هەندێك لە تاكەكان كە بەس بێت) : بریتی‌یە لەوەی كەوا فێرببێت و شارەزا ببێت لە دین تاوەكو دەگاتە پلەی (**اجتـهاد**) و فەتوادان ، جا ئەگەر خەڵكی شارێك دانیشن و خۆیان فێر نەكەن ئەوا هەموویان سەرپێچیان كردووە و هەموویان تاوانبار دەبن ، وە ئەگەر لە هەموو شارێكدا یەك كەس هەستێت و لە دین شارەزا ببێت ئەوا فەرزێتی شارەزابوون لە دین لەسەر ئەوانەی تر دەكەوێت ، وە پێویستە لەسەر هەموو خەڵكی ئەو شوێنە پرسیار لە ئەو شارەزایە بكەن لەو ڕووداوانەی كە دێتە پێشیان و دەبێت كار بە وەڵامەكەشی بكەن .

كەواتە ئەو كەسەی كە هەڵدەسێت بە (وەڵامدانەوەی پرسیارە شرعی‌یەكان و ڕێنمایی كردن و ڕێ‌پیشاندنانی نەزانەكان) ئەركێكی شەرعی و فەرزێكی كیفائی بەجێ‌دێنێت .

وە بێ‌گومان بەجێهێنانی ئەركە شەرعی و فەرزە دینیەكان موسڵمانی پێ‌نزیك دەبێتەوە لە خوای گەورە ، وەك لە (فەرموودەیەكی قودسی)دا هاتووە خوای گەورە فەرموویەتی : ((**وما تقرب إلي عبدي بشيءٍ أحب إلي مما افترضت عليه**))[٣٠] .

واتە : وە عەبدەكەم بە هیچ شتێك لێم نزیك نابێتەوە خۆشەویست‌تر بە لامەوە وەكو ئەوەی كە فەرزم كردووە لەسەری .

---

[٣٠] **صحيح البخاري رقم : (٦٥٠٢) .**

ـ وە هەروەها (وەڵامدانەوەی پرسیارە شرعیەکان و ڕێنمایی کردن و ڕێپیشاندنانی نەزانەکان) جۆرێکە لە جۆرەکانی دەعوە و بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە ، بۆیە هەر فەزڵ و چاکە و پاداشتێك سەبارەت بە (دەعوە و بانگەوازکردن) هاتبێت ئەوا ئەم بوارەش دەگرێتەوە :

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾ [فصلت] .

واتە : کێ هەیە لە ئەو کەسە وتە و کرداری باشتر بێت کە بانگەواز دەکات بۆ لای خوا و کردەوەی چاکە دەکات و دەڵێت بەڕاستی من لە موسڵمانانم .

**وعن سهل بن سعد (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم) لعلي (رضي الله عنه) يوم خيبر : ((... ثُـم ادعهم إلى الإسلامِ ، وأخبِرهم بِما يجِب علَيهم من حق الله فيه ، فَوالله لأَنْ يهدي الله بِـك رجلاً واحداً خير لَك من أَنْ يكُونَ لَك حمر النعم))[31].**

واتە : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی خەیبەردا بە (**علـي** رضي الله عنه) فەرموو : ... ئەنجا بانگەوازیان بکە بۆ لای ئیسلام ، وە هەواڵیان بدەرێ بەوەی کە واجب و پێویستە لەسەریان لە حەق و مافی خوا تیایدا ، وە سوێند بە خوا ئەگەر خوا بە هۆی تۆوە یەك پیاویان هیدایەت بدات و بیخاتە سەر ڕێگای ئیسلامەتی ئەوا باشترە بۆت لە وشتری سوور .

ـ وە هەروەها ئەو کەسەی کە (وەڵامدانەوەی پرسیارە شرعیەکان) دەداتەوە جێی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەگرێتەوە لە گەیاندنی دینی خوای گەورەدا و بەو کارەی دەبێتە میراتگرێك لە میراتگرەکانی پێغەمبەران (**علـيهم الـصلاة والـسلام**) ، فەزڵ و چاکە و پاداشتی ئەم کارەش مەگەر تەنها خوا خۆی بزانێت چەند گەورەیە :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ ﴿٦٧﴾ ﴾ [المـائدة] .

---

[31] صحيح البخاري رقم : (٣٧٠١) وصحيح مسلم رقم : (٦١٧٣) .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی کە خوای پەروەردگارت دایبەزاندووە بۆت بیگەیە ، وە ئەگەر وا نەکەیت ئەوا پەیامەکەی خوات نەگەیاندووە .

**وعن عبد الله بن عمرو (رضي الله عنه) أن النبي (ﷺ) قالَ : ((بلغوا عني ولو آيةً))[٣٢].**

واتە : دینەکەی خوا لە منەوە بگەیەنن ئەگەر چی ئایەتیکیش بێت .

**وعن أبِي بكْرةَ (رضي الله عنه) أن النبي (ﷺ) قالَ : ((ليبلغ الشاهد الْغائب))[٣٣].**

واتە : کامتان ئامادەیە بـا ئەوەی کە بیستویەتی بیگەیەنێت بەوەی کە ئامادە نىیە .

ـ وە هەروەها ئـەو کەسـەی کـە (وەڵامدانـەوەی پرسـیارە شـرعـیـەکان) دەداتـەوە یەکێکە لـە میراتگرەکـانی پێغەمبـەر (ﷺ) و میراتـە زێڕینەکـەی بەسـەر خەڵکـدا دابـەش دەکـات ، فەزڵ و چاکە و پاداشتی ئەم کارەش مەگـەر تەنها خوا خۆی بزانێت چەند گەورەیە :

**عن أبِي الدرداءِ (رضي الله عنه) عن رسول الله (ﷺ) قالَ : ((إن الْعلَماءَ ورثَةُ الأنبياءِ ، وإن الأنبيـاءَ لَم يورثُوا ديناراً ولاَ درهماً ، وإنما ورثُوا الْعلْم ، فَمن أَخذَه أَخذَ بِحظ وافر))[٣٤].**

واتە : بەڕاستی زانایان میراتگری پێغەمبەرانن ، وە پێغەمبـەران دینـار و دیرهـەمیان بە میرات بە جێنەهێشتووە ، بەڵکو (علم و زانست)یان بە مـیرات بـە جێهێـشتووە ، جـا هەر کەسێك ئەو (علم و زانست)ـە ببات ئەوا بەشێکی زۆر لە خێری بۆ خۆی بردووە .

ـ وە هەروەها زانـا و فەقیه و موفتی و ئەو کەسەش کە بە فـەتوای زانایـان وەڵامـی پرسیارە شرعیەکان دەداتەوە بە (وەڵامدانەوەی پرسیارە شرعیەکان و ڕێنمایی کردن و ڕێپیشاندنانی نەزانەکان) ئەجر و پاداشتی ئـەو کردەوەیانـەیان دەسـت دەکـەوێت کـە موسڵمانان بە هۆی ئەوانەوە فێری دەبن و کردەوەی پێدەکەن تا مردنیان بە بێ ئەوەی لە پاداشتیان کەم بێتەوە :

---

[٣٢] صحيح البخاري رقم : (٣٤٦١) .

[٣٣] صحيح البخاري رقم : (٦٧) وصحيح مسلم رقم : (٣٢٩١) .

[٣٤] صحيح سنن أبـي داود رقم : (٣٦٤١ ) .

**عن أبي مسعود الأنصاري (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((من دل على خير فَلَه مثْلُ أجر فَاعله))[٣٥].** واتە : هەرکەسێك ڕێنمایی بکات بۆ چاکەیەك ئەوا نموونەی پاداشتی ئەو کەسەی بۆ ئەبێت کە ئەنجامی دەدات .

- وە هەروەها (وەڵامدانەوەی پرسیارە شرعی‌یەکان و ڕێنمایی کردن و ڕێ‌پیشاندنانی نەزانەکان) جۆرێکە لە جۆرەکانی فێرکردن و بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی ، بۆیە هەر فەزڵ و چاکە و پاداشتێك سەبارەت بە (فێرکردن و بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی) هاتبێت ئەوا ئەم بوارەش دەگرێتەوە :

**عن أبي هريرةَ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((إن مما يلْحق الْمـؤمن مـن عملـه وحسناته بعد موته : علْماً علمه ونشره ... ))[٣٦].**

واتە : بەڕاستی لەوەی کە دەگات بە ئیماندار لە کردار و چاکەکانی لە پاش مردنی : زانستێکە کە خەڵکی پێ فێرکردبێت یان بڵاویکردبێتەوە ...

- وە هەروەها (وەڵامدانەوەی پرسیارە شرعی‌یەکان) جۆرێکە لە جۆرەکانی زانستی بە سوود کە لە دوای مردنیش پاداشتەکەی بەردەوام :

**عن أبي هريرةَ (رضي الله عنه) أن رسولَ الله (ﷺ) قَالَ : ((إذَا مات الإنسانُ انقَطَع عنه عملُه إلا من ثَلاثَة : إلا من صدقَة جارية ، أو علْمٍ ينتفَع به ، أو ولَد صالحٍ يدعو لَه))[٣٧].**

واتە : ئەگەر ئادەمیزاد مرد ئەوا کردەوەکانی دەبڕێتەوە ئیللا لە سێ شتدا نەبێت : صەدەقەیەکی بەردەوام و نەبڕاوە ، **یان زانستێك سوودی لێ‌ببینرێت** ، یان منداڵێکی صاڵح کە دوعای خێری بۆ بکات .

ئەمانە هەندێك بوون لە فەزڵ و چاکە و پاداشتەکانی ئەهلی عیلم لە بەرامبەر وەڵامدانەوەیان بۆ پرسیارەکان شەرعی‌یەکانی موسڵمانان خوا ڕەحم بە مردووەکانیان بکات و زیندووەکانیانیش بپارێزێت و موفەقیان بکات بۆ زیاتر خزمەت کدرنی ئیسلام و موسڵمانان .

---

[٣٥] صحيح مسلم رقم : (٤٨٧٦) .

[٣٦] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤٢) .

[٣٧] صحيح مسلم رقم : (٤١٩٩) .

## * ئادابەکانی پرسیار و وەڵام :

لە گرنگترین ئادابەکانی پرسیار ئەوەیە کە پرسیارەکە ئەم چەند خاڵە لە خۆ بگرێت :

١ ـ زۆر روون بێت و ئاڵۆز نەبێت .

٢ ـ زۆر کورت بێت و درێژکردنەوەی بێسوودی تێدا نەبێت .

٣ ـ سەبارەت بە شتێك بێت کە رویدابێت یان لە ئەگەری روداندابێت .

٤ ـ سەبارەت بە شتانێکی گرنگ و بە بایەخ بێت و باسی شتی بێمانای تێدا نەبێت .

وە لە گرنگترین ئادابەکانی وەڵام ئەوەیە کە وەڵامەکە ئەم چەند خاڵە لە خۆ بگرێت :

١ ـ زۆر روون بێت و ئاڵۆز نەبێت .

٢ ـ زۆر کورت و پوخت و چڕوپڕ بێت و درێژکردنەوەی بێسوودی تێدا نەبێت .

٣ ـ تێروتەسەل بێت و وەڵامی هەموو بڕگەکانی پرسیارەکەی تێدا بێت بە شێوەیەك کە تینویەتی پرسیارکار بشکێنێت .

٤ ـ پشتڕاستکرابێتەوە بە بەڵگە شەرعیە ڕاست و روونەکان .

فەرموون ئێوە و فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە هەموو ئەم خاڵانەی سەرەوەی تێدا ـ هەم لە پرسیارەکان و هەم لە وەڵامەکانیشدا ـ بە روونی بە دی دەکرێن :

**عن عمر بن الْخطابِ (رضي الله عنه) قَالَ : ((بينما نحن جلُوس عند رسولِ الله (ﷺ) ذَات يـومٍ إِذْ طَلَع علَينا رجلٌ شديد بياضِ الثيابِ ، شديد سواد الشعرِ ، لاَ يرى علَيه أَثَر السفَرِ ، ولاَ يعرِفُـه منا أَحد ، حتى جلَس إِلَى النبِي (ﷺ) ، فَأَسند ركْبتـَيه إِلَى ركْبتيه ، ووضع كَفَّيه علَى فَخذَيـه ، وقَالَ : يا محمد أَخبِرنِي عنِ الإِسلامِ .**

**فَقَالَ رسولُ ا (ﷺ) : الإِسلاَم أَنْ تشهد أَنْ لا إِله إِلا ا ، وأَن محمداً رسولُ ا ، وتقيم الصلاةَ ، وتؤتي الزكَاةَ ، وتصوم رمضانَ ، وتحج الْبيت إِن استطَعت إِلَيه سبِيلا .**

**قَالَ : صدقْت .**

**فَعجِبنا لَـه ، يسأله ويصدقُه !**

**قَالَ : فَأخبِرنِي عنِ الإِيـمان .**

**قَالَ : أنْ تؤمن بِا ـ وملاَئكته وكُتبِه ورسِله واليومِ الآخر ، وتؤمن بِالْقَدرِ خيره وشرّه .**

**قَالَ : صدقْت .**

**قال : فَأخبِرنِي عنِ الإِحسان .**

**قَالَ : أنْ تعبد ا كَأَنك تراه ، فَإِنْ لَم تكُن تراه فَإِنه يراك .**

**قَالَ : فَأَخبِرنـي عن الساعة .**

**قَالَ : ما الـمسؤولُ عنها بِأعلَم من السائلِ .**

**قَالَ : فَأَخبِرنـي عن أماراتها .**

**قَالَ : أنْ تلِد الأَمةُ ربتها ، وأنْ ترى الْحفَاةَ العراةَ الْعالَةَ رِعاءَ الشاءِ يتطَاولُونَ في الْبنيان .**

**ثُم انطَلَق ، فَلَبِثْنا ملياً .**

**ثُم قَالَ : يا عمر أتدرِي منِ السائلُ ؟**

**قُلْت : ا ورسولُه أعلَم .**

**قَالَ : هذَا جِبرِيلُ أتاكُم يعلمكُم أمر دينِكُم))[٣٨].**

واتە : لە (عومەر)ەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی :

لە كاتێكدا كە ئێمە دانیشتبووین لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناكاودا پیاوێكی جل وبەرگ زۆر سپی و موو زۆر ڕەش دەركەوت بۆمان ، شوێنەواری سەفەر كردنی پێوە نە دەبینرا ، وە كەسیش لە ئێمە نەیدەناسی ، تاوەكو لە لای پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشت ، جا هەردوو ئەژنۆی دایە پاڵ هەردوو ئەژنۆی پێغەمبەرەوە ، و هەردوو لەپی خستە سەر هەردوو ڕانییەوە ، ئەنجا وتی :

ئەی (**محمد**) هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە ئیسلام .

---

[٣٨] صحيح مسلم رقم : (١) .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : ئیسلام بریتیـیە لەوەی کە شایەتی بدەیت بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نیی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا ، وە بەڕاستی (**محمد** ﷺ) پێغەمبەری خوایە ، و نوێژە فەرزەکان بە ڕێك و پێکی بکەیت ، و زەکات بدەیت ، و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت ، و حەجی ماڵی خوای گەورە ئەنجام بدەیت ئەگەر توانات هەبوو .

وتی : ڕاستت کرد .

ئێمەش سەرمان سوڕما لەوەی کە پرسیاری لێدەکات و کەچی بەڕاستیشی دەخاتەوە !

وتی : هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە ئیمان .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : ئیمان بریتی‌یە لەوەی کە باوەڕ بێنیت بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی ، وە باوەڕ بێنیت بە قەدر خێر و شەڕی .

وتی : ڕاستت کرد .

وتی : هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە چاکەکاری .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : چاکەکاری بریتی‌یە لەوەی کە خوا بپەرستیت وەکو ئەوەی کە بیبینیت ، وە ئەگەر تۆ خوا نەبینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێت .

وتی : هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : پرسیار لێکراو زاناتر نی‌یە لە پرسیارکار .

وتی : کەواتە هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە نیشانەکانی .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : کەنیزەك خاوەن و سەروەرەکەی خۆیی لێدەبێت ، وە دەبینیت کەسانێکی پێ پەتی (**الْحفَاة**) و ڕەش و ڕوت (**الْعـراة**) و هەژار و نەدار (**الْعالَة**) و شوانی مەڕ و ماڵات (**رِعاءَ الشاء**) بینایەی بەرز دروست دەکەن .

ئەنجا پیاوەکە ڕۆیشت و ئێمەش ماوەیەك چاوەڕێمان کرد .

ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەی عومەر ئایا دەزانیت ئەوەی کە پرسیاری کرد کێ بوو ؟

وتم : خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن .

فەرمووی : ئەمە (**جبریل**) بوو هات بۆ لاتان بۆ ئەوەی بواری ئاینەکەتانتان فێر بکات.

- بڕوانە بۆ کورتی و روونی و گرنگی پرسیارەکان و وەڵامەکانیش .

**سوودێك** : هەندێك لە ئەهلی عیلم لە میانەی ژماردنی سوودەکانی فەرموودەیەدا فەرموویانە : **(وفي الحديث دلالة على طريقة من طُرق التعليم : وهي السؤالُ الجواب)** [39].

واتە : ئەم فەرموودەیە ڕێنمایی تێدایە بۆ ڕێگایەك لە ڕێگاکانی فێرکردن کە بریتیە لە : پرسیار و وەڵام .

[39] فوائد وفوائد من الأربع النووية ص : (٤٩) .

*** ئادابەکانی کەسی پرسیارکار و کەسی وەڵامدەرەوە / آداب المستفتي والمفتي :**

لە گرنگترین ئادابەکانی کەسی پرسیارکار ئەوەیە کە :

**١ - بە پێی پیویست پرسیار بکات .**

**عن عبد الله بن مسعود (رضي الله عنه) قَالَ : ((سألت رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) قُلت : يا رسولَ الله أي العمل أفْضلُ ؟**

**قَالَ : الصلاةُ على ميقَاتها .**

**قُلت : ثُم أي ؟**

**قَالَ : ثُم بِر الْوالدين .**

**قُلت : ثُم أي ؟**

**قَالَ : الْجِهاد في سبِيل الله)) .**

**فَسكَت عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ، ولَو استزدته لَزادنِي[٤٠].**

واتە : پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا باشترین کردەوەیە کامەیە ؟

فەرمووی : نوێژکردن لە کاتی خۆیدا .

وتم : ئەنجا چی تر ؟

فەرمووی : ئەنجا چاکەکردن لەگەڵ باوك و دایکدا .

وتم : ئەنجا چی تر ؟

فەرمووی : جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا .

دوای ئەوە بێدەنگ بووم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ، وە ئەگەر پرسیاری زیاترم لێ بکردایەت ئەوا وەڵامی زیاتری دەدامەوە .

---

[٤٠] **صحيح البخاري رقم : (٢٧٨٢) وصحيح مسلم رقم : (٢٤٩) و (٢٥٠) .**

**قال الـحافظ ابن حجر : (قوله : "ولو استزدته" : يحتملُ أنْ يريد من هذا النوع وهو مراتب أفْضل الأعمال ، ويحتملُ أنْ يريد من مطلْق المسائل المحتاج إليها ، وزاد الترمـذي مـن طريـق المسعودي عن الوليد : " فسكت عني رسولُ الله (ﷺ) ولو استزدته لزادني " فكأنه استشعر منـه مشقة ، ويؤيده ما في رواية لمسلم "فما تركت أنْ أستزيده إلا إرعاء عليه" أي شفقةً عليه لئلا يسأم .**

**وفي الحديث : ... السؤالُ عن مسائلَ شتى في وقت واحد ، والرفْق بالعالم ، والتوقف عـن الإكثار عليه خشية ملاله ، وما كانَ عليه الصحابة من تعظيم النبي (ﷺ) والشفقة عليه ، وما كانَ هو عليه من إرشاد المسترشدين ولو شق عليه)[٤١].**

واتە : وتەی : "وە ئەگەر پرسیاری زیاترم لـێی بكردایەت" : لەوانەیە مەبەستی لەم جۆرە پرسـیارانە بێـت كـە بـریتـیـیـە لـە پلـەی باشـترینی كردەوەكـان ، وە لەوانەیـشە مەبەستی پرسیاركردن بێت بە ڕەهایی كە پێویستی پێیانـە ، وە (**الترمـذي**) لـە ڕێگـەی (**المسعودي**) لە (**الوليد**)ەوە ئەم زیادەیەی هێنـاوە : "دوای ئـەوە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بێدەنگ بـوو لـێم ، وە ئەگـەر پرسـیاری زیـاترم لـێی بكردایـەت ئـەوا وەڵامـی زیـاتری دەدامەوە" وەكو بڵـێی (**ابن مسعود**) هەسـتی بـە ناڕەحـەتی كردبێـت لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) ، وە ئەوەی كە لە ریوایەتەكەی (**مسلم**)دا هاتووە پشتگیری ئەمە دەكات : "وە من وازم‌نەهێنا لە زیاتر پرسیار لێكردنی تەنها لەبەر بەزەیی‌پیادا هاتنەوەی نەبێت" واتە : بەزەییم بە حاڵیدا هاتەوە بۆ ئەوەی بێزار و بێتاقەت نەبێت .

وە ئەم فەرموودەیە چەندین سوود و پەندی تێدایە لەوانە : ...

ـ پرسیار كردن سەبارەت بە چەندین پرس و بابەتی هەمەچەشن لە یەك كاتدا .

ـ وە بەزەیی هاتنەوە بە زانـادا .

ـ وە ڕاوەستان لە زۆر پرسیـار لـێكـردنـی لە ترسی بێزارنەبـوون و بێتاقەتنـەبوونی .

---

[٤١] فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٢ / ١٥) .

ـ وە ئەوەی كە صەحابەكان لەسەری بوون لـە بـە گـەورەڕاگرتنی پێغەمبـەر (ﷺ) و بەزەیی پیادا هاتنەوەی .

ـ وە ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری بوو لـە ڕێنمـایی كردنـی ئەوانـەی كـە داوای ڕێنماییان لـێ‌ی دەكرد ئەگەر چی ناڕەحەت و گرانیش بێت لەسەری .

**٢ ـ بە ئەدەب و ڕێزەوە پرسیارەكەی ئاراستە بكات .**

ئەمەش زۆر بە روونی لەم فەرموودەیەی (**أم سلمةَ**)دا (رضي الله عنها) بە دی دەكرێت :

**عن أم سلمةَ (رضي الله عنها) قالت : ((جاءَت أم سليمٍ إلى رسول الله (ﷺ) فقَالت : يا رسـولَ الله إن الله لاَ يستحي من الحق ، فَهلْ على المرأة غُسلٌ إذَا احتلَمت ؟ فَقَالَ : نعـم إذَا رأَت الماءَ))[٤٢].**

واتە : دایكی سولەیم ـ كە دایكی ئەنەسی كوڕی مالكە ـ هات بۆ لای پێغەمبەری خـوا (ﷺ) و وتی : ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) **خـوای گـەورە لـە حـەق شـەرم ناكـات** ، ئایـا ئـافرەت خۆشـۆردن (**غُسل**)ی لـە سـەرە ئەگـەر لـە خـەودا وای بینـی لەشـگران بـووە ؟ پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : بەڵێ ئەگەر ئاوی بینی .

**قال الـحافظ : (قوله : "إن الله لا يستحيِي من الحق" أي : لا يأمر بِالحياء في الحـق ، وقَدمت أم سليمٍ هذَا الكلام بسطاً لعذْرها في ذكْر ما تستحيِي النساء من ذكْره بِحضرة الرجال ، ولهذَا قَالت لها عائشة : كَما ثَبت في صحيـح مسلم : "فَضحت النساء")[٤٣].**

واتە : فەرمایشتی : " **بەڕاستی خوای گەورە لە حەق شەرم ناكات** " واتـە : خـوای گەورە فـەرمان ناكـات بەشـەرم كـردن لـە حـەق ، دایكـی سـولەیم ئـەم وتەیـەی كـرد بـە پێشەكی‌یەك بۆ بیانویەك لە باسكردنی ئـەوەی كـە ئافرەتـان شـەرمی لێ دەكـەن باسـی بكەن بە ئـامادەبـوونی پیـاوان ، لەبـەر ئەوە عائیشە پـێ‌ی وت : ((**فَضحت النساءَ**)) واتـە : ئابڕووی ئافرەتانت برد .

---

[٤٢] **صحيح البخاري رقم : (٦١٢١) .**

[٤٣] **فتح الباري شرح صحيح البخاري : (١ / ٣٠٢) .**

**عن علي (رضي الله عنه) قَالَ : ((كُنت رجلاً مذاءً وكُنت أستحيي أنْ أسألَ النبي (ﷺ) لمكان ابنته فَأمرت الْمقْداد بن الأسود فَسأله فَقَالَ : يغسِلُ ذَكَره ويتوضأ))[٤٤].**

واتـە : (**علي** رضي الله عنه) فەرموويـەتی : مـن پیـاوێكی (مـەذی) زۆر بـووم ، وە مـن شـەرمم دەكرد لەوەی كە پرسیار بكەم لە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر جـێی كـچەكەی ، بۆیـە فـەرمانم كرد بە (**الـمقْداد بـن الأسـود**) پرسـیارم بـۆ بكـات ئـەویش پرسـیاری لـێ كـرد ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : (زەكەری) دەشۆرێت و دەستنوێژ دەگرێت .

**قال ابن دقيق العيد : (وفي الْحديث فَوائد : أحدها : استعمالُ الْأدبِ ومحاسنِ الْعادات في ترك الْمواجهة بِما يستحى منه عرفَاً ...)[٤٥].**

واتە : ئەم فەرموودەیە چەندین سوودی تێدایە : یەكێكیان بریتی‌یە لە : بەكارهێنانی ئەدەب و ڕێز و نەریتە باش و جوانەكان بە وازهێنان لـە رووبـەڕوو دەربـڕینی ئـەوەی كـە شەرمی لـێدەكرێت لە نەریتی خەڵكدا .

**وقال الـحافظ ابن حجر : (وفيه جواز الاستنابة في الاستفْتاءِ ... ، وفيه ما كَانَ الصحابة علَيه من حرمة النبِي (ﷺ) وتوقيره ، وفيه استعمالُ الْأدبِ في ترك الْمواجهة بِما يستحى منه عرفَاً ، وحسن الْمعاشرة مع الْأصهارِ ، وترك ذكْرِ ما يتعلق بِجِماعِ الْمرأة ونحـوه بِحـضرة أقَارِبِها ، وقَد تقَدم استدلَال الْمصنف بِه في الْعلْمِ لمن استحيى فَأمر غَيره بِالسؤالِ لـأن فيـه جمعاً بين الْمصلَحتينِ : استعمال الْحياءِ وعدم التفْرِيط في معرِفَة الْحكْمِ)[٤٦].**

واتە : ئەم فەرموودەیە چەندین سوودی تێدایە :

- دروستێتی ڕاسپاردنی كەسێكی تر بۆ پرسیاركردن و فەتوا وەرگرتن .
- ئەوەی كە صەحابە لەسەری بوون لە حورمەت و ڕێزگرتن لە پێغەمبەر (ﷺ) .
- بەكارهێنانی ئەدەب و ڕێز بە وازهێنان لە رووبـەڕوو دەربـڕینی ئـەوەی كـە شـەرمی لـێدەكرێت لە نەریتی خەڵكدا .

---

[٤٤] صحيح البخاري رقم : (١٣٢) و (١٧٨) و (٢٦٩) وصحيح مسلم رقم : (٦٩٣) واللفظ له .
[٤٥] إحكام الأحكام شرح عمدة الأحكام ص : () شرح الـحديث رقم : (٢٢) من عمدة الأحكام .
[٤٦] فتح الباري : (١ / ٤٩٤) .

ـ جـوان مامەڵـەکردن و هەڵـسوکەوت باشـی لەگـەڵ خەزوراندا ، وە وازهێنـان لـە باسکردنی ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بـە جوتبـوونی ئـافرەت و هاوشـێوەکانی لـە کـاتی ئامادەبوونی کەسوکاریدا .

ـ وە لە پێشەوە دانەر لە بەشتی زاستدا ئەم فەرموودەیەی کرد بە بەڵگـە بـۆ ئـەوەی کە کەسێك شەرمدەکات و فەرمان بە کەسێکی تر دەکات بە پرسیار کردن چـونکە ئەمـە هــەردوو بەرژەوەندیەکــەی تێــدا کۆدەبێتــەوە : بــەکارهێنانی شــەرم و کەمتەرخــەمی نەکردنیش لە شارەزابوون لە حوکمی ئەو پرسەی کە شەرم دەکات پرسیاری بۆ بکات .

کەواتە ئەگەر پرسیارەکە جێی شەرم کردن بوو ئەوا نابێت ئەو شـەرم کردنـە ببێتـە ڕێگر لە فێربوونی زانستی شەرعی و دەربڕینی پرسیارەکە[٤٧] بەڵام دەبێـت بـە ئـەدەب و ڕێزەوە پرسیارەکە ئاراستە بکات .

**٣ ـ دەبێت ڕاستگۆ بێت و بە وردی حاڵەت و پرسیارەکەی دەرببڕێت .**

**عن أبي هريرةَ (رضي الله عنه) قالَ : ((سألَ رجلٌ رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) فَقالَ : يا رسولَ الله إنا نركَب الْبحر ونحملُ معنا الْقَليلَ من الْماءِ فَإنْ توضأنا بِه عطشنا ، أفَنتوضأُ من ماءِ الْبحـر ؟ فَقَـالَ رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم) : هو الطهور ماؤه الْحل ميتته))[٤٨].**

واتە : پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و وتی : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئێمـە سـەردەکەوینە سـەر دەریـا و کـەمێك ئـاو لەگـەڵ خۆمانـدا هەڵـدەگرین جـا ئەگـەر دەستنوێژی پێبگرین ئەوا تینومان دەبێت ، ئایا دەستنوێژ بگرین بە ئاوی دەریا ؟

---

[٤٧] ئەم ڕاستیەیە زۆر بە ئاشکرا و بەڕاشکاوی ڕەنگی داوەتـەوە لـە ژیـانی ئافرەتـە صـەحابیەکان ، بۆیـە دەبیـنین عائیـشە (رضي الله عنهـا) لە فەرموودەکەیدا وەسفی ئافرەتە ئەنصاریەکان دەکات و دەفەرموێت : **((نِعم النساءُ نِساءُ الأنصار ، لم يمنَـعـ ـهن الْحياءُ أنْ يتفَقَهن في الدين)) [صحيح البخاري (باب ا ياء العلم) ((الفتح)) : (٣٠١/١) ، وصحيح مـسلم رقـم : (٣٣٢)].** واتـە : باشـترین ئافرەت ئافرەتانی ئەنصار بوون ، چونکە شەرم کردن ڕێی لێ نەدەگرتن لە فێربوونی شەرعدا .

[٤٨] **صحيح سنن أبـي داود رقم : (٨٣) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٦٩) .**

بڕوانە : **ـ (الأصول من علم الأصول) للشيخ ابن العثيم ص : (٨٤)** .

پێغەمبـــەری خـــوایش (ﷺ) فـــەرمووی : دەریـــا ئاوەکـــەی پـــاك و پاکەرەوەیـــە و مردارۆبووشی حەڵاڵە .

**٤ ـ دەبێـت لـە کـاتی گونجـاودا پرسـیارەکەی ئاراسـتە بکـات و قـسە بـە مامۆستاکەی نەبڕێت .**

**عن أبِي هريرةَ (رضي الله عنه) قَالَ : ((بينما النبِي (ﷺ) في مجلسٍ يحدثُ الْقَومِ جاءَه أعرابِي فَقَالَ : متى الساعةُ ؟ فَمضى رسولُ الله (ﷺ) يحدثُ ، فَقَالَ بعض الْقَومِ : سمع ما قَالَ فَكَرِه مـا قَالَ ، وقَالَ بعضهم : بلْ لَم يسمع ، حتى إِذَا قَضى حديثَه قَالَ : أَين - أُراه - السائلُ عـن الساعة ، قَالَ : ها أنا يا رسولَ الله ، قَالَ : فَإِذَا ضيعت الأَمانةُ فَانتظر الساعةَ ، قَالَ : كَيـف إِضاعتها ؟ قَالَ : إِذَا وسد الأَمر إِلَى غَير أَهله فَانتظر الساعةَ))[٤٩] .**

واتە : لە کاتێکدا کە پێغەمبەر (ﷺ) لە نێو مەجلسێکدا قـسەی بـۆ خەڵکەکـە دەکـرد پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای و وتی : کەی قیامەتە ؟

پێغەمبـەری خـوایش (ﷺ) بـەردەوام بـوو لـە قـسەکردنەکەیدا ، بۆیـە هەنـدێك لـە خەڵکەکە وتیان : وتەکەیی بیست بەڵام پێی ناخۆشبوو ، وە هەنـدێکی تریـان وتیـان : بەڵکو نەیبیست ، تاوەکو پێغەمبەر (ﷺ) قسەکەیی تەواوکرد فەرمووی : کـوا لە کوێیە با بیبینم ئەو کەسەی کە پرسیاری کرد سەبارەت بە قیامـەت ، وتـی : هـا ئـا ئەمـە مـنم ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی : ئەگەر ئامانەت فەوتێنرا و لەدەستدرا ئـەوا چاوەڕیی قیامەت بکە .

وتی : چۆن ئامانەت دەفەوتێنریت و لەدەستدرێت ؟

فەرمووی : ئەگەر کاروبار سپێردرا بە کەسانێك کرا کە شـیاوی نـەبن ئـەوا چـاوەڕیی قیامەت بکە .

**قال ابن بطال : (قال الْمهلب : فيه : أن من أدب ا تعلم ألا يسأل العالم ما دام مشتغلا ديث أو غ ه ، لأن من حق القوم الذين بدأ ديثهم ألا يقطعه عنهم ح يتمه .**

---

[٤٩] صحيح البخاري رقم : (٥٩) .

**وفيه : الرفق با تعلم وإن جفا    سؤاله أو جهل ، لأن النبـي (ﷺ) لـم يوبـخه على سؤاله قبل كمال حديثه .**

**وفيه : وجوب تعليم السائل وا تعلم ، لقوله النبـي (ﷺ) : أين السائل ؟   أخ ه عن الـذي سأله عنه .**

**وفيه : مراجعة العالـم إذا لـم يفهم السائل ، لقوله : "كَيف إضاعتها" ؟)[٥٠].**

واتە : ئەم فەرموودەیە چەندین پەند و سوود تێدایە لەوانە :

ــ لە ڕەوشت و ئەدەبەکانی فێرخواز ئەوەیە کە پرسیار نەکات لە زانـا لە کاتێکدا کە سەرقاڵی قسەکردنە یان هەر شتێکی تر جگە لە قسەکردن ، چونکە بەشێك لە مافـی ئەو خەڵکەی کە سەرەتا قسەیان بۆ دەکات ئەوەیە کە وتەکەی نەبڕێت لێیان تاوەکو تەواوی دەکات .

ــ نەرمونیان‌بوون و بەزەیی هاتنەوە بە فێرخواز ئەگەر چی وشکی نوانـد لە پرسیارەکەیدا یان نەیزانی ، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) هەڵنـەکۆڵا پێیـدا و سەرزەنـشتی نەکرد لەسەر پرسیارەکەی لە پێش تەواو کردنی وتەکەی .

ـ پێویـست بـوون و واجبـێتی فێرکردنـی پرسـیارکار و فێرخـواز ، لەبـەر فەرمایـشتی پێغەمبەر (ﷺ) : کـوا لە کوێیە ئەو کەسەی کـە پرسـیاری کـرد ؟ ئـەنجا هـەواڵی پێیـدا سەبارەت بەوەی کە پرسیاری لـێی کرد .

ــ گەڕانــەوە بـۆ لای زانــا و دووبـارە پرسـیار لــێکردنەوەی ئەگـەر پرسـیارکار تێنەگەیشت ، لەبەر وتەی : چۆن ئامانەت دەفەوتێنریت و لەدەستدرێت ؟

**وقال الـحافظ : (قَوْلُه : [باب من سئلَ علْماً وهو مشتغل] : محصله التنبيه علـى أدب العالم والمتعلم : ... وأما المتعلم : فَلما تضمنه من أدب السائل :**

**أنْ لَا يسأل العالم وهو مشتغل بِغيره لأن حق الْأول مقَدم ...**

---

[٥٠] شرح ابن بطال على صحيح البخاري : (١ / ١٢٧) .

**وفيه مراجعة الْعالم إذَا لَم يفْهم ما يجِيب بِه حتى يتضح ، لقَوله " كَيف إضاعتها ... وفيه إشارة إلَى أن الْعلْم سؤال وجواب)[51].**

واته : وتەکەی بوخاری : "بابەتی کەسێك پرسیاری زانستێکی لێکرا لە کاتێکدا کە سەرقاڵە" : پوختەکەی تێبینی دانە لەسەر ئەدەبی زانا و فێرخواز : ... وە بۆ فێرخواز : لەبەر ئەوەی کە تێیدایە لە ئەدەبی پرسیارکار :

نابێت پرسیار بکات لە زانا لە کاتێکدا کە سەرقاڵە بە کەسێکی تر جگە لە ئەو چونکە مافی ئەوەی یەکەم لە پێشترە ...

وە سوودی گەڕانەوە بۆ لای زانا و دووبارە پرسیار لێکردنەوەیی تێدایە ئەگەر پرسیارکار لە وەڵامەکەی تێنەگەیشت تاوەکو ڕوون دەبێتەوە ، لەبەر وتەی : چۆن ئامانەت دەفەوتێنریت و لەدەستدرێت ؟

وە ئاماژەشی تێدایە بۆ ئەوەی کە زانست بریتی‌یە لە پرسیار و وەڵام .

**٥ ـ دەبێت بە وردی و جوان گوێبگرێت بۆ وەڵامی پرسیارەکەی*** .

ئەمەش لە هەموو فەرموودەکانی پێشوودا روون و ئاشکرایە .

وە **لە گرنگترین ئادابەکانی کەسی وەڵامدەرەوە** ئەوەیە کە :

**١ ـ نەرمونیان و هێمن و سنگ فراوان و بە بەزەیی بێت لە بەرامبەر کەسانی پرسیارکاردا .**

**قال النووي في شرح حديث جبريل : (وفيه أنه ينبغي للْعالم أنْ يرفُق بِالسائل ، ويدنِيه منه ، ليتمكن من سؤاله غَير هائبٍ ولَا منقَبِضٍ ، وأنه ينبغي للسائل أنْ يرفُق في سؤاله ، واَللـه أعلَم)[52].**

---

[51] **فتح الباري : (١ / ١٨٨) .**

* بڕوانە کتێبی : **الأصول من علم الأصول ص : (٨٤) .**

[52] **شرح صحيح مسلم : (١ / ١١٤) .**

واتە : وە ئەم فەرموودەیە سوودی ئەوەی تێدایە کەوا : پێویستە زانـــا نەرمونیان و بە بەزەیی بێت بەرامبەر بە پرسیارکار و نزیکی بکاتەوە لە خۆی بۆ ئەوەی بتوانێت پرسیارەکەی ئاراستە بکات بە بێ ترس و داخراوی ، وە پێویستە پرسیارکاریش نەرمو نیان و هێمن بێت لە پرسیارکار کردنەکەیدا .

**٢ ـ سەرەڕای وەڵامدانەوەی پرسیارەکە بە تێروتەسەلی وا باشترە ڕێنمایی کەسی پرسیارکار بکات بۆ چاک تر .**

ئەمەش زۆر بە روونی بە دی دەکرێت لە وەڵامدانەوەی ئەو زانایەی کە لە چیرۆکی ئەو پیاوەی وا (١٠٠) سەد کەسی کوشتبوو هاتووە :

**عن أبِي سعيد الْخدري (رضي الله عنه) عن النبِي (صلى الله عليه وسلم) قَالَ : ((إن عبداً قَتلَ تسعةً وتسع نفْساً ، ثُم عرضت لَه التوبةُ ، فَسألَ عن أعلَم أهلِ الأرضِ ؟ فَدل علَى رجلٍ (وفي رواية : راهبٍ) فَأتاه ، فَقَالَ : إني قَتلْت تسعةً وتسع نفْساً فَهلْ لي من توبة ؟ قَالَ : بعد قَتلِ تسعة وتسع نفْساً ؟! قَالَ فَانتضى سيفَه فَقَتلَه بِه فَأكْملَ بِه مائَةً .**

**ثُم عرضت لَه التوبةُ ، فَسألَ عن أعلَم أهلِ الأرضِ ؟ فَدل علَى رجلٍ [عالمٍ] ، فَأتاه فَقَالَ : إني قَتلْت مائَةَ نفْسٍ فَهلْ لي من توبة ؟**

**فَقَالَ : ومن يحولُ بينك وبين التوبة ؟! اخرج من الْقَرية الْخبِيثَة التي أنت فيها إلَى الْقَرية الصالحة قَرية كَذَا وكَذَا [فَإن بِها أناساً يعبدونَ الله] فَاعبد ربك [معهم] فيها ، [ولاَ ترجِع إلَى أرضك فَإنها أرض سوءٍ] ...))[٥٣] .**

واتە : بەندەیەك لە بەندەکانی خوای پەروەردگار نەوەد و نۆ کەسی کوشتبوو ، پاشان کە ویستی تۆبە بکات پرسیاری کرد سەبارەت بە زاناترین کەسی سەر زەوی ، دەستنیشانی پیاوێکی بۆ کرا (لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : دەستنیشانی پیاوێکی خواپەرستی بۆ کرا) ئەویش ڕۆشتە لای و پێی وت : من نەود و نۆ کەسم کوشتووە ئایا

[٥٣] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٤٠) .

بۆم هەیە تۆبە بکەم ؟ وتی : دوای کوشتنی نەود و نۆ کەس ؟! وتی : شیرەکەی هەڵکێشاو ئەویشی کوشت و سەدەکەی پێتەواو کرد .

پاشان جارێکی تر ویستی تۆبە بکات پرسیاری کرد سەبارەت بە زاناترین کەسی سەر زەوی ، دەستنیشانی پیاوێکی بۆ کرا (زانا) بوو ئەویش ڕۆشتە لای و پێی وت : من سەد (١٠٠) کەسم کوشتووە ئایا بۆم هەیە تۆبە بکەم ؟

وتی : کێ ڕێگە لە تۆبەی تۆ دەگرێت ؟! بەڵام ئەبێ لەو دێیە خراپە دەرچیت کە تیایدایت ، بۆ ئەو دێ چاکە (چونکە خەڵکانێکی تێدایە خوای پەروەردگار دەپەرەستن ) تۆش پەروەردگاری خۆت بپەرستە (لە گەڵیاندا) لەوێدا (نەشگەڕێتەوە بۆ خاکەکەی خۆت چونکە شوێنێکی خراپە) .

٣ ـ هەروەها زانیاری زیاتری پێبدات کە پێویستە بۆی .

**قال ابن القيم : (يجوز للمفْتي أنْ يجيب السائلَ بِأكْثَر مما سأله عنه ، وهو من كمال نصحه وعلْمه وإرشاده ... ، وقد ترجم الْبخاري لذَلك في صحيحه فقَالَ : (باب من أجاب السائلَ بِأكْثَر مما سألَ عنه) ، ثُم ذَكَر حديثَ ابنِ عمر [عنِ النبِي (ﷺ) أن رجلاً سأله ما يلْبس الْمحرم ؟ فَقَالَ : ((لاَ يلْبس الْقَميص ولاَ الْعمامةَ ولاَ السراويلَ ولاَ الْبرنس ولاَ ثَوباً مسه الْورس أو الزعفَرانُ ، فَإِنْ لَم يجِد النعلَينِ فَلْيلْبس الْخفينِ ولْيقْطَعهما حتى يكُونا تحت الْكَعبينِ))][54] .**

**فَسئلَ رسولُ الله (ﷺ) عما يلْبس الْمحرم ، فَأجاب عما لَا يلْبس ، وتضمن ذَلك الْجواب عما يلْبس ؛ فَإن ما لَا يلْبس محصور ، وما يلْبسه غَير محصور ، فَذَكَر لَهم النوعينِ ،**

---

[54] صحيح البخاري رقم : (١٣٤) وصحيح مسلم رقم : (٢٧٨٣) و (٢٧٨٤) .

تنبيه : الحديث الذي ذكره ابن القيم ها هنا كان بلفظ آخر غ ما ذكره البخاري ت هذا الباب ! لذا رأيت إيراد الحديث بلفظه كما هو عند البخاري ت الباب المذكور .

**وبين لَهم حكْم لُبسِ الْخف عند عدمِ النعلِ[٥٥] ، وقَد سألُوه عن الْوضوءِ بِماءِ الْبحرِ ، فَقَـالَ لَهم : "هو الطهور ماؤه الْحل ميتته")[٥٦].**

واتە : دروستە بۆ ئەو کەسەی کە فەتوا دەدات (موفتی) وەڵامی پرسیارکار بداتەوە بە زیاتر لەوەی کە پرسـیاری لـە بارەیـەوە کـردووە ، وە ئەمـەش لـە کـەماڵ و تەواوی ئامۆژگاری و زانست و ڕێنمایی کردنێتی ...

وە بوخاری ناونیشانی بۆ ئەوە داناوە لە (صەحیح)ـەکەیدا و فەرموویەتی : (بابـەتی : ئەو کەسەی کە وەڵامی پرسیارکار دەداتەوە بە زیاتر لەوەی کە پرسیاری لە بارەیەوە کردووە) ، ئەنجا باسی فەرموودەکەی (**ابن عمر**)ی کـردووە لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کـەوا پیاوێك پرسیاری لـێ‌ی کردووە : ئایا ئەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە چی لەبەر بکات ؟

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : نابێت کراس و عیمامە و شەرواڵ و (**الْبرنس** / قەمـصەڵە)* و پۆشـاکێك کـە بـۆنی وەرس و زەعفـەرانی پێـوە بێـت لەبـەر بکـات ، وە ئەگەر پێڵاوی دەستنەکەوت ئـەوا بـا خـوف لـە پـێ بکـات و بـا بیانیـشبڕێتەوە تـاوەکو دەکەونە خوار قولەپێکانەوە .

---

**[٥٥] فائـدة : قال الـحافظ ابن حجر : (قالَ عياض : أجمع المسلمونَ على أن ما ذُكر في هذَا الحديث لا يلبسه المحرم ، وأنه نبـه بالقميص والسراويل على كُلّ مخيط ، وبالعمائم والبرانِس على كُلّ ما يغطى الرأس به مخيطاً أو غيره ، وبالخفاف على كُلّ ما يستر الرجل انتهى) فتح الباري : (٣ / ٥٠٧) .**

**وقال النووي : (ونبه ﷺ بالورس والزعفران على ما في معناهما ، وهو الطيب ، فيحرم على الرجل والمرأة جميعا في الإحرام جميع أنواع الطيب ...**

**قالَ العلماء : والحكْمة في تحر اللباس المذْكُور على المحرم ـ ولباسه الإزار والرداء ـ : أنْ يبعـد عـن الترفـه ويتصف بِصفَة الخاشع الذليل ؛ وليتذكر أنه محرم في كُلّ وقْت ، فيكُون أقْرب إلى كثْرة أذْكاره ، وأبلـغ فـي مراقبتـه وصيانته لعبادته ، وامتناعه من ارتكاب المحظُورات ؛ وليتذكر به الموت ولباس الأكْفَان ، ويتذكر البعث يـوم القيامـة ، والناس حفَاة عراة مهطع إلى الداعي ، والحكْمة في تحر الطيب والنساء : أنْ يبعد عن الترفه وزينة الـدنيا وملاذهـا ، ويجتمع همه لمقاصد الآخرة) شرح صحيح مسلم : (٤ / ٣١٤) .**

**[٥٦] إعلام الـموقع : (٦ / ٤٥) .**

*** قال النووي : ("البرنس" : هو كُل ثوب رأسه ملتصق به) شرح صحيح مسلم : (١ / ٢٨٦) .**

**وقال السندي : ("البرنس" : كل ثوب رأسه منه) حاشية السندي على سنن النسائي : (٥ / ١٢٩) .**

لێرەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری لێکرا سەبارەت بە ئەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە چی لەبەر بکات ؟

ئەویش وەڵامیدایەوە سەبارەت بە ئەوەی کە نابێت لەبەری بکات ، وە ئەو وەڵامە ئەوەش دەگرێتەوە کە لەبەر دەکرێت ، چونکە ئەوەی کە نابێت لەبەری بکات کورتهەڵهێنراوە ، وە ئەوەی کە لەبەری دەکات کورتهەڵهێنراو و سنوور بۆ دیاری کراو نیە ، بەمە هەردوو جۆرەکەی بۆ باسکردن ، وە حوکمی لە پێکردنی خوفیشی بۆ روونکردنەوە لە کاتێکدا کە پێڵاو نەبێت ، هەروەها پرسیاریشیان لێکردووە سەبارەت بە دەستنوێژگرتن بە ئاوی دەریا ، ئەویش پێیانی فەرموو : "دەریا ئاوەکەی پاك و پاکەرەوەیە و مردارۆبووشی حەڵاڵە" .

**وقال النووي : (قَالَ الْعلَماء : هذَا من بديع الْكَلَام وجزله ؛ فَإِنه (ﷺ) سئلَ عما يلْبسه الْمحرم فَقَالَ : لَا يلْبس كَذَا وكَذَا ، فَحصلَ في الْجواب أَنه لَا يلْبس الْمذْكُورات ، ويلْبس ما سوى ذَلك ، وكَانَ التصريح بِما لَا يلْبس أَولَى ؛ لأَنه منحصر ، وأَما الْملْبوس الْجائز للْمحرِم فَغير منحصر فَضبِطَ الْجميع بِقَوله (ﷺ) : "لَا يلْبس كَذَا وكَذَا" يعنِي : ويلْبس ما سواه)[٥٧].**

واتە : زانایان فەرموویانە : ئەمە لە جوانترین و کورتترین وتەیە ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێکرا سەبارەت بە ئەو پۆشاکەی کە کەسێك لە ئیحرامدا بێت لەبەری بکات ؟

ئەویش فەرمووی : ئەوە و ئەوە لەبەر نەکات ، لە وەڵامەکەدا ئەوە دەستکەوت کە نابێت ئەوانە لەبەر بکات ، وە جگە لە ئەوانە لەبەر بکات ، وە بە ڕاشکاوی باسکردنی

---

واتە : (**الْبرنس**) : ئەو پۆشاکەیە کە سەرەکەی لە خۆیەتی و لکاوە پێیەوە .

دەڵێم : ئەمەش زیاتر لە قەمصەڵە یان پاڵتاوی ئەم سەردەمە دەچێت کە سەرەکەیی پێیەوە بێت .

**(الْورس : نبت أَصفَر طَيب الرائحة يصبغ بِه) عون الـمعبود : (٥ / ١٨٨) .**

واتە : (**الْورس**) : ڕوەکێکی ڕەنگ زەردە و بۆنی خۆشە و بۆیەی پێدەکرێت .

**(الزعفَران : صبغٌ أ ر اللون وهو نوع من الطيبِ) انظر : الع : (٢ / ٣٣٣) .**

واتە : (**الزعفَران**) : بۆیەیەکی ڕەنگ سورە و جۆرێکە لە بۆنەکان .

[٥٧] **شرح صحيح مسلم : (٤ / ٣١٤) .**

ئەوانەی کە لەبەر نەکرێن لە پێشتر بوو چونکە کورتهەڵهێنراون و دیاری کراون ، بەڵام ئەو پۆشاکانەی کە دروستن بۆ کەسێك لە ئیحرامدا بێت لەبەریان بکات کورتهەڵهێنراو نین و دیاری کراو نین بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) هەموویانی ڕێکخست بە فەرمایشتی : "با ئەوە و ئەوە لەبەر نەکات" کەواتە : با جگە لەوانە لەبەر بکات .

**وقال النووي مناسبة أخـرى : (قَولُه : "سئلَ رسول الله (ﷺ) عن الْبِتع ؟ فَقَالَ : كُل شرابٍ أَسكَر فَهو حرام"[٥٨] هذَا من جوامع كَلمه (ﷺ) .**

**وفيه أنه يستحب للْمفْتي إِذَا رأَى بِالسائل حاجة إِلَى غَير ما سأَلَ أَنْ يضمه في الْجـواب إِلَى الْمسئُول عنه ، ونظ هذَا الْحديث حديث : "هو الطهور ماؤه الْحل ميتته")[٥٩].**

واتە : وتەی : "پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە (**الْبِتـع** / گیراوەی هەنگوێن) ئەویش فەرمووی : هەموو خواردنەوەیەك مرۆڤ سەرخۆش بکات ئەوا حەرامە" ئەمە لە وتە گشتگیر و واتافراوانەکانیەتی (ﷺ) .

وە ئەم فەرموودەیە سوودی ئەوەی تێدایە کە : سوننەتە بۆ موفتی ئەگەر بینی پرسیارکار پێویستی [بە زانیاری زیاتر] بوو جگە لە پرسیارەکەی خۆی ئەوا یەکیدەخات لەگەڵ وەڵامی ئەوەی کە پرسیاری لە بارەیەوە لێکراوە ، وە هاووێنەی ئەم فەرموودەیە بریتی‌یە لە فەرموودەی "دەریا ئاوەکەی پاك و پاکەرەوەیە و **مرداروبووشی حەڵاڵە**" .

**وقال الشيخ عطية مد سالـم : (ذكر العلماء أن القاعدة الأساسية ا واب أن يطابق السؤال ، ولكن ا سئول إذا كان حكيماً راعى حالة السائل ، فقد يزيده عما سأل ، وقد يغاير و يبه عن غ ما سأل ؛ ليب له أن الأ ية فيما تضمنه ا واب ، أو نصر ا واب ليسهل على السائل فهم الـجواب .**

---

[٥٨] **صحيح البخاري رقم : (٥٥٨٥) وصحيح مسلم رقم : (٥١٧٩) و (٥١٨٠) .**

[٥٩] **شرح صحيح مسلم : (٦ / ١٧٠) .**

واتە : زانایان باسی ئەوەیان كردووە كە : بنەوای سەرەكی لە وەڵامدا ئەوەیە كە هاوتا بێت لەگەڵ پرسیارەكەدا ، بەڵام كەسی پرسیارلێكراو ئەگەر دانا بێت ئەوا حاڵەتی پرسیاركار لەبەرچاودەگرێت ، بۆیە جاری وا هەیە زیاتر لەوە [زانیاری] دەداتێ كە پرسیاری لە بارەیەوە كردووە ، وە جاری واش هەیە وەڵامەكە دەگۆڕێت و وەڵامی جگە لەوەی كە پرسیاری لە بارەیەوە كردووە دەداتەوە بۆ ئەوەی بۆی روونبكاتەوە كەوا گرنگی لەوەدایە كە وەڵامەكە گرتویەتە خۆی ، وە یان وەڵامەكە كورت و پوخت دەكاتەوە بۆ ئەوەی تێگەیشتنی وەڵامەكە ئاسان بكات لەسەر پرسیاركار .

**ومن مغايرة ا واب للسؤال : ما جاء كتاب ا عنـد قولـه تعـا :** ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢١٥﴾ ﴾ [البقرة] **، فهم يسألون عن ماذا ينفقون ؟ و آية أخرى :** ﴿ قُلِ ٱلْعَفْوَ ﴿٢١٩﴾ ﴾ [البقـرة] **، أي : الزائـد عـن حاجتكم ، وهذا مطابق للسؤال ، ولكن هنا قال :** ﴿ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ ﴿٢١٥﴾ ﴾ **، فقد سألوا عن نوعية ما ينفقون فأجابـهم بأن**
**د م على جهة ما ينفقون عليه ؛ لأن معرفة ذلك أهم من معرفة ماذا ينفقون .**

واتە : لە نموونەی گۆڕینی وەڵامی پرسیارەكە : ئەوەی كە لە قورئاندا هاتووە كە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿پرسیارەت لێدەكەن چی ببەخشنەوە ؟ تۆیش بڵێ : **هەرچی شتێك ببەخشنەوە لە چاكە ئەوا با بۆ باوك و دایك و خزمان و یەتیمان و هەژاران و رێبواران بێت**﴾ ، ئەوان پرسیار دەكەن سەبارەت بەوەی ئایا چ شتێك ببەخشنەوە ؟ وە لە ئایەتێكی تردا : ﴿بڵێ : لێبووردەیی ببەخشنەوە﴾ واتە : ئەوەی كە زیاترە لە پێویستیتان ، ئەمەیان هاوتایە لەگەڵ پرسیارەكەدا ، بەڵام لێرەدا فەرموویەتی : ﴿بڵێ : هەرچی شتێك ببەخشنەوە لە چاكە ئەوا با بۆ باوك و دایك ...﴾ ، ئەوان پرسیاریان كرد سەبارەت بە جۆری ئەو شتەی كە ببیبەخشنەوە بەڵام خوای گەروە وەڵامیدانەوە بەوەی كە رێنمایی كردن بۆ ئەو لایەنەی كە شتی بەسەردا ببەخشنەوە ، چونكە زانینی ئەوە گرنگترە لە زانینی ئەو شتەی كە ببیبەخشنەوە .

**وكذلك من الزيادة ا واب على السؤال : حديث : (قالوا : يا رسولَ الله إنا نركَب الْبحر ونحملُ معنا الْقَليلَ من الْماءِ فَإِنْ توضأنا بِه عطشنا ، أفَنتوضأُ من ماءِ الْبحرِ ؟ فالسؤال دود عن صحة الوضوء من ماء البحر، فكان جوابه (ﷺ) : "هو ـ أي : البحر ـ الطهور ماؤه الْحل ميتته" ، مع أ م يسألوا عن ميتته أحلال هي أم حرام ؟ ولكن نظر (ﷺ) إ السائل عن صحة الطهور من ماء البحر ورأى أن ر و ليل ميتة البحر أشـد إشـكالاً عليهم ، فإذا كانوا قد استشكلوا الوضوء من ماء البحر لكونه مالـحاً فلأن يستشكلوا حـل ميتته من باب أو ، فزادهم فيما يرتبط بركوب البحر)[٦٠].**

واتە : هەروەها لە نموونەی زیاتر لە وەڵامـی پرسـیارەکە : فـەرموودەی : "وتیـان : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئێمـە سـەردەکەوینە سـەر دەریـا و کـەمێك ئـاو لەگـەڵ خۆمانـدا هەڵدەگرین جا ئەگەر دەستنوێژی پێبگرین ئەوا تینومان دەبێت ، ئایا دەستنوێژ بگـرین بە ئاوی دەریا ؟

پرسـیارەکە سـنوردارە سـەبارەت بـە دروسـتێتی دەسـتنوێژە بـە ئـاوی دەریـا ، وەڵامەکەی پێغەمبەری خوایش (ﷺ) بریتی بوو لە : "دەریا ئاوەکەی پاك و پاکەرەوەیە و **مردارۆبووشی حەڵاڵـە"** ، ئەوان پرسیاریان نـەکرد سەبارەت بـە مردارۆبـووی دەریـا کە ئایا حەڵاڵە یان حەرامە ؟ بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) سەیردەکات پرسیارکار سـەبارەت بـە دروستێتی دەستنوێژ بـە ئـاوی دەریـا و بـینی کـەوا حـەرامێتی و حـەڵاڵێتی مردارۆبـووی دەریا زیاتر ئاڵۆزترە بە لایانەوە ، جا ئەگـەر ئـەوان دەسـتنوێژگرتن بـە ئـاوی دەریـا بـە لایانەوە ئاڵۆز بێت لەبەر ئەوەی کە سوێرە (شۆرە) ئەوا حەڵاڵێتی مردارۆبووی دەریـا بـە لایانەوە ئاڵۆز بێت لە پێشترە ، بۆیە زنیـاری زیـاتری پـێدان لـەوەی کـە پەیوەسـتە بـە سەرکەوتنە سەر دەریاوە .

---

[٦٠] **شرح بلوغ الـمرام : (٣ / ٤٦ ـ ٤٧) ، ولـمزيد الفائدة انظر : (١ / ١٦) منه أيضاً ، عند شرحه لـحديث : " هو الطهور ماؤه الْحل ميتته " .**

هەروەها زانایان لە شەرحی فەرموودەی : (( **... هو الطهور ماؤه ، الحل ميتته** / دەریا ئاوەکەی پاك و پاکەرەوەیە و مردارۆبووشی حەڵاڵە)) فەرموویانە : **(والحـديث فيـه مسائل : ... الثالثة : أن المفتي إذا سئلَ عن شيء وعلم أن للسائل حاجة إلى ذكر ما يتصل بمسألته أستحب تعليمه إياه لأن الزيادة في الجواب بقوله : "الحل ميتته" لتتميم الفائدة وهي زيادة تنفع لأهل الصيد وكأن السائل منهم ، وهذا من محاسن الفتوى)**[٦١].

- **پرسیارکردن سەبارەت بە کردارە چاکەکان** :

**عن أبي هريرةَ (رضي الله عنه) أن رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) سئلَ أي العملِ أفضلُ ؟**

**فَقَالَ : ((إيـمانٌ بالله ورسوله .**

**قيلَ : ثم ماذا ؟**

**قَالَ : الجِهاد في سبيل الله .**

**قيلَ : ثم ماذا .**

**قَالَ : حج مبرور))**[٦٢].

واتە : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لـێکرا :

ئایا باشترین کردەوە کامەیە ؟

فەرمووی : باوەڕبوون بە خوا و پێغەمبەرەکەی .

وترا : ئەنجا چی تر ؟

فەرمووی : جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا .

وترا : ئەنجا چی تر ؟

فەرمووی : حەجێکی وەرگیراو .

---

[٦١] عون المعبود شرح سنن أبـي داود : (١/ ١٠٧) ، وانظر : فيض القدير : (٣ / ٢٨٢) .

[٦٢] صحيح البخاري رقم : (٣٦) وصحيح مسلم رقم : (٢٤٤) .

**ـ پرسیارکردن سەبارەت بە کردارە خراپەکان :**

**عن عبد الله بن مسعود (رضي الله عنه) قالَ : ((قُلت : يا رسولَ الله أي الذنبِ أعظَم ؟**

**قالَ : أنْ تجعلَ لله نِداً وهو خلَقَك .**

**قُلت : ثُم أي ؟**

**قالَ : أنْ تقْتلَ ولَدكَ خشيةَ أنْ يأكُلَ معك .**

**قُلت : ثُم أي ؟**

**قالَ : أنْ تزانِي حليلَةَ جارك))[٦٣].**

واتە : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا گەورەترین تاوان کامەیە ؟

فەرمووی : ئەوەیە کە شەریك و هاوشێواز بۆ خوا دابنەیت لە کاتێکدا کە تەنها ئەو تۆی درووست کردووە .

وتم : ئەنجا چی تر ؟

فەرمووی : ئەوەیە کە منداڵەکەت بکوژیت لە ترسی ئەوەی کە لەگەڵ تۆدا نان بخوات .

وتم : ئەنجا چی تر ؟

فەرمووی : زینا و داوین پیسی بکەیت لەگەڵ خێزانی دراوسێکەتدا .

**ـ پرسیارکردن سەبارەت بەو کردارە خراپانەی کە لە داهاتوودا روودەدەن :**

**عن حذَيفَةَ بن اليمان (رضي الله عنه) قالَ : ((كانَ الناس يسألونَ رسولَ الله (ﷺ) عن الخير ، وكُنت أسأله عن الشر ، مخافَةَ أنْ يدركَنِي :**

**ـ فَقُلت : يا رسولَ الله إنا كُنا في جاهلية وشر فَجاءَنا الله بهذَا الخير [فَنحن فيه] ، [وجاءَ بِك] ، فَهلْ بعد هذَا الخيرِ من شر [كَما كانَ قَبلَه] ؟**

**[ـ قَالَ : يا حذَيفَةُ تعلم كتاب الله واتبع ما فيه ، ثَلاثَ مرات .**

**ـ قُلت : يا رسولَ الله أبعد هذَا الخير شر ] .**

---

[٦٣] صحيح البخاري رقم : (٦٠٠١) وصحيح مسلم رقم : (٢٥٣) و (٢٥٤) .

ـ قَالَ : نعم .

[ـ قُلت : فَما الْعصمةُ منه ؟

ـ قَالَ : السيف] .

ـ قُلت : وهلْ بعد ذَلك الشر من خير ؟ (وفــي طريقٍ : قُلت : وهلْ بعد هذَا السيف بقيةٌ ؟)

ـ قَالَ : نعم ، وفيه (وفــي طريقٍ : تكُونُ إمارةٌ (وفــي لفظ : جماعةٌ) علَى أقْذَاءٍ ، وهدنــةٌ علَى) دخن .

ـ قُلت : وما دخنه ؟

ـ قَالَ : قَوم (و طريقٍ أخرى : يكُونُ بعدي أئمةٌ) [يستنونَ بِغير سنتي و] يهدونَ بِغير هديي ، تعرف منهم وتنكر ، [وسيقُوم فيهم رِجالٌ قُلُوبهم قُلُوب الشياط ِ في جثْمان الْإنسٍ] .

(وفــي أخرى : الْهدنةُ علَى دخنٍ ما هي ؟

قال : لاَ ترجِع قُلُوب أقْوامٍ علَى الذي كَانت علَيه) .

ـ قُلت : فَهلْ بعد ذَلك الْخيرِ من شر ؟

ـ قَالَ : نعم ، [فتنةٌ عمياءُ صماءُ علَيها] دعاةٌ علَى أبوابِ جهنم ، من أجابهم إلَيهــا قَــذَفُوه فيها*.

ـ قُلت : يا رسولَ الله صفْهم لَنا ؟

ـ قَالَ : هم من جِلْدتنا ، ويتكَلَّمونَ بِأَلْسِنتنا .

ـ قُلت : [يا رسولَ الله] فَما تأمرنِي إنْ أدركَنِي ذَلك ؟

ـ قَالَ : تلْزم جماعةَ الْمسلم وإمامهم ، [تسمع وتطيع للأم ِ وإنْ ضرب ظَهرك وأُخذَ مالُك ، فَاسمع وأَطع] .

ـ قُلت : فَإنْ لَم يكُن لَهم جماعةٌ ولاَ إمام ؟

ـ قَالَ : فَاعتزلْ تلْك الْفرق كُلَّها ، ولَو أنْ تعض بِأَصلِ شجرة ، حتى يدركَــك الْموت ، وأَنت علَى ذَلك .

---

* و رواية أخرى : ((ثم تكُونُ دعاةُ الضلالَة ...)) [سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٧٩١)] .

(وفـي طريقٍ : فَإِنْ تمت يا حذَيفَةُ وأَنت عاضٍ علَى جِذْلٍ خير لَك من أَنْ تتبِع أحداً منهم") ، (وفـي أخرى : فَإِنْ رأَيت يومئذ لله عز وجل في الأَرضِ خليفَةً فَالْزمه وإِنْ ضرب ظَهرك وأَخـذَ مالَك ، فَإِنْ لَم تر خليفَةً فَاهرب [في الأَرضِ] حتى يدرِكَك الْموت وأَنت عاضٍ علَى جِذْلِ شجرة) .

[قَالَ : قُلْت : ثُم ماذَا ؟

قَالَ : " ثُم يخرج الدجالُ " .

قَالَ : قُلْت : فيم يجِيءُ ؟

قَالَ : " بِنهر ـ أَو قَالَ : ماءٍ ـ ونار ، فَمن دخلَ نهره حط أجره ووجب وزره ، ومن دخلَ ناره وجب أجره وحط وزره " .

[قُلْت : يا رسولَ الله : فَما بعد الدجالُ ؟

قَالَ : "عيسى بن مريم" .

قَالَ : قُلْت : ثُم ماذَا ؟

قَالَ : لَو أنتجت فَرساً لَم تركَب فَلُوها حتى تقُوم الساعةُ))[٦٤].

واتە : خەڵکی پرسیاریان دەکرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە خێر و چاکە ، بەڵام من پرسیاری شەڕ و خراپەم لـێ دەکرد لە ترسی ئەوەی نەوەك پێم بگات ، بۆیـە وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە ناو نەفامی و شەڕ و خراپـەدا بـووین ئـەنجا خـوا ئـەم خێرەی هێنا و ئێمەش تێیداین و تۆشی هێنا بۆمان ، ئایا دوای ئەم خێرە شـەڕ و خراپـە هەیە وەك چۆن لە پێشەوەیدا هەبوو ؟

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ئەی (**حذيفة**) فێری کتێبەکەی خوا ببە و شوێنی ئەوەش بکەوە کە تێیدایە (سێ جار) .

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دوای ئەم خێرە شەڕ و خراپە هەیە ؟

فەرمووی : بەڵـێ .

---

[٦٤] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٧٣٩) (٦ / ٥٣٩ ـ ٥٤١) ، وانظر تـخريج الـحديث والكلام علـى فوائده وزياداته : (٥٤١ ـ ٥٤٦) .

وتم : چی دەتپارێزێت لـێی ؟

فەرمووی : شمشێر .

وتم : وە ئایا دوای ئەو شەڕ و خراپەیە خێر و چاکە هەیە ، (لە ڕێگایەکـی تردا هاتووە : وتم : ئایا دوای شمشێرەکە ئیسلام و خێر دەمێنێت) ؟

فـەرمووی : بەڵـێ ، بـەڵام خەڵتـەی تێدایـە ، (لـە ڕێگایـەکی تـردا : فەرمانڕەواییـەك دەبێت (لە لەفزێکی تردا : کۆبونەوەیەك دەبێت) لەسەر خەڵتـە و کپبوونەوەیـەك لەسـەر ڕق و قین و ناپاکی) .

وتم : ئەی خەڵتەکەی چیە ؟

فەرمووی : خەڵکانێك دەبێت (لـە ڕێگایـەکی تـردا : دوای مـن پێـشەوایانێك دەبێـت) لەسەر بەرنامە و ئاکاری من ناڕۆن ، چاکە و خراپەشـیان لێـدەبینیت ، [وە پیاوانێـك لـە ناویاندا ڕاست دەبێتەوە دڵەکانیان دڵی شەیتانەکانە لە ناو لاشەی مرۆڤـدا] .

(وە لە ڕێگایەکی تردا : وتم : کپبوونەوە لەسەر ڕق و قین و ناپاکی چیە ؟

فەرمووی : دڵی خەڵکانێك ناگەڕێتەوە سەر ئەو حاڵەتەی کە پێشتر لەسەری بووە) .

وتم : ئایا دوای ئەو خێرە شەڕ هەیە ؟

فەرمووی : بەڵـێ ، فیتنە و ئاشوبێکی کـوێر و کـەڕ دەبێـت ، بانگەوازکـارانێـکی بـە سەریەوە کە لەسـەر دەرگـاکـانی دۆزەخ ڕاوەستـاون* ،

هەرکەسێك وەڵامیان بداتەوە ئەوا فڕێی دەدەنە ناویەوەوە .

وتم : ئەی پێغەمبەری خوا وەسفیان بکە بۆمان ؟

فەرمووی : ئەوانە لە پێستی خۆماندان و بە زمانی خۆمان قسە دەکەن .

وتم : ئەی پێغەمبەری خـوا بـە چ شـتێك فـەرمانم پـێ دەکـەیت ئەگـەر گەیـشتم بـەو سەردەمە ؟

---

* لە ڕیوایەتێکی تری ئەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((ثم تكونُ دعاةُ الضلالة ...))** .

واتە : ئەنجا بانگەوازکارانی گومڕایەتی دێن !

فەرمووی : پەيوەست ببە بە كۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواكەيانەوە ، [گوێگر بە و گوێڕايەڵی فەرمانبەرەكەت بكە ئەگەر دای لە پشتــت و پارە و ماڵەكەشتی برد ، هەر گوێگر و گوێڕايەڵ بە] .

وتم : ئەی ئەگەر موسڵمانان نە كۆمەڵيان هەبوو نە پێشەوا ؟

فەرمووی : دوور بگرە لە هەموو ئەو فيرقانەی ئەو سەردەمە ، ئەگەر بە قەپ گرتنشت بێت بە ڕەگی درەختێكدا تاوەكو مردن پێت دەگات تۆ هەر لەسەر ئەوە بە .

(وە لە ڕێگايەكی تردا) : ئەگەر بمريت ئەی (**حذيفة**) وە تۆ قەپت گرتبێت لە دارێك ئەوا باشترە بۆت لەوەی شوێنی هيچ يەكێك لەوانە بكەويت .

(وە لە ڕێگايەكی تردا) : ئەگەر تۆ لەو ڕۆژەدا (خەليفە)يەكی خوای گەورەت بينی لە زەويدا ئەوا پەيوەست ببە پێيەوە ئەگەر دەيشيدا لە پشتت و ماڵكەشتی دەبرد ، وە ئەگەر (خەليفەت) نەبينی ئەوا ڕا بكە بە سەر زەويدا تاوەكو مردن پێت دەگات و تۆ قەپت گرتووە بە ڕەگی دارێكەوە .

وتم : ئەنجا چی دەبێت ؟

فەرمووی : ئەنجا دەججال دەردەچێت .

وتم : ئەی چی دێنێت و چی پێيە ؟

فەرمووی : ڕوبار - يان فەرمووی : ئاو - و ئاگر دێنێت ، جا هەر كەسێــك بچێتە ناو ڕوبارەكەيەوە ئەوا پاداشتەكانی پوچەڵ دەبێتەوە و تاوانی خۆی مسۆگر دەكات ، وە هەر كەسێكيش بچێتە ناو ئاگرەكەيەوە ئەوا پاداشتی خۆی مسۆگر دەكات و تاوانەكانی هەڵدەوەشێتەوە .

وتم : ئەی پێغەمبەری خوا باشە دوای دەججال چی دێت ؟

فەرمووی : (**عيسى بن مريـم**) .

وتم : ئەنجا چی ڕوو دەدات ؟

فەرمووی : ئەگەر ماینەکەت بزێت ئەوا ناگەیتە سوار بوونی بەچکەکەی قیامەت روودەدات .

بەڕاستی ئەم فەرموودەیە چەندین سوودی گەورەی تێدایە ، لەوانە :

ـ پرسیارکردن سەبارەت بە ئەو خراپانەی کە لە داهاتوودا روودەدەن بۆ ئەوەی خۆپاریزیان لێبکرێت و تێیانەکەوێت :

**قال ابن الـجوزي : (أما سؤاله عن الشر فليجتنبه ، قال الشاعر :**

**عرفت الشر لا للشر لكن لتوقيه**

**ومن لا يعرف الشر من الناس يقع فيه)[٦٥].**

واتە : پرسیاری کردنی **(حذَيفَـة)** سەبارەت بە خراپە بۆ ئەوە بووە کە خۆیی لێبەدوور بگرێت ، شاعیرێك وتویەتی :

شارەزای خراپە بووم نەك بۆ خراپەکردن بەڵکو بۆ خۆپارستن لێی ..
هەرکەسێك لە خەڵك خراپە نەناسێت تێیدەکەوێت .

## * ئەوەی کە من تێبینیم کردووە لەو پرسیارانەی کە لەم کتێبەدا وەڵامدراونەتەوە :

خوێنەری بەڕێز :

لە کاتێکدا کە لە (سایتی بەهەشت)ەوە پرسیارەکانم بە دەست دەگەیشت و دەمخوێندنەوە و هەروەها لە پاش کۆکردنەوەی تێکڕای پرسیار و وەڵامەکان و ڕێکخستنیان لەم کتێبەدا دوو خاڵم تێبینی کرد :

١ ـ زۆربەی هەرە زۆری پرسیارەکان ـ **مـع الأسـف !** ـ سەبارەت بە بوارەکانی شەهوەت و ئارەزوو و تاوانەکان و خراپەکاریەکان بوون !

---

[٦٥] **كشف الـمشكل من حديث الصحيح : (١ / ٢٥٢) .**

٢ ـ لە هەمان کاتیشدا ئاراستە کردنی پرسیارەکە لە رووی کاتەکەیەوە دەکەوێتە پاش تێوەگلان بە شەهوەت و ئارەزووەکان و پاش روودانی تاوان و خراپەکاریەکان !

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەوا :

١ ـ زۆربەی خەڵك ـ **مع الأسف !** ـ سەرقاڵ و مەستی شەهوەت و ئارەزووەکانن !

٢ ـ وە زۆربەی خەڵك ـ **مع الأسف !** ـ کەمتەرخەمن لە بواری شارەزابوون و تێگەیشتن و پێگەیشتن و بە ئاگابوون لە ئاینەکایان بە گشتی و لە بواری تاوان و خراپەکاریەکانیش بە تایبەتی ! چونکە زۆربەیان تاوەکو تێوەنەگلێن و تێنەکون و تووش نەبن پرسیار ناکەن !

هەموو ئەمانەش پێچەوانەی ڕێڕەو و ڕێباز و ڕەفتار و ئاکاری صەحابەکانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لە چەندین رووەوە :

١ ـ صەحابەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زیاتر پرسیاریان سەبارەت بە کارە خێرە و چاکەکان کردووە نەك سەبارەت بە بوارەکانی شەهوەت و ئارەزوو و تاوان و خراپەکاریەکان !

٢ ـ وە صەحابەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە هەوڵیانداوە لە دینەکەیان شارەزا و بە ئاگا و تێگەیشتووبن و کەمتەرخەمیان نەکردووە لەم بوارەدا .

٣ ـ هەروەها صەحابەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پێش تێوەگلان و تێکەوتن و تووشبوون پرسیاریان کردووە سەبارەت بە تاوان و خراپەکاریەکان بۆ ئەوەی خۆیانی لێبپارێزن و تێنەکەون .

هەموو ئەمانەش لە پێشەوە بە روونی بە بەڵگە و بە نموونەوە باسکراون .

ئەوە ماوەتەوە کە لە کۆتایی ئەم پێشەکیەدا بڵێم :

ئەمەی کە لەم کتێبەدا هاتووە هەوڵی کەسێکە کە خۆی بە قوتابی عیلم (**طالب العلم**) دەزانێت نەك زانا (**العالم**) ، وە خۆی بە (**ناقل الفتوى**) دادەنێت نەك (**المفتي**) .

وە ئەمە هەوڵێکە بۆ خزمەتکردنی ئیسلام و سوودگەیاندن بە موسڵمانان ، جا ئەگەر پێکابێتم ئەوا تەنها فەزڵی خوای پەروەردگارمە .. وە ئەگەر هەڵـە و کەموکوڕیـشی تێـدا بێت ئەوا تەنها خۆم لـێی بەرپرسیارم و بە ئەنقەستیشەوە نەبووە بۆیە داوای لێبـووردن لــە خــوای پــەروەردگارم دەکــەم و چــاوەڕوانی تێبــینی و ئامۆژگــاری دەســتە بــرا و خوشکەکانیشم دەکەم .

(رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ .. وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيـمُ )

**محمد عبدالرحمن لطيف**

**(١٣ / ربيع الأول / ١٤٣٣ ك ـ ٥ / ٢ / ٢٠١٢ ل)**

**كوردستان / كەلار**

**پ١ / ئەم چەند پرسیارە هەمیشە لە مێشکمدا ئەخولێتەوە بۆیە سوپاسی ئێوەی بەڕێز دەکەم کە سایتێکی وا جوان دەیەوێ وەڵامی پرسیارەکانمان بداتەوە :**

**١ ـ گرنگی ئایین بۆ مرۆڤایەتی چییە ؟ ئەگەر ئایین نەبوایە مرۆڤ چۆن دەبوو ، واتە سوود و زیانی ئاین چییە ؟**

**٢ ـ جیاوازی ئاینی ئیسلام لەگەڵ ئاینەکاتر چییە ؟ بە واتایەکی تر ئێمە بۆ لەسەر ئاینی ئیسلام بین ، ئیسلام چی لە ئاینی مەسیحی و جولەکە ... باشترە ؟**

**٣ ـ باشە ئاین لە سیستەمی دەسەڵات جیابکرێتەوە باشترە یان نا ؟**

وەڵام /

١ ـ گرنگی ئایین بۆ مرۆڤایەتی بریتییە لەم چەند خاڵەی خوارەوە :

یەکەم : پاراستنی پێنج پێویستییەکە (**حفظ الضروريات الخمس**) کە مەبەستی هەرە سەرەکی هاتنی ئایینە کە بریتین لە :

أ / پاراستنی دین و ئایینی مرۆڤ (**حفظ الدين**) .

ب / پاراستنی ژیان و بوونی مرۆڤ (**حفظ النفس**) .

ج / پاراستنی ناموس و شەرەفی مرۆڤ (**حفظ العرض**) .

د / پاراستنی ئەقڵی مرۆڤ (**حفظ العقل**) .

هـ / پاراستنی ماڵ و پارە و سامانی مرۆڤ (**حفظ المال**) .

بۆیە دەبینین خوای گەورە چەندین حوکمی داناوە بۆ پاراستنی ئەم پێنج پێویستییە کە پێیان دەوترێت : (**الضروريات الخمس**) بۆ نموونە :

خوای گەورە سزای داناوە بۆ ئەو کەسانەی کەوا لە دین و ئایین هەڵدەگەڕێنەوە و پاشگەز دەبنەوە بە کوفر کردن (**المرتد**) .. یان لە ڕاستە ڕێی ئیسلام لادەدەن بە بیدعە کردن .

هەروەها خوای گەورە سزای داناوە بۆ ئەو کەسانەی کەوا دەست دریژی دەکەنە سەر ژیان و لاشە و خوێنی خەڵکانی بێ تاوان و فەرموویەتی : ﴿ وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ [البقرة] .

واتە : لە سەپاندنی سزا بە سەر دەستدرێژکار و بکوژدا پاراستنی ژیانی تێدایە بۆتان ئەی خاوەن دڵ و ژیریەکان بۆ ئەوەی خۆپارێزی بکەن لە تاوان و دەست درێژی کردنە سەر کەسانی بێ تاوان .

هەروەها خوای گەورە سزای داناوە بۆ ئەو کەسانەی کەوا دەست درێژی دەکەنە سەر ناموسی کەسانی تر و شەرەف و سومعەتی خەڵکانی بێ تاوان لەکەدار دەکەن .

هەروەها خوای گەورە سزای داناوە بۆ ئەو کەسانەی کەوا مادە سەرخۆش و سڕکەرەکان دەخۆنەوە و بێ هۆش و بێ ئاگتیان دەکات .

هەروەها خوای گەورە سزای داناوە بۆ ئەو کەسانەی کەوا دەست درێژی دەکەنە سەر ماڵ و سامانی خەڵك و دزی و خیانەتیان لێدەکەن و ڕوتیان دەکەنەوە .

دانانی هەموو ئەو سزا و تۆڵە لێسەندنەوانە لە تاوانباران بە مەبەستی پاراستنی ئەو پێنج پێویستییە کە پێیان دەوترێت : (**الضروريات الـخمس**) .

لەگەڵ ئەوەشدا لە چەندین ئایەت و فەرموودەدا هانی موسڵمانان دراوە بۆ پاراستنی ئەمانە .

دووەم : لە ڕێگەی پەیڕەو کردنی ئایینی ئیسلامەوە هیدایەت و ڕەحمەت و بەزەیی و چارەسەری کێشە و گرفتەکان و بەرچاوڕۆشتنی و دادپەروەری بەرقەرار دەبێت ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدْ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ [الأعراف] .

**قال الشيخ عبدالر ن السعدي : (﴿ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ ﴾ أي : بينا فيه يع ا طالب ا تاج إليها ا لق ﴿ عَلَىٰ عِلْمٍ ﴾ من الله بأحوال العباد كل زمان ومكان ، وما يصلح م**

**وما لا يصلح ، ليس تفصيله تفصيل غ عا بالأمور، فتجهله بعض الأحوال، فيحكم حكمـا غ مناسب، بل تفصيل من أحاط علمه بكل شيء ، ووسعت ر ته كل شيء .**

﴿هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ **أي : صل للمؤمن ذا الكتاب ا داية من الـضلال ، وبيان ا ق والباطل ، والغي والرشد ، و صل أيضا م به الر ة ، وهي: ا والـسعادة الدنيا والآخرة ، فينتفى عنهم بذلك الضلال والشقاء) .**

واتە : بەڕاستی ئێمە کتێبێکمان بۆ هێناون کە هەموو ئەو پێداویستیانەی تیادا ڕوونکراوەتەوە کە بوونەوەر پێویستیان پێیەتی ئەمەش بە پێی زانستێك لە لایەن خواوە بە حاڵی بەندەکان لە هەموو زەمان و شوێنێکدا ، وە چی شیاوە بۆیان و چیش شیاوە نی‌یە بۆیان ، ئەو ڕوونکردنەوەیە ڕوونکردنەوەی کەسێك نی‌یە کە زانا نەبێت بە بوارەکان و بە هۆی ئەوەشەوە هەندێك لە حاڵەتەکان نەزانێت و بڕیارێك بدات کە گونجا نەبێت ! بەڵکو ئەوە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی کەسێکە کە زانستی هەموو شتەکانی گرتووەتەوە ، وە بەزەیی و میهرەبانیشی هەموو شتەکانی گرتووەتەوە .

ئەو کتێبە ﴿ڕێنمایی و میهرەبانی‌یە بۆ کەسانێك کە باوەڕ بێنن﴾ واتە : بەم کتێبە بەرچاوڕۆشنی لە گومڕایی ، وە ڕوونبوونەوەی حەق و باتڵ ، وە چەواشەبوون و هۆشمەندی بەدی‌دێت بۆ باوەڕداران ، هەروەها بەم کتێبە میهرەبانیان بۆ بەدی‌دێت کە بریتی‌یە لە خێر و خۆشی و بەختەوەری دونیا و دواڕۆژ ، وە بە هۆی ئەوەشەوە گومڕایی و بەدبەختیان لێ‌بەدوور دەبێت .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾﴾ [يونس] .

واتە : ئەی خەڵکینە ئامۆژگاریەکتان بۆ هاتووە لە خوای پەروەردگارتانەوە ـ کە قورئانە ـ هانتان دەدات بۆ چاکەکاری و ڕێگریتان لێدەکات لە خراپەکاری ، وە شیفای تێدایە بۆ ئەوەی کە لە نێو سینگەکاندایە لە (**أمـراض الـشبهات والـشهوات**) نەخۆشی‌یەکانی گومان و ئارەزووەکان ، وە ڕێنمایی و میهرەبانی‌یە بۆ باوەڕداران .

**قال الشيخ عبدالر ن السعدي  تفسـ هذه الآية : (﴿وَهُدًى وَرَحۡمَةٌ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ فالـهدى : هو العلم با ق والعمل به .**

**والر ة : هي ما صل من ا والإحسان ، والثواب العاجل والآجل ، ن اهتدى بـه ، فا دى أجل الوسائل ، والر ة أكمل ا قاصد والرغائب ، ولكن لا يهتدي به ، ولا يكـون ر ة إلا حق ا ؤمن .**

**وإذا حصل ا دى ، وحلت الر ة الناشئة عنه ، حصلت الـسعادة والفـلاح ، والـربح والنجاح ، والفرح والسرور) .**

واتـە : ﴿وَهُدًى وَرَحۡمَةٌ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ **(الـــ ـهدى)** بـریتـیـیـە لـە زانیـاری بـە حـەق و كارپێكردنی .

وە (**الر ة**)یش بریتـیـیـە لـەو خێـر و چـاكە و پاداشـتە پێـشخراو و دواخراوانـەی كـە دەستبەردار دەبێت بۆ ئەو كەسانەی كە ڕێنماییـان لـە قورئانـەوە وەرگرتـووە ، كەواتـە **(الـهدى)** گەورەترین ئامراز و ڕێگـا و وەسـیلەكانە بـۆ بەختـەوەری ، وە (**الر ـة**)یـش تەواوترین مەبەست و ئامانج و ویستراوەكانە ، بەڵام قورئان نابێتە ڕێنمایی و میهرەبـانـی بۆ هیچ كەسێك ئیللا بۆ باوەڕداران نەبێت .

وە ئەگەر ڕێنمایی بەدیهات و ئەو میهرەبانی‌یەش كە بە هۆیەوە پەیدا دەبێت جـێگیر بوو ئـەوا بەختـەوەری و خۆشـگوزرانی و ئاسـوودەیی و قـازانج و سـەركەوتن و شـادی و خۆشحاڵی دەستبەردار دەبێت .

﴿ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدًى وَرَحۡمَةً لِّقَوۡمٍ يُؤۡمِنُونَ ٦٤ ﴾ **[النحل] .**

واتە : ئێمە ئەو كتێبەمان بۆت دانەبەزاندووە ئـیللا بـۆ ئـەوە نـەبێت كـە بـۆ خـەڵكی ڕوون و یەكلابكەیتـەوە ئـەوەی كـە نـاكۆكی و جیاوازییـان تێیـدا هەیـە ، وە ڕێنمـایی و میهرەبانیشە بۆ كەسانێك كە باوەڕ بێنن .

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ [الأنبياء] .

واتە : ئێمە تۆمان نەناردووە ئیللا بەوە نەبێت کە میهرەبانی بیت بۆ هەموو جیهانیان

.

﴿ قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞۚ ٤٤ ﴾ [فصلت] .

واتە : بڵێ ئەو قورئانە ڕێنمایی و شیفایە تەنها بۆ ئەوانەی کە باوەڕیانهێناوە .

سێیەم : لە ڕێگەی پەیڕەو کردنی ئایینی ئیسلامەوە بەختەوەری و ئاسوودەی بە دەست دێت لە دونیا و دوارۆژدا ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٧ ﴾ [النحل] .

واتە : هەر کەسێك کردەوەی چاکە بکات لە نێر و مێ و ئیماندار بێت ئەوا ژیانێکی خۆش و بەختەوەری پێ دەدەین لە دونیادا و لە قیامەتیشدا بە باشترین شێوە پاداشتی کردەوەکانیان دەدەینەوە .

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨ ﴾ [الرعد] .

واتە : ئەوانەی کەوا ئیمانیان هێناوە و دڵیان بە زیکری خوا ئارام دەگرێت ، وریا بن تەنها بە زیکری خوا دڵەکان ئارام دەگرێت و بەختەوەر و ئاسوودە دەبێت .

چوارەم : وە ئەگەر بە پێچەوانەوە پشت لە ئایینی خوا بکرێت ئەوا ژیانێکی پڕ لە بێزاری و ناسۆری بۆ هەیە وەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ١٢٣ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ١٢٤ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ١٢٥ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ١٢٦ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦۚ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ١٢٧ ﴾ [سورة طـه] .

واتە : هەر کەسێك شوێنی بەرنامەی خوا بکەوێت ئەوا لە دونیادا سەرگەردان و گومڕا نابێت و لە قیامەتیشدا بەدبەخت و دۆڕاو نابێت (١٢٣) وە هەر کەسێك پشت هەڵبکات لە بەرنامەکەی خوا ئەوا بەڕاستی ژیانێکی پڕ لە بێزاری و ناسۆری هەیە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشری دەکەین (١٢٤) دەڵێت : پەروەردگارم ئەوە بۆ بە کوێری حەشری دەکەیت خۆ من لە دونیادا بینا و چاو ساغ بووم ؟ (١٢٥) خوا دەفەرموێت : ئاوەها ئایەتەکانی ئێمەت بۆ دەهات و تۆیش پشت گوێت دەخست بۆیە تۆیش ئەمڕۆ بێ بایەخ دەکرێیت (١٢٦) وە بەو شێوەیە پاداشتی ئەو کەسە دەدەینەوە لە خراپەکاریدا ڕۆچووە و باوەڕناهێنێت بە ئایەتەکای پەروەردگاری ، وە بەڕاستی سزای دواڕۆژ سەخت تر و بەردەوام ترە .

وە کاتێك موسڵمانان لە سەردەمی ئیمامی عومەردا ڕۆیشتن بۆ ئەوەی ئایینی ئیسلامی پیرۆز بگەیەنن بە فارسە ئاگرپەرستەکان و وەفدی موسڵمانان کە (ربعی کوڕی عامر) بوو گەیشتە لای سەرکردەی فارسەکان ئەویش پرسیاری لێکرد ئایا ئێوە بۆ چی هاتوون و چیتان ئەوێت ؟

(ربعی کوڕی عامر)یش لە وەڵامدا فەرمووی : **(نـحن قوم ابتعثنا ا لنخرج الناس من عبادة العباد إ عبادة رب العباد ، ومن ضق الدنيا إ سعة الدنيا والآخرة ، ومن جور الأديان إ عدل الإسلام)** .

واتە : ئێمەی موسڵمان کەسانێکین خوای گەورە ناردوومانێتی بۆ ئەوەی خەڵکی دەربێنین لە :

لە پەرستنی بەندەکانەوە بۆ پەرستنی پەروەردگاری بەندەکان ..

وە لە تەنگی دونیاوە بۆ فراوانێتی دونیا و دواڕۆژ ..

وە لە ستەمی و زەبر و زۆری ئایینە پووچەڵکانەوە بۆ دادپەروەرێتی ئیسلام .

کەواتە بە نەبوونی ئایین شێرازەی ژیان تێك دەچێت و وەك دارستان گەورە بچووك دەخوات و بەختەوەری و ئارامی و ئەمن و ئاسوودەیی و دادپەروەری لە نێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا نامێنێت .

کەوابوو دەربڕینی ئەو پرسیارە بەم شێوەیە (سود و زیانی ئاین چیە) ؟!!! هەڵەیە ! چونکە بوونی ئایین ـ بە مەرجێك ئەو ئایینە ئایینی ڕاستەقینەی خوا بێت بە بێ دەستکاری و گۆڕین ـ هەمووی سوود و بەختەوەریە نەك زیان ..

٢ ـ جیاوازی ئاینی ئیسلام لەگەڵ ئاینەکانی تردا لەوەدایە کەوا ئایینەکانی تر (ئاینی جولەکە و گاور) دەست کاری کراون و هەڵگرانی ئەو دوو ئاینە بە پێی ویست و حەز و ئارەزووی خۆیان گۆڕانیان بە سەردا هێناوە و ڕاستیەکانیان گۆڕیوەتەوە بۆ شتانێکی پووچەڵ و خوارافیات و ستەم و بەندڕەوشتی ...

بەڵام ئاینی ئیسلامی پیرۆز خوا خۆی وەعد و بەڵێی داوە بە پاراستی لە گۆڕین و دەست تێوەردان بە پێچەوانەی ئاینەکانی پێشوو ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩ ﴾ **[الـحجر]** .

واتە : ئێمە خۆمان قورئانمان دابەزاندووە و خۆشمان دەیپارێزین .

٣ ـ ئایین بۆ ئەوە هاتووە کە لە نێوان مرۆڤایەتیدا پەیڕەو بکرێت و حوکم و داردگەری پێ بکرێت لە نێوان مرۆڤەکاندا لە ئاستی تاك و کۆمەڵگا و دەوڵەت و دەسەڵاتیشدا بە گشتی بە بێ جیاوازی .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ٦٥ ﴾ **[النساء]** .

واتە : سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر ئیمانیان نیە تاوەکو تۆ نەکەن بە دادگەر لە نێوانیاندا لە کێشە و ناکۆکیەکانیاندا ئەنجا دڵ گرانیش نەبن بە بڕیارەکەی تۆ و ملکەچ دەبن .

هــەروەها فەرموویــەی : ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ **[الأحزاب]** .

واتە : بۆ هیچ ئیمانداریێکی پیاو و ژن نی‌یە ئەگەر خـوا و پێغەمبەرەکـەی بڕیارێکیـان دا لە سەر شتێك کەوا مافـی هەڵبژاردیان هەبێت هەبێت تێیدا ، وە هەرکەسێك سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات ئەوا گومڕا دەبێت گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرا .

هــەروەها فەرموویــەی : ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾ **[یوسف]** .

واتە : حوکم و دادگەری تەنها بۆ خوایـە و خـوا فـەرمانی کـردووە بـەوەی کـەوا هـیچ پەرستراوێك نەپەرسترێت تەنها ئەو نەبێت ، ئا ئەوەی دین و بەرنامەی ڕێك و ڕاست بەڵام زۆرینەی خەڵکی نازانن .

هـــەروەها فەرموویـــەی : ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ **[المائدة]** .

واتە : ئەوەی حوکم و دادوەری بەو بەرنامەیـە نـەکات کـە خـوا دایبەزانـدووە ئەوانـە بێباوەڕن .

وە دەفەرموێ : ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾ **[المائدة]** .

واتە : ئەوەی حوکم و دادوەری بەو بەرنامەیـە نـەکات کـە خـوا دایبەزانـدووە ئەوانـە ستەمکارن .

وە دەفەرموێ : ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾ **[المائدة]** .

واتە : ئەوەی حوکم و دادوەری بەو بەرنامەیـە نـەکات کـە خـوا دایبەزانـدووە ئەوانـە تاوانبار و ناپاکن .

کەواتە دەبێت دەسەڵات و سیستەمەکەی تەنها ئاینی پیرۆزی ئیسلام پەیڕەو بکات بۆ ئەوەی کۆمەڵگا بگەیەنێت بە بەختەوەری دونیا و دوا ڕۆژ ، وە بە پێچەوانەوە ڕووبەڕووی هەموو ئەو ئایەتانە دەبنەوە .

**پ٢ / سڵاو بەڕێزان ... چەند پرسیارێکم هەیە :**

**ـ ئایا خوای گەورە لەبەر خاتری محمد (ﷺ) دنیای دروست کردووە ؟**

**ـ ئایا داواکردن لە پێغەمبەر (ﷺ) دروستە بۆ هەر مەبەستێک بێت ؟**

**ـ ئایا بە کەسێک بڵێیت ئەصحابەکە .. تاوان نییە ؟**

**ـ ئایا دڵخۆشکردن بە سەرکردە و حیزبی عەلمانی تاوان نییە ؟**

وەڵام /

١ ـ نەخێر خوا لە بەر خاتری پێغەمبەر (ﷺ) دونیای دروست نەکردووە !

بەڵکو بۆ خواپەرستنی بە تەنها و تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان و هەموو دروستکراوەکانی تری درووست کردووە بە بەڵگەی ئەم دوو ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ **[الذاريات]** .

واتە : ئێمە جنۆکە و مرۆڤمان دروست نەکردووە ئیللا بۆ ئەوە نەبێت کە بە تەنها من بپەرستن .

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۝٢﴾ **[الـملك]** .

واتە : ئەو خوایەی کەوا مردن و ژیانی درووست کردووە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامتان چاکەکارتر دەبن .

کەواتە خوا بۆ خواپەرستی و چاکەکاری جنۆکە و مرۆڤ و مردن و ژیانی درووست کردووە .

وە ئەو بەناو فەرموودەیە کە دەڵێت : **(لولاك لولاك لـما خلقـت الأفـلاك)**[1] هەڵبەستراو و درۆیە و پێچەوانەشە بۆ ئەو دوو ئایەتە و چەندین ئایەتی تریش لە قورئاندا .

٢ ـ دوا کردن لە پێغەمبەر (ﷺ) دروست نییە ، بەڵکو دەبێت تەنها داوا لە خول بکرێت ، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە :

﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ **[يونس] .**

واتە : داوا مەکە لە جگە لە خوا و لێی مەپاڕێرەوە کە نە سوودت پێدەگەیەنێت و نە زیان ، وە ئەگەر ئەمەت کرد ـ واتە : ئەگەر هاوارت کردە غەیری خوا و لێی پاڕایتەوە ـ ئەوا تۆ لە ستەمکارە هاوەڵبڕیاردەرەکانی .

(**الظالم : أي المشرك** ، واتە : لە موشریك و هاوەڵبڕیاردەرەکانی) .

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((من مات وهو يدعو من دون الله نِداً دخـلَ النار))**[2] .

واتە : هەرکەسێك بمرێت لە کاتێکدا کە شەریك و هاوشێوازێکی بۆ خوا دانابێت و هاواری تێکردبێت و لێی پاڕابێتەوە ئەوا دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە .

چونکە دوعا و پاڕانەوە پەرستن و عیبادەتە ، خوای پایەبەرز فەرموویەتی : ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾ **[غافر] .**

واتە : پەروەردگارتان فەرموویەتی : ئێوە داوام لێبکەن و لێم بپاڕێنەوە منیش وەڵامتان دەدەمەوە و دوعاکانتان گیرا دەکەم ، ئا ئەوانەی کەوا خۆیان بە گەورە دادەنێن لە ئاستی دوعا و پاڕانەوە و پەرستنی خوا ئا ئەوانە دەچنە ناو جەهەنم و دۆزەخەوە بە سەرشۆڕیەوە .

---

[1] (موضوع) سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة رقم : (٢٨٢) .
[2] صحيح البخاري رقم : (٤٤٩٧) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٤) .

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((الدعاءُ هو العــبادة))**[3].

واتە : دوعا و پاڕانەوە بریتی‌یە لە پەرستن و عیبادەت .

دوعا و پاڕانەوە پەرستن و عیبادەتە دەبێت بۆ خوا بکرێت نەك بۆ پێغەمبەر (ﷺ) چونکە تۆ لە نوێژدا دەڵێیت : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾.

واتە : خوایە من تەنها تۆ دەپەرستم و تەنهاش داوای یارمەتی لە تۆ دەکەم .

جا هەر کەسێ داوای یارمەتی لە پێغەمبەر (ﷺ) بکات ئەوا خۆی دەخاتە دۆروە چونکە ئەم وەعدەی دەشکێنێت و پێچەوانەی ئەم ئایەتە و ئایەتەکانی پێشتر و چەندین ئایەتی تریش دەکات لە قورئاندا .

٣ ـ بەڵێ تاوانبار دەبیت چونکە هیچ کەسێك ناگاتە پلەی صەحابە ، وە ئەو قسەیە لە کاتی تۆڕەبووندا دەوترێت و هەڵەیە .

٤ ـ عەلمانیەت بریتی‌یە لە دوور خستنەوەی ئاین لە ژیانی نێو کۆمەڵگا و پەیوەندی نێوان تاکەکانی .

ئاشکراشە کەوا ئاین بۆ ئەوە خوا ناردوویەتی چۆنێتی و شێوازی خواپەرستی و پەیوەندی نێوان خوا و بەندەکانی لە لایەك و هەروەها پەیوەندی نێوان بەندەکان لەگەڵ یەکتردا ڕوون بکاتەوە .

کەوابوو عەلمانیەت باوەڕی بە پەیڕەوکردنی ئاین نی‌یە لە ژیانی گۆمەڵگادا .

جا هەر کەسێك باوەڕی وابێت و ئاین بە شایستەی پەیڕەوکردن نەزانێت ئەوا ئەو کەسە کەسێکی بێباوەڕە بە دین و ئاینی خوای گەورە چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ۝٨٥﴾ **[آل عمران]** .

واتە : هەر کەسێك جگە لە ئیسلام هەر بەرنامەیەکی تر پەیڕەو بکات ئەوا هەرگیز لێی قەبوڵ ناکرێت و ئەو کەسەش لە ڕۆژی دوایدا لە خەسارۆمەندانە .

---

[3] **صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٩٦٢) .**

**پ٣ / . من لە باخچەی ساوایان کاردەکەم بەڵام نوێژی نیوەڕۆم ئەڕوات زۆر جار بۆم دووبارە ناکرێتەوە لەبەر بێ کاتی خۆم زۆر بەتاوانبار ئەزانم بەڵام نازانم چی بکەم ؟**

**ـ من منداڵم نی‌یە دوای هەموو هاتوچۆیەک بۆ لای دکتۆر و گەڕانێکی زۆر بە دوای چارەسەر ، ئێستا پەنام بردووە بۆ لای مەرقەدە پیرۆزەکان ئایا تاوان نی‌یە یان ڕاستە ئیمان بە پیاوچاکان تاوان نی‌یە؟**

وەڵام /

خوشکی بەڕێز دەبێت هەوڵبدەیت نوێژەکەی نیوەڕۆت لە کاتی خۆیدا بکەیت با لە دەوامیشدابیت بەوەی کەوا هەر لە شوێنی دەوامەکەتدا نوێژەکە بکەیت ؟ چونکە بە ڕاستی نازانم بۆ چی مەجالت نی‌یە ؟! ئایا ئاو نی‌یە یان ڕێگریت لێدەکەن ؟! یان داپۆشراو نیت ؟!!! ئایا بۆ دەبێت کارمەندێکی دایەنگا یان باخچەی ساوایان مەجالی نەبێت نوێژی نیوەڕۆ بکات لە کاتی خۆیدا ؟

وە ئەگەر لە پاش هەوڵدان هەر بۆت نەکرا نوێژەکەی نیوەڕۆت لە کاتی خۆیدا بکەیت .. ئەوا دەبێت دوای بخەیت و لەگەڵ نوێژی عەسردا کۆی بکەیتەوە بەم شێوەیە : دوای بانگی عەسر چوار رکعات نوێژی نیوەڕۆ دەکەیت و سەلام دەدەیتەوە ئەنجا دوای ئەوە ڕاستەخۆ چوار رکعات نوێژی عەسریش دەکەیت .

بەڵام تاوەکو پێت دەکرێت نوێژەکانت لە کاتی خۆیاندا ئەنجام بدە .

وە بە نیسبەت پرسیاری دووەمتەوە دەڵێم :

سەردانی مەرقەد و گۆڕی شێخ فلان و شەخس و ئیمام و دار و بەرد بە مەبەستی منداڵ بوون بە هۆی ئەو سەردانەوە شیرکە و هاوەڵ بۆ خوا ئەنجامدانە و هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێت بەڵکو تاوانبارت دەکات و ئیمانەکەت پووچەڵ دەکاتەوە و هەڵیدەوەشێنێوە چونکە منداڵ پێبەخشین کارێکە تەنها خوا نەبێت هیچ کەس و هیچ شتێك ناتوانێت ئەنجامی بدات وە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی : ﴿ لِلَّهِ مُلْكُ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ **يَهَبُ لِمَنْ يَشَاء إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَاء الذُّكُور** ﴿٤٩﴾ **أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَن يَشَاء عَقِيمًا** ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾ **[الشورى]** .

واته : تەنها هی خوایە موڵکی ئاسمانەکانی و زەوی .. دروستی دەکات ئەوەی کە خۆی ویستی لێیهەبێت .. کچ دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە خۆی ویستی لێیهەبێت و کوڕیش دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە خۆی ویستی لێیهەبێت ، وە یان کوڕ و کچ هەردووکیان پێکەوە دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە خۆی ویستی لێیهەبێت ، وە یان هەر کەسێك کە خۆی ویستی لێیهەبێت نەزۆکی دەکات و بێ منداڵ دەبێت ، بە ڕاستی ئەو خوایە زانا و بە توانایە .

کەواتە خۆت لە ماڵەوە لە خوا بپاڕێرەوە و تەنها دوا لە خوای زانا و بە توانا بکە کەوا منداڵی چاك و صاڵحت پێببەخشێت .

ئێمەش داوا لە خوا دەکەین کەوا منداڵی چاك و صاڵحت پێببەخشێت و بتپارێزێت لە تاوانی شیرك و هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا کە بەڕاستی گەورەترین و ترسناکترین تاوانە کە زۆرینەی خەڵك لە نەزانیدا تێیدەکەون ، خوا پەنای ئێمە و تۆش بدات .

* **سیحر و جادوو** :

**پ٤ / ئەگەر یەکێ جادوو و نوشتە (سیحر)ی لێکرابێ چۆن بەتاڵ دەکرێتەوە ؟ چ ئایەتێک بخوێنم ؟**

وەڵام /

عیلاج و چارەسەر کردنی نوشتەی سیحری و جادوو دەبێت بە دوو بەشەوە :

**بەشی یەکەم** : ئەو کردەوانەی کە خۆپارێزی پێدەکرێت لە سیحر و جادوو پێش ڕوودانی :

١ ـ ئەنجامدانی هەموو کردەوە فەرزکراوەکان و وازهێنان و دوو کەوتنەوە لە هەموو حەرام و قەدەغەکراوەکان ، و تەوبەیەکی ڕاستەقینە و پاك لە هەموو تاوانەکان .

٢ ـ زۆر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە شێوەیەك کە ڕۆژانە ئەندازەیەکی دیاری کراوی لێبخوێنێت و بیکات بە ویردی ڕۆژانەی .

٣ ـ خوێندنەوەی (**سورة البقرة**) بە کاملی لە ماڵدا (چ کەسێك بیخوێنێت یان بە کاسێت لێبدرێت) ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((**اقْرَءُوا سورةَ الْبقَرة فـي بيوتكُم ، فَإن الشيطَانَ لا يدخلُ بيتاً يقْرأُ فيه سورةُ الْبقَرة**))[٤].

واتە : لە ناو ماڵەکانتاندا (**سورة البقـرة**) بخوێننەوە چونکە شەیتان ناچێتە ناو ماڵێکەوە کەوا (**سورة البقرة**)ی تێدا بخوێنرێت .

٤ ـ خۆ قایم کردن بە خوێندنەوەی دوعا و پەناپێگراو و زیکرە شەرعیەکان ، بە تایبەت ئەم زیکرانە :

- زیکری بەیانیان و ئێواران .
- زیکری دوای نوێژە فەرزەکان .
- زیکری پێش خەوتن و پاش لە خەو هەستان .
- زیکری لە ماڵ دەرچوون و هاتنە ژوورەوە بۆ ماڵ .
- زیکری پێش جلوبەرگ داکەندن و پاش لەبەر کردنی .
- زیکری پێش چوونە سەر ئاو و پاش دەرچوونە دەرەوە لە سەر ئاو .
- هەروەها هەموو زیکرەکانی تر کە لە سوونەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە ، بۆ ئەم مەسەلەیە دەتوانیت سوود ببینیت لەم کتێبە : (**حصن المسلم من أذكـار اليـوم والليلة**) .

وە بۆ خۆپارێزی لە (سیحر و جادوو) دەبێت ئەم زیکرانە بخوێنیت بە تایبەت :

ـ **(بِسم الله الذي لا يضر مع اسمه شيءٌ في الأرض ولا في السماءِ وهو السميع الْعليم)**

سێ جار بەیانیان پێش خۆر کەوتن و ئێواران پێش خۆر ئاوا بوون .

---

[٤] صحيح الـجامع الصغ رقم : (١١٧٠) .

واتە : کار ئاسانی بکەن و قورسی مەکەنەوە .

بەڕاستی قەدەغەکردنی دەست تێخستن و پرشی دەست تێکەوتن ئەرکێکی یەکجار قورس و گرانە و زۆر ناڕەحەتە ، بۆیە هەندێك جار دەبێتە هۆی ناکۆکی نێوان هەندێك ژن و پیاو کاتێك کە پیاوەکە دەبینێت ژنەکەی یان منداڵەکەی دەستی خستوتە ناو ئاوی خۆشوردنەکەیەوە یان کاتێك پرشی دەستی خۆی تێدەکەوێت !!! وە هەندێك لەو جۆرە موسڵمانە نەزانانە ئەوەندە ناڕەحەت دەبن واز لە نوێژکردن دێنن !!!

*** وەسوەسە لە دەستنوێژ و نوێژدا :**

**پ٢٢ / هەندێک جار لە کاتی دەستنوێژ بوونمدا هەروەها لە کاتی نوێژکردنمدا وا هەست دەکەم کەوا دەستنوێژەکەم هەڵوەشاوەتەوە و نەماوە ، نازانم ئایا ئەمە حەقیقەتە یان وەسوەسەیە ؟ ئەمەش وای لێم کردووە کە زۆر جارێک دەستنوێژ و نوێژ دووبارە بکەمەوە .. هەروەها وای لێم کردووە کە نەشگەم بە نوێژی جەماعەت و زۆریش بیرم دەڕوات لە کاتی نوێژدا ؟**

وەڵام /

ئەمە وەسوەسەی شەیتانە و پێویستە پاڵی نەیت و گوێی پێ نەدەیت ، لە بەر ئەم فەرموودەیە : پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وترا : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر پیاوێك گومانی ئەوەی بۆ دروست بوو کەوا شتێکی لێبووەتەوە لە ناو نوێژدا ؟ فەرمووی : **((لاَ ينصرف حتى يسمع صوتاً أو يجِد رِيحاً))**[٣٣].

واتە : لە نوێژەکەی نابێتەوە تاوەکو گوێی لە دەنگێك نەبێت یان هەست بە بۆنێك نەکات .

جا لە بەر ئەم فەرموودەیە نابێت موسڵمان لە نوێژەکەی بێتەوە و ناشبێت وا بزانێت کە دەستنوێژەکەی بەتاڵ بووەتەوە بەو وەسوەسەیەی کە بۆی پێدا بووە ،

---

[٣٣] **صحيح البخاري رقم : (١٣٧) وصحيح مسلم رقم : (٨٠٢) .**

بەڵکو دەبێت گوێی پێ نەدات ، مەگەر دڵنیا بێت لەوەی کەوا شتێکی لێوە دەرچووە جا ئەگر دڵنیا بوو ئەو کاتە دەستنوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە .

**پ٢٣ / چۆنێتی لابردنی مووی لاشە ؟ وە ئایا ماوەی بۆ دیاری کراوە ؟**

وەڵام /

**عن أبي هريرةَ (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قَالَ : ((خمس من الفِطْرة : الختانُ ، وحلْق العانة ، ونتف الإبط ، وتقْليم الأظْفَار ، وأخذُ الشاربِ))[٣٤].**

واتە : پێنج ئاکار لە سروشت پاکین : خەتەنەکردن ، تووکەبەر تاشین ، هەڵکەندنی مووی بن باڵ ، نینۆك قرتاندن ، سمێڵ گرتن .

لەم فەرموودەیەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەوا :

- سوننەتە لابردنی مووی بەری مرۆڤ بە تاشین بێت بە مووس ، بەڵام دروستیشە بە مەقەص یان بە مەکینە یان بە بەکارهێنانی دەرمانی تایبەت بە وەراندنی موو لابرێت .

- سوننەتە لابردنی مووی بن باڵی مرۆڤ بە هەڵکەندن بێت ، بەڵام دروستیشە بە تاشین یان مەقەص یان بە مەکینە یان بە بەکارهێنانی دەرمانی تایبەت بە وەراندنی موو لابرێت .

**وعن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قَالَ أنس : ((وقت لَنا في قَص الشاربِ وتقْليمِ الأظْفَار ونتف الإبط وحلْق العانة أنْ لاَ نترك أكْثَر من أربعِ ليلَةً))[٣٥].**

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی بۆ دیاری کردوین کەوا کورت کردنەوەی سمێڵ بە مەقەص و قرتاندنی نینۆك و هەڵکەندنی مووی بن باڵ و توکەبەر تاشین زیاتر لە (٤٠) چل شەو نەهێڵرێتەوە .

کەواتە دەبێت لە ماوەی (٤٠) چل ڕۆژدا لا ببرێت .

---

[٣٤] صحيح البخاري رقم : (٥٨٨٩) وصحيح مسلم رقم : (٥٩٦) .

[٣٥] صحيح مسلم رقم : (٥٩٨) .

**پ٢٤ / بەڕێز مامۆستا گیان من یەک پرسیاری شەرعیم هەیە : ئایا دەستدان بە زەکەرەوە دەستنوێژ دەشکێنێت ئەگەر بە قەستی نەبێت ؟**

وەڵام /

دەست دان لە (زەکەر یان عەورەت) دوو حاڵەتی هەیە :

١ ـ ئەگەر بە شەهوەت و زەوقەوە بێت ئەوا دەستنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((من مس ذكره فَلْيتوضأ))**[٣٦] .

واتە : هەر کەسێك دەستی دا بە زەکەرییەوە ئەوا با دەستنوێژ بگرێت .

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إِذَا أَفْضى أحدكُم بِيده إِلى فَرجِه فَلْيتوضأ))**[٣٧] .

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە دەستی دا بە زەکەرییەوە ئەوا با دەستنوێژ بگرێت .

**وله شاهد بلفظ : ((إِذَا أَفْضى أحدكُم بِيده إِلى فَرجِه وليس بينهما سترةٌ ولا حجاب فَلْيتوضأ))**[٣٨] .

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە دەستی دا بە زەکەرییەوە و بەربەستێك یان پۆشاکێك نەبێت لە نێوانیاندا ئەوا با دەستنوێژ بگرێت .

٢ ـ وە ئەگەر موسڵمان بە بێ شەهوەت و زەوقەوە دەستی بەر زەکەری یان عەورەتی بکەوێت ئەوا دەستنوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە و دەستنوێژ ناگرێتەوە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە پرسیار کراوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە پیاوێك کە دەست دەدات لە زەکەری ئایا دەستنوێژی لەسەرە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لا ، إنما هو بِضعةٌ منك))**[٣٩] .

واتە : نەخێر دەستنوێژی لە سەر نییە ، چونکە زەکەر بەشێکە لە تۆ .

---

[٣٦] **صحيح أبي داود رقم : (١٨١) .**

[٣٧] **سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٢٣٥) .**

[٣٨] **سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٢٣٥) ، إسناده جيد .**

[٣٩] **رواه الخمسة وصححه ابن حبان قاله الألباني تمام المنة ص : (١٠٣) .**

کەواتە ئەگەر بە بێ شەهوەت و ئارەزوو دەستی بەر زەکەری یان عەورەتی کەوت ئەوا دەستنوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە و دەستنوێژ ناگرێتەوە چونکە وەك ئەوە وایە کە دەست بدات بە لووتی‌یوە یان دەست بدات بە گوێییەوە .

شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت لەم بارەیەوە فەرموویەتی : **(قلت : قوله (ﷺ) : ((إنما هو بِضعةٌ منك)) فيه إشارة لطيفة إ أن الـمس الذي لا يوجب الوضوء إنما هو الـذي لا يقترن معه شهوة ، لأنه هذه الـحالة يـمكن تشبيه مس العضو بـمس عضو آخر من ا ـسم لاف ما إذا مسه بشهوة فحينئذ لا يشبه مسه مس العضو الآخر ، لأنه لا يقترن عادة بـشهوة ، وهذا أمر بـ كما ترى ، وعليه فا ديث ليس دليلا للحنفية الذين يقولون بأن الـمس مطلقـا لا ينقض الوضوء بل هو دليل ن يقول بأن ا س بغ شهوة لا ينقض ، وأما الـمس الشهوة فيـنقض بدليل حديث بسرة ، وبـهذا يـجمع بـ الـحديث ، وهو اختيار شيخ الإسلام ابن تيميـة بعض كتبه على ما أذكر ، وا أعلم)**[٤٠] .

واتە : دەڵێم : فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) : "زەکەرت بەشێکە لە تۆ" ئاماژەیەکی وردی تێدایە بۆ ئەوەی کەوا ئەو دەست لێدانەی کە دەستنوێژ پێویست ناکات ئەوەیە کە ئارەزووی لەگەڵدا نییە ، چونکە لەم بارەدا دەتوانرێت دەست پێوەدانی ئەم ئەندامە بشوبهێرێت بە دەست پێوەدانی ئەندامێکی تر لە لەشدا ، بە پێچەوانەی ئەوەی کەوا ئەگەر دەست پێوەدانی (زەکەر) بە ئارەزووەوە بێت ، ئەوا لەم کاتەدا دەست پێوەدانی ناشوبهێرێت بە دەست پێوەدانی ئەندامێکی تر ، چونکە دەست پێوەدانی ئەندامەکەی تر باو وایە کە ئارەزووی لەگەڵدا نییە ، ئەمەش ڕوونە وەکو دەیبینیت .

کەواتە ئەم فەرموودەیە نابێتە بەڵگە بۆ حەنەفی مەزهەبەکان کە دەڵێن : دەست پێوەدان بە ڕەهایی دەستنوێژ ناشکێنێت بەڵکو بەڵگەیە بۆ ئەوانەی کە دەڵێن : دەست پێوەدان بە بێ ئارەزوو دەستنوێژ ناشکێنێت ، بەڵام دەست پێوەدانی (زەکەر) بە

---

[٤٠] تـمام الـمنة ص : (١٠٣) .

ئارەزووەوە ئەوا دەستنوێژ دەشکێنێت بە بەڵگەی فەرموودەکەی (**بسرة**) : **((من مـس ذَكره فَلْيتوضـأ))** ، ئا بەم شێوەیە هەردوو فەرموودەکە کۆدەکرێتەوە ، وە ئەمەش هەڵبژاردەی (**شيخ الإسلام ابن تيمية**)یە لە هەندێك لە کتێبەکانیدا بە پێی ئەوەی کە بە بیرم دێتەوە ، وە خواش زاناترە .

**پ٢٥ / لە پاش میز ئاوێکی سپی دەردەچێت هۆکار و حوکمی چیە ؟**

وەڵام /

ئەو ئاوە سپیە لیکەی کە ڕاستەوخۆ لە پاش میزکردنەوە دەردەچێت پێی دەوترێت (وەدی) .

حوکمەکەی ئەوەیە کە پیسە وەك میز ، بۆیە دەبێت خۆت پاك بکەیتەوە لێی وەك چۆن خۆت لە میز پاك دەکەیتەوە لە پاش میزکردن ، وە ئەگەر بەر جلی ناوەوەت کەوت ئەوا تەنها ئەو جێگایە دەشویت کە بەری کەوتوە ، وە بە دەرچوونی ئەم ئاوە لەش گران نابێت ، بۆیە پێویستی بە خۆشۆردن و غوسل کردن نیە .

بەڵام بە نیسبەت هۆکارەکەیەوە ، ئەوا دەتوانیت پرسیار بکەیت لە پزیشکی پسپۆر لە بواری (**المـجاري البولية**)دا .

**پ ٢٦ / ئایا قورئان خوێندنەوە بە بێ دەستنوێژ دروستە ؟**

وەڵام /

خوێندەنەوەی قورئان بە بێ دەست نوێژ دروستە چ بە لە بەر کراوی بێت یان لە ناو قورئانەکەدا خۆی بێت یان لە ناو مۆبایلدا بێت چونکە هیچ بەڵگەیەکی صەحیح و صەریح نەهاتووە خوێندەنەوەی قورئان بە بێ دەست نوێژ حەرام و قەدەغە بکات :

دایکە عائیشە ڕەزای خوای لێبێت فەموویەتی : **(كَانَ النبي (ﷺ) يذْكُر الله علَى كُلّ أحيانِه)**[٤١].

---

[٤١] صحيح مسلم رقم : (٨٢٤) .

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو حاڵەتێکدا زیکری خوای دەکرد .

بەڵام باشتر وایە و سوننەتە بە دەست نوێژەوە زیکر و قورئان بخوێنێت ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەموویەتی : **((إني كرهت أنْ أذْكُر الله عز وجل إلا على طهارة))**[٤٢].

واتە : من پێم باش نیە زیکری خوای گەورە بکەم ئیللا بە پاکی (واتە : بە دەستنوێژەوە) نەبێت .

ئیمامی **(النووي)** ڕەحمەتی خوای لێ بێت فەرموویەتی : **(أ ع الـمـسلمون على جواز قراءة القرآن للـمحدث ، والأفضل أنْ يتطهر لـها)**[٤٣].

واتە : موسڵمانان کۆڕا و یەکدەنگن لەسەر دروستێتی قورئان خوێندن بۆ کەسی بێدەستنوێژ ، وە باشتر وایە دەستنوێژی بۆ بگرێت .

وە ئەو ئایەتەی کەوا هەندێك لە زانایان کردوویانەتە بەڵگە بۆ ئەوەی کە نابێت بە بێ دەستنوێژ دەست بدەیت بە قورئانەوە : ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ ﴾ **[الواقعة] .**

واتە : **(اللوح الـمحفوظ)** کەس دەستی پێوە نادت ئیللا فریشتەکان نەبێت .

ابن عباس فەرموویتی : (﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ ﴾ **الـملائكة**) .

واتە : مەبەست بە ﴿ ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴾ فریشتەکانە .

کەواتە ئەم ئایەتە باسی فریشتەکان دەکات نەك مرۆڤەکان ، بۆیە ئەم ئایەتە هیچ پەیوەندیەکی بەم باسەوە نیە .

وە بۆ زانیاری زیاتر ئەوەش بزانە کەوا (موسڵمانی لەشگران) و (ئەو ئافرەتەی کە لە حاڵەتی بێنوێژی و زەیسان)یدا دەتوانێت قورئان بخوێنێت ، چونکە هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و صەحیح نەهاتووە ڕێگری ئەمەی لێبکات ، هەروەها فەرموودەکەی دایکە

---

[٤٢] **صحيح أ داود رقم : (١٧) .**

[٤٣] **الـمجموع : (٢ / ٧٦) .**

عائیشه بەڵگەیەکی زۆر بە هێزە بۆ دروستێتی قورئان خوێندنی (موسڵمانی لەشگران) و (ئەو ئافرەتەی کە لە حاڵەتی بێنوێژی و زەیسان)دایە .

بڕوانە کتێبی : **[أسئلة طال حوا ـ ها الـ جدل ص : (١٣ ـ ٢٢)]** .

*** میزە چرکە :**

**پ٢٧ / من لە پاش میزکردن و دەرچوون لە سەرئاو هەست دەکەم بە دەرچوونی چەند دۆڵپەیەک لە میز ، ئایا من چیم لە سەرە ؟**

وەڵام /

ئەم حاڵتە دەبێت بە دوو بەشەوە :

یەکەم : هەندێك جار ئەمە وەسوەسی شەیتانە و لە ڕاستی و حەقیقەتدا وا نی‌یە ، جا پێویستە ئیماندار گوێ نەدات بەم وەسوەسانە چونکە شەیتان زاڵ دەکات بە سەر خۆیدا و وای لێدەکات کردەوەکانی لێ تێك بدات وەك نوێژ و جگە لەمەش .

دووەم : وە هەندێك جاریش ئەم حاڵەتە ڕاستە و حەقیقەتە لە هەندێك خەڵکدا ، جا ئەگەر حەقیقەت بوو ئەوا با لە سەر ئاو پەلە نەکات تاوەکو بە تەواوی میزەکەی دێتە دەرەوە و بە شێوەیەکی طەبیعی خۆی دەبڕێتەوە ئەنجا تارات دەگرێت و (زەکەری بە ئاو دەشوات) ، وە ئەگەر ترسا لە پاش ئەوە شتێك بێتە دەرەوە ئەوا با هەندێك ئاو بپژێنێت لە شۆرتەکەی (جلی ناوەوەی) لە دەروبەری شوێنی (زەکەری) ، ئەنجا دەستنوێژ دەگرێت ، ئەم ئاو پژاندنەش بۆ ئەوەیە ئەگەر گومانی ئەوەی بۆ دروست بوو کە میزی لێوە دەرچووە وا دابنێت ئەوە لەو ئاوەیە کە پژاندوویەتی بە شۆرتەکەیدا ، ئەمە دەبێتە یارمەتی دەری بۆ وازهێنان لە وەسوەسە .

وە ئەگەر بە دڵنیایی و بە بێ گومان هەستی کرد بە دەرچوونی شتێك ئەوا تاراتەکەی دووبارە دەکاتەوە و دووبارەش دەستنوێژ دەگرێتەوە ، بەڵام ئەگەر کومانی هەبوو ئەوا گوێی پێنادات تاوەکو دڵنیا نەبێت .

لە بەر ئەمە کاتێك پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وترا : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر پیاوێك گومانی ئەوەی بۆ دروست بوو کەوا شتێکی لێبووەتەوە لە ناو نوێژدا ؟ فەرمووی : **((لاَ ينصرف حتى يسمع صوتاً أو يجِد ريحاً))**[٤٤].

واتە : لە نوێژەکەی نابێتەوە تاوەکو گوێی لە دەنگێك نەبێت یان هەست بە بۆنێك نەکات .

**پ٢٨ / پرسیارەکەم ئەوەیە : ئایا ژن دوای منداڵبوون تا چەند ڕۆژ نابێ پیاوەکەی بچێتە لای واتە جیماعی لەگەڵ بکات ؟ لەگەڵ سوپاس بۆ ئێوە .**

وەڵام /

ئافرەت لە دوای منداڵبوونیەوە نابێت نوێژ بکات و ڕۆژو بگرێت و حەرامیشە مێردەکەی لەگەڵیدا جووت ببێت تاوەکو پاك دەبێتەوە .

پاك بوونەوەکەشی کاتی دیاری کراوی نیە ، واتە هەر کاتێك بۆی دەرکەوت خوێنی پاش منداڵ بوونی نەماوە و ئاوە سپیەکەی بینی ـ هەر وەك چۆن لە کاتی عادەی مانگانەدا دەیبینێت ـ ئەوا پێویستە خۆی بشوات و نوێژەکانی ئەنجام بدات و حەڵاڵیشە مێردەکەی لەگەڵیدا جووت ببێت ئەگەر چی پاش حەوت ڕۆژ یان پاش شازدە ڕۆژ یان بیست و دوو ڕۆژ یان پاش سێ ڕۆژیش بێت یان کەمتر یان زیاتر بە مەرجێك لە (٤٠) چل ڕۆژ تێپەڕ نەکات .

بەڵام ئەگەر ئافرەتێك خوێنی دوای منداڵبوونی بەردەوام بوو ئەوا تاوەکو (٤٠) چل ڕۆژ خۆی ناشوات بۆ نوێژ و حەڵاڵیش نیە مێردەکەی لەگەڵیدا جووت ببێت ، ئەنجا لە دوای (٤٠) چل ڕۆژەکە خۆی دەشوات بۆ ئەوەی بتوانێ نوێژەکانی بکات و حەڵاڵیشە مێردەکەی بچێتە لای .

---

[٤٤] **صحيح البخاري رقم : (١٣٧) وصحيح مسلم رقم : (٨٠٢) .**

وە ئەگــەر دوای (٤٠) چـل ڕۆژ خــوێنی هــەبوو ئــەوا ئــەو خوێنــە پــێی دەوترێــت (**استحاضة**) واتە نەزیف بـوون و بـە (خـوێنی دوای منـداڵ بـوون) حیـساب ناکرێـت ، لـەم حاڵەتەدا نوێژی لە سـەرە و دروستیـشە مێردەکـەی بـچێتە لای ، بـەڵام دەبێـت بـۆ هـەر نوێژێك دەستنوێژەکەی نوێ کاتەوە ، هەروەها دەبێت بچێت بۆ لای پزیشکی پسپۆر بـۆ چارەسەر وەرگرتن(٤٥) .

**پ٢٩ / ئایا مەرجە هەر کە تەواو بویت لە سوڕی مانگانە یەکسەر خۆت بشۆی ؟ چونکە لە زستاندا تا حومام دانەخرێت ناتوانین خۆمان بشۆین جاری وا هەبووە دوای سێ یان چوار ڕۆژ غوسلم دەرکردووە ؟**

وەڵام /

بەڵێ مەرجە هەر کە تەواو بویت لە سـوڕی مانگانـە یەکـسەر خـۆت بـشۆیت و نابێـت خۆشۆردن دوا بخرێت بۆ ئەوەی نوێژە فەرزەکانت لە دەست دەرنەچێت و لە کاتی دیاری کراوی خۆیاندا ئەنجامیان بدەیت .. وە لە حاڵەتی ئاوەهادا پێویستە حومـام دابخـەیت و ئاو گەرم بکەیت ئەگەر چی زستانیش بوو چونکە ئەمە پێویستە و بە ویستی خۆت نـیـیە پێشبخرێت یان دوا بخرێت وەك خۆشۆردن بە مەبەستی خـۆ خـاوێن کردنـەوە لـە چڵك و بۆنی لاشە .

جا خووشکی بەڕێز ئەگەر تۆ بۆ خۆشۆردنی سوڕی مانگانە کە لە مانگێکدا یـەك جـار دێتـە ڕێـت دوای سـێ یـان چـوار ڕۆژ غوسـلت دەرکردبێـت ! ! ! ئایـا دەبێـت پیـاوان و ئافرەتـانی لای ئێـوە لـە حاڵـەتی لەشـگرانیدا کـە چـەندین جـار ڕوودەدات چـۆن خۆیـان دەشۆن و غوسل دەردەکەن ؟

---

(٤٥) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە کتێبی : (کورتەیە لە فیقهی سوننەت و قورئانی ئـازیز / بەشـی پـاك و خـاوێنی) لاپـەڕە : (١٣٢ ـ ١٣٨) ، هەروەها کتێبی : (فقهی شەرعی ئافرەتان تایبەت بە ئەحکامی خوێنەکان) بخوێنەرەوە .

بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە ! ئایا چۆن دەبێت موسڵمان ئەوەندە کەمتەرخەم و تەمبەڵ بێت و گوێ نەدات بە غوسل دەرکردن و فەوتاندنی نوێژە فەرزەکانی !! تا ئەو ئاستەی کەوا ئافرەتێکی موسڵمان بڵێت : (جاری وا هەبووە دوای سێ یان چوار ڕۆژ غوسلم دەرکردووە) !!!

ئەم کارە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە و نابێت دووبارە بکرێتەوە ..

وە ئەگەر زۆر نارەحەت بویت کە ڕاستەخۆ غوسلت دەربکەیت ئەوا دەبێت (تەیەموم) بکەیت بۆ ئەوەی بتوانیت نوێژە فەرزەکەی ئەو کاتە بکەیت کە تێیدا پاك دەبیتەوە تاوەکو پاشان حومام دادەخەیت و ئاو گەرم دەکەیت و خۆت دەشۆیت ..

*** دەستنوێژ گرتن بە بێ تارات گرتن :**

**پ٣٠ / ئایا دروستە مرۆڤ لە کاتی لە خەو هەستان یەکسەر دەستنوێژ بشوات بێ ئەوەی بچێت بۆ سەرئاو ؟**

وەڵام /

ئەگەر موسڵمانێك ویستی دەستنوێژ بگرێت ئەوا پێویست ناکات بچێتە سەر ئاو بۆ (تارات گرتن) ئەگەر تەنگاو نەبێت ، بۆ نموونە ئەگەر موسڵمانێك لە خەو هەستا یان بە بایەك یان بە بۆنێك دەستنوێژەکەی بەتاڵبووەوە ئەنجا ویستی دەستنوێژ بگرێت ئەوا ڕاستەوخۆ دەستنوێژ دەگرێت بە بێ ئەوەی بچێتە سەر ئاو ئەگەر تەنگاو نەبێت چونکە تارالت گرتن مەرج نییە بۆ دەستنوێژگرتن .

بەڵام ئەگەر تەنگاو بوو ئەوا دەبێت بچێتە سەر ئاو پاشان دەستنوێژ بگرێت چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ صـلاَةَ بِحـضرة الطعـامِ ولاَ وهـو يدافعـه الأخبثَان))**[٤٦].

واتە : نابێت نوێژبکرێت بە ئامادەبوونی خواردن و لە کاتێکدا کەوا میز و پیسی پاڵی پێوەدەنێت و تەنگاوی کردووە .

---

[٤٦] صحيح البخاري رقم : () وصحيح مسلم رقم : (١٢٤٤) .

*** حوکمی کەسێك کە نوێژ ناکات و غوسل ناکات :**

**پ٣١ / من دوو مانگە شووم کردووە پیاوەکەم نوێژ ناکات و پاش جووتبوونیش غوسل دەرناکات :**

**ئایا حوکمی غوسل دەرنەکردنەکەی چیە ؟**

**وە داواتان لێدەکەم یارمەتیم بدەن چۆن وای لێبکەم نوێژ بکات ؟ هیچ گرفتێکمان نیە تەنها ئەوە نەبێت کە مێردەکەم نوێژ ناکات زۆریش پێی دەڵێم .**

**پرسیاری دووەم : ئەگەر لە پاش جووتبوون یەکسەر غوسل دەرنەکەی واتە دوای بخەی بە مەرجێ کارنەکاتە سەر نوێژەکانت ئایا گوناهە ؟**

وەڵام /

١ ـ بەڕاستی شووکردن بە کەسێك کەوا نە نوێژ بکات و نە غوسلی پاش جووت بوون بکات تاوان و هەڵەیەکی زۆر گەور و سامناکە ، چونکە ئەگەر ئەو مێردە باوەڕی بە فەرزێتی نوێژ کردن و غوسل دەرکردن نەبێت ئەوا کەسێکی کافر و بێباوەڕە و بە هیچ جۆرێك دروست نیە بۆ ئافرەتێکی موسڵمان شووی پێبکات و لەگەڵیدا بمێنێتەوە ، وە ئەگەر باوەڕی بە نوێژ کردن و غوسل کردن هەبێت بەڵام لە بەر کەم تەرخەمی و تەمبەڵی ئەنجامیان نەدات ئەوا ئەو کەسە کەسێکی فاسق و تاوانبار و لاڕێ بووە پێویستە لە سەری تەوبە بکات و بە زووترین کات پەشیمان ببێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە ، وە پێویستیشە لە سەر خێزانەکەی کەوا یەکەمجار نەسیحەت و ئامۆژگاری بکات و داوای لێبکات کەوا دوای جووت بوون خۆی بشوات و خۆی پاك بکاتەوە و ئەنجا نوێژەکان بە جوانی و بەردەوامی ئەنجام بدات ، جا ئەگەر نەگەڕایەوە ئەوا دەبێت بۆ ماوەیەك ئەو ئافرەتە خۆی بگرێتەوە لە جێبەجێکردنی ماف و حەقەکانی ئەو مێردە و خۆی نەدات بە دەستەوە بۆ جووت بوون لەگەڵیدا تاوەکو وەعد و پەیمانی نەداتێ کەوا تەوبە بکات و واز بێنێت لە تەمبەڵی و کەمترخەمی بەوەی کە لە پاش جووت بوون خۆی بشوات و ئەنجا نوێژەکانی ئەنجام بدات ، ئەگەر ئەمەش سوودی نەبوو ئەوا دەبێت ئەوا

ئافرەتە بگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی و نابێت لەگەڵ ئەو پیاوەدا بمێنێتەوە و دەبێت ماوەیەك مۆڵەتی بدات بۆ تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا ، جا ئەگەر پیاوەکە هەر بەردەوام بوو لەسەر خۆنەشۆردن و نوێژ نەکردن ئەوا نابێت ئەو ئافرەتە بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو پیاوە نوێژ نەکەرە ، چونکە بە ڕاستی ئەگەر پیاو دوای ئامۆژگاری و نەسیحەت .. ئەنجا دوای خۆگرتنەوەی خێزان لە جێبەجێکردنی مافەکانی و خۆنەدان بەدەستەوەی بۆ جووت بوون لەگەڵیدا .. ئەنجا دوای مۆڵەت پێدانی بۆ تەوبە کردن هەر سووربوو لەسەر خۆنەشۆردن و نوێژ نەکردن و ملنەدان بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە ئەوا بەڕاستی ئەو پیاوە پێدەچێت هەر باوەڕی بە خۆشۆردن و نوێژکردن نەبێت نەك لە بەر تەمبەڵی و کەمتەرخەمی ئەنجامیان نادات ئەگینا هەموو ئەو هەنگاوانەی خێزانەکەی دەبێت کاریگەری بکاتە سەری و دڵی ڕابچەڵەکێنێت و هۆش بکاتەوە و توبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە ..

ئەمەش لە بەر ئەوەیە کە نوێژ کردن یەکێکە لە کۆڵەکەکانی ئاین و نیشانەی جیاکردنەوەی مرۆڤی ئیمانداره لە مرۆڤی بێئیمان و کافر :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((العهد الذي بيننا وبينهم الصلاةُ فَمن تركَها فَقَد كَفَر))**[47].

واتە : بەڵێنی نێوان ئێمەی موسڵمان و بێباوەڕەکان بریتییە لە نوێژ جا هەرکەسی وازی لێبێنێت ئەوا کوفری کردووە .

جا ئەگەر پیاوێك پاش جووت بوونی لەگەڵ خێزانیدا خۆی نەشوات و نوێژەکانی ئەنجام نەدات ئایا ئەو پیاوە چ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ پیاوێکی کافر و بێباوەڕدا کە ئەویش خۆی ناشوات و نوێژ ناکات ؟! !

هەروەها خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی : ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ ﴿١١﴾﴾ [التوبة] .

---

[47] صحيح الجامع الصغ رقم : (٤١٤٣) .

واتە : جا ئەگەر تەوبە بکەن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن ئەوا ئەوانە براتان لە دین و ئایندا .

کەواتە ئەگەر تەوبە نەکات و نوێژ نەکات ئەوا بە برای دینی و موسڵمانی ڕاست و دروست حیساب ناکرێت بۆیە برادەرێتی و هاوەڵێتی و هاوسەرێتی و خێزانداریێتی لەگەڵ کەسی وادا ناکرێت ، بەڵکو دبێت دووری لێبگریت تاوەکو تەوبە دەکات و نوێژەکانی دەکات لە پاش خۆشۆردن .

جا لە بەر ئەمەیە لە کاتی مارەبڕیندا پرسیار لە هەردوو لا (کوڕ و کچ) دەکرێت ئایا نوێژ دەکەن یان نا ؟ چونکە ئەگەر یەکێکیان نوێژ نەکات ئەوا نابێت ئەو کچە مارە بکرێت لەو کوڕە تاوەکو تەوبە نەکات و نوێژەکانی ئەنجام نەدات .

وە ئەگەر کچەکە مارە کرا لە کوڕەکە بەو مەرجەی کەوا نوێژ دەکات یان بەو مەرجەی کەوا نوێژ بکات ئەگەر لە پێش مارەبڕینەکە نوێژی نەکردبێت ئەوا بەم مەرجە ئەو ئافرەتە حەڵاڵ دەبێت بۆ ئەو پیاوە .. ئەگینا ئەگەر پیاوەکە یان ئافرەتەکە نوێژی نەکرد ئەوا حەڵاڵ نی‌یە بۆیان پێکەوە جووت بن بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((أحـق الشروط أنْ توفُوا بِه ما استحلَلْتم بِه الفُروج))**[48].

واتە : حەقترین و شایستەترینی ئەو مەرجانەی کەوا وەفاداربن لە ئاستیدا ئەوەیە کە دامێنی ئافرەتێکی پێ حەڵاڵ دەبێت بۆتان .

جا گرنگترین و ئاشکراترینی مەرجەکانی مارە کردنی کچێکی موسڵمان لە کوڕێکی موسڵمان و حەڵاڵ بوونیان بۆ یەکتری ئەوەیە کە نوێژ بکەن ، بۆیە ئەگەر یەکێکیان نوێژی نەکرد چ پیاوەکە بێت یان ئافرەتەکە یاخود ئەگەر هەردووکیان نوێژیان نەکردن ئەوا حەڵاڵ نی‌یە بۆیان لەگەڵ یەکتردا جووت بن و کۆببنەوە ، چونکە مەرجی حەڵاڵ

---

[48] **صحيح البخاري رقم : (٢٧٢١) .**

بوونی دامێن و عەورەتی ئافرەتەكە بۆ ئەو پیاوە ـ كە نوێژ كردنە ـ مەوجود نی‌یە ! كەواتە حەڵاڵ نین بۆ یەكتری ، خواش زاناترە .

٢ ـ دوا خستنی خۆشۆردن (غوسل كردن) لە پاش لەشگران بوون (جووت بوون) حەرام نی‌یە بە مرجێك كاریگەری نەبێت بۆ سەر ئەنجامدانی نوێژەكان لە كاتی خۆیاندا ، جا ئەگەر كاتی نوێژێك لە نوێژە فەرزەكان هات و تۆش لەشتگران بوویت ئەوا دەبێت (فەرزە) خۆت بشۆیت بۆ ئەوەی بتوانیت نوێژەكەت لە كاتی خۆیدا ئەنجامبدەیت .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كە دوا خستنی (غوسل كردن) لە پاش (جووتبوون) حەرام نی‌یە ـ بە مەرجێك كاریگەری نەبێت بۆ سەر ئەنجامدانی نوێژەكان لە كاتی خۆیاندا ـ ئەوا باش نی‌یە دوا بخرێت بەڵكو باشتر وایە و سوننەتە موسڵمان زوو خۆی بشوات و غوسل بكات بۆ ئەوەی لەشی پاك بێت ، چونكە موسڵمان پێویستی بە زیكر كردنی خوای گەورە و خواردن و خواردنەوە و خەوتن هەیە ، ئەم كارەنەش باش نی‌یە (مەكروهە) بە

لەشگرانی‌یەوە ئەنجام بدرێن ..

بەڵگە بۆ ئەم وتانە :

١ ـ بەڵگەی ئەوەی كە دواخستنی (غوسل كردن) لە پاش (جووتبوون) حەرام نی‌یە :

**ـ عن عائشةَ زوج النبي (ﷺ) قالت : ((قد كانَ رسولُ الله (ﷺ) يدركُه الفَجـر فـي رمضانَ وهو جنب من غَير حلُمٍ فَيغتسِلُ ويصوم))[٤٩].**

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتی دەركەوتنی فەجری (كاتی نوێژ بەیانی)ی پێدەگەیشت لە ڕەمەزاندا هێشتا ئەو لەشگران بوو بە بێ خەوبینین (واتە لەشگران بوونەكەی بە هۆی خەو بینینەوە نەبووە بەڵكو بە هۆی چونە لای خێزانەوە بووە وەك لە فەرموودەی دووەمدا هاتووە) ئەنجا غوسلی دەكرد و ڕۆژووی دەگرت .

---

[٤٩] صحيح البخاري رقم : () وصحيح مسلم رقم : () واللفظ لـمسلم .

وە لە ریوایەتێکی تردا عائیشە خوای لیٚ ڕازی بێت فەرموویەتی : **((أن رسولَ اللــە (ﷺ) كَانَ يدركُه الْفَجر وهو جنب من أهله ، ثُم يغتسِلُ ويصوم))**[٥٠].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی دەرکەوتنی فەجری پێدەگەیشت هێشتا ئەو لەشگران بوو بە هۆی چونە لای خێزانیەوە ئەنجا غوسلی دەکرد و ڕۆژووی دەگرت .

**ـ وعن عائشةَ (رضي الله عنه) قَالَت : ((كَانَ رسولُ الله (ﷺ) ينام وهو جنب من غَير أنْ يمــس ماءً))**[٥١].

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەخەوت بە لەشگرانی‌یەوە بە بیٚ ئەوەی ئاو لێی بدات (واتە بە بیٚ دەست نوێژ و خۆشۆردن) .

لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان دەست دەکەوێت کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پاش چونە لای خێزانی غوسلی دوا خستووە تا کاتی نوێژ بەیانی هاتووە ئەنجا بۆ نوێژی بەیانی خۆی شوشتووە (غوسلی کردووە) .

٢ ـ بەڵام دوا خشتنی خۆشۆردن (غوسل کردن) لە پاش لەشگران بوون بۆ ماوەیەکی زۆر و بە بەردەوامی کارێکی نابەجیٚ و باش نی‌یە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((ثَلاثَةٌ لاَ تقْربهم الْملائكَةُ : الْجنب والــسكْرانُ والْمتضمخ بِالْخلُوق))**[٥٢].

واتە : سیٚکەس هەن فریشتەکان نزیکیان نابنەوە : لەشگران و سەرخۆش و ئەو کەسەی کە خۆی گرتووە لە بۆنی زەعفەران .

---

[٥٠] **صحيح البخاري رقم : () وصحيح مسلم رقم : () واللفظ للبخاري .**

[٥١] **صحيح أ داود رقم : (٢١٣٩) .**

[٥٢] **سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٨٠٤) .**

سوودێك : بۆ زانیاریت : شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت هەر لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی : **(الــخلوق طيب معروف مركب يتخذ من الزعفران وغ ه من أنواع الطيب وتغلب عليه ا مرة والصفرة ، وإنما نــهى عنه لأنه من طيب النساء)** [سلسلة الأحاديث : (٤ / ٤١٧)] .

واتە : خەلوق جۆرە بۆنێکی زانراوی و گیراوەیە لە زەعفەران و جگە لەویش لە جۆرەکانی تری بۆن دەگیرێتەوە و زیاتر ڕەنگی سووری و زەردی بە سەریا زاڵە ، وە لە بەر ئەوە قەدەغەی کردووە لە پیاوان چونکە بۆنێکی تایبەتە بە ئافرەتانەوە

شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت لە شەرحی ئـەم فەرموودەیـەدا فەرموویـەتی :

**(والـجنب معروف ، وهو الذي ب عليه الغسل بالـجماع و روج ا اء الدافق ، ولعـل ا راد به هنا الذي يترك الاغتسال من الـجنابة عادة فيكون أكثر أوقاته جنباً ، وهذا يدل على قلة دينه وخبث باطنه)**[٥٣].

واتە : لەشگران زانراوە بریتییە لەو کەسەی کە پێویستە (واجبە) لـە سـەری غوسـل بکات دوای جووت بوون و دەرچونی ئاو هەڵقوڵاو لێەوە ، وە لەوانەیە لەم فەرموودەیـەدا مەبەستی ئەو کەسە بێت کە واز دێنێت لە غوسل کردنی لەشگرانی وەك پیـشە و عـادەت و زۆربەی کاتەکانی لەشگرانە ، وە ئەمەش بەڵگەیە لە سەر کەم دیـنی و پێـسێتی نـاخی ئەو کەسە .

منیش دەڵێم : ئایا ئەگەر کەسێك زۆربەی کاتەکانی لەشگران بێـت و ئەمـەش بەڵگـە بێت لە سەر کەم دینی و پێسێتی ناخی ! ئەی ئایا ئەگەر کەسێك بەردەوام بە لەشگرانی بمێنێتەوە و غوسل دەرنەکات ئایا ئەم کەسە بێ دین و پیس نییە ؟ ! ! !

کەواتــە لــەم فەرموودەیەشــەوە ئــەوەمان دەســت دەکــەوێت کــەوا زۆر مانــەوە بــە لەشگرانی و دوا خستنی غوسل کردن بۆ ماوەیەکی زۆر و بەردەوام بە بـێ عـوزر بەڵگـەی کـەم دیـنی و پێـسێتی نـاخی مرۆڤـە بۆیـە فریـشتەکانیش لێـی نزیـك نابنـەوە و دووری لێدەگرن .

٣ ـ وە ئەگەر کەسێك لە کاتی لەشـگرانیدا (پـێش خۆشـۆردن) ویستی بخـەوێت یـان خواردن بخوات یـان دووبـارە بـچێتەوە لای خێزانـی بـۆ جـووت بـوون : ئـەوا سـوننەتە و باشترە لە پێشدا دەسـت نوێـژ بگرێـت (هەرچـەندە لەشیـشی گرانـە) ئـەنجا ئـەو کارانـە ئەنجام بدات بە بەڵگەی ئەم فەرموودانەی خوارەوە :

---

[٥٣] سلسلة الأحاديث الصحيحة : (٤ / ٤١٧) .

**ـ عن عائشةَ (رضي الله عنها) : ((أن رسولَ الله (ﷺ) كانَ إذَا أراد أنْ ينام وهو جنـب توضـأ وضوءَه للصلاة قبلَ أنْ ينام))[٥٤].**

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر بیویستایە بخەوێت لە کاتێکدا کە لەشگران بووایـە ئـەوا پێش ئەوەی کە بخەوێت دەستنوێژی دەگرت وەك چۆن دەستنوێژ بگرێت بۆ نوێژ .

**ـ وعن عائشةَ (رضي الله عنها) قالَت : ((كانَ رسولُ الله (ﷺ) إذَا أراد أنْ يأكُلَ وهو جنـب توضأ))[٥٥].**

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بیویستایە خواردنێك بخوات لە کاتێکدا کـە لـەش گران بووایە ئەوا دەستنوێژی دەگرت .

**ـ وعن عائشةَ (رضي الله عنها) قالَت : ((كانَ رسولُ الله (ﷺ) إذَا أراد أنْ يأكُلَ أو ينام وهـو جنب توضأ وضوءَه للصلاة))[٥٦].**

واتە : پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ئەگـەر بیویـستایە خواردنێـك بخـوات یـان بخـەوێت لـە کاتێکدا کە لەش گران بووایە ئەوا دەستنوێژی دەگرت وەك چـۆن دەسـتنوێژ بگرێـت بـۆ نوێژ .

**ـ وعن أبِي رافِعٍ (رضي الله عنه) : ((أن النبِي (ﷺ) طَاف علَى نِسائه في لَيلَة وكَانَ يغتسِلُ عنـد كُل واحدة منهن ، فَقيلَ لَه : يا رسولَ الله ألاَ تجعلُه غُسلاً واحداً ؟ فَقَالَ : هو أزكَى وأطْيب وأطْهر))[٥٧].**

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) شەوێك ڕۆیشتە لای هەموو خێزانەکانی و لای هەموو یـەکێکیان خۆیی دەشوشت ، پێـی وتـرا : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـەی بـۆ بـە یـەکجار یـەك غوسـل ناکەیت ؟ فەرمووی : ئەمە پاك ترە .

---

[٥٤] صحيح مسلم رقم : (٧٢٥) .

[٥٥] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٥٩١) .

[٥٦] صحيح سنن النسائي رقم : (٢٥٥) .

[٥٧] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٥٩٠) .

پ٣٢ / کەسێ نوێژنەکەر چی سزایەکی بۆ دانراوە لە ڕۆژی دوایدا ؟

وەڵام /

نوێژ کردن یەکێکە لە کۆڵەکەکانی ئاین :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((بني الإسلام على خمسٍ : شهادةُ أنْ لا إلـه إلا الله وأن محمدا رسولُ الله ، وإقام الصلاة ، وإيتاءُ الزكـاة ، وصـوم رمـضانَ ، وحـج البيت))**[٥٨].

واتە : ئیسلام لە سەر پێنج پایە بنیات نراوە : شایەتی دان بەوەی کە : هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا وە بەڕاستی (محمد ﷺ) پێغەمبەری خوایە ، وە کردنی نوێژ بە ڕێکوپێکی ، وە زەکات دان ، وە ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان ، وە حەجکردنی ماڵی خوا .

وە نوێژ کردن نیشانەی جیاکردنەوەی مرۆڤی ئیمانداره لە مرۆڤی بێئیمان و کافر :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((العهد الذي بيننا وبينهم الصلاةُ فمن تركَها فقد كفَر))**[٥٩].

واتە : بەڵێنی نێوان ئێمەی موسڵمان و بێباوەڕەکان بریتییە لە نوێژ جا هەرکەسی وازی لێبێنێت ئەوا کوفری کردووە .

وە نوێژکردن یەکێکە لە مەرجەکانی برایەتی ئاینی :

خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی : ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ ﴿١١﴾﴾ **[التوبة]** .

واتە : جا ئەگەر تەوبە بکەن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن ئەوا ئەوانە براتان لە دین و ئایندا .

---

[٥٨] صحيح البخاري رقم : () وصحيح مسلم رقم : () وصحيح سنن الترمذي رقم : () واللفظ له .

[٥٩] صحيح الـجامع الصغ رقم : (٤١٤٣) .

لە بەر هەموو ئەمانە و چەندین بەڵگەی تریش نوێـژ نـەکردن تـاوانێکی زۆر گـەورە و ترسانە و سزاکەشی زۆر سەخت و ناڕەحەتە :

*** سزای کەسانی کەمتەرخەم لە نوێژەکانیاندا :**

خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویـەتی : ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ٥﴾ **[الماعون]** .

واتــە : فــەوتان و نــەمان و تیاچــوون (یـان دۆڵێـك لـە دۆڵـەكانی دۆزەخ) بـۆ ئـەو نوێژگەرانەی کەوا لە نوێژەکانیاندا کەمتەرخەمن .

ئـەگــەر ئـەمــە ســزای نـوێـژگـەرانێــك بێـت کـەوا کەمـتـەرخــەمی دەکــەن لــە نوێژەکانیاندا ! ئایا دەبێت سزای ئەو کەسانە چۆن بێت کەوا هەر نوێژ ناکەن ؟!

*** سزای کەسانی نوێژنەکەر :**

خوای گەورە لە قورئاندا باسی دۆزەخیەکان دەکات کەوا کاتێك بەهـەشـتیـیەکان پرسیاریان لێیان کرد : ﴿مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ٤٢﴾ .

واتە : چی ئێوەی هێناوەتە ناو سەقەرەوە (ناوێکە لە ناوەکانی جەهەننەم) ؟

ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن : ﴿قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ٤٣﴾ **[المدثر]** .

واتە : ئێمە لەو کەسانە نەبووین کەوا نوێژیان دەکرد ..

## نوێژ فەوتاندن :

**پ ٣٣ / مـن تەمـەنم ٤٤ ساڵە ، وە لـە تەمـەنی ٢٦ ساڵیـەوە دەستم بـە نوێـژ کردن کردووە ، ئایا ئەو نوێژانە پێش ئەو تەمەنە فەوتاوە ئەبێ بیگێڕمەوە یان نا ؟**

**ـ ئەگەر لە تەمەنێکی درەنگدا دەست بکەیت بە نوێژ کردن ئایا نوێژەکانی پێش ئەو تەمەنە ئەبێ بگێڕێتەوە ؟ ئەگەر نا ئایا بەر لێخۆشبوون ئەکەوێت یان چی ؟**

وەڵام /

هۆکاری نوێژ فەوتاندن دەبێتە دوو بەشەوە :

١ ـ یان ئەوەیە باوەڕی بە ئیسلام نەبووە بۆیە نوێژی نەکردووە .

٢ ـ یان ئەوەیە کە بە هۆی تەمبەڵی و خەمساردی و کەمتەرخەمیەوە نوێژی نەکردووە .

ـ جا ئەگەر هۆکاری نوێژ نەکردنەکە باوەڕ نەبوون بێت بە ئیسلام یان بە فەرزێتی نوێژ ، ئەوا قەزا کردنەوەی ئەو نوێژە فەوتاوانەی لە سەر نىیە چونکە پاش موسڵمان بوون نوێژ کردن فەرز دەبێت لە سەری .

ـ وە ئەگەر هۆکاری نوێژ نەکردنەکە تەمبەڵی و خەمساردی و کەمتەرخەمی بێت ئەوا قەرزاری ئەو نوێژە فەوتاوانەیە بەڵام ئایا چی بکات بۆ ئەوەی ئەو تاوانە لە سەر خۆی لابات ؟

لە وەڵامدا دەڵێم :

یەکەم : قەزاکردنەوەی نوێژی فەوتاو بە هۆی تەمبەڵی و خەمساردی و کەمتەرخەمییەوە نىیە لە ئیسلامدا چونکە هیچ بەڵگەیەك لەم بارەیەوە نەهاتووە لە قورئان و سوننەتدا .

دووەم : بەڵام پێویستە لە سەر ئەو کەسە کە بۆ ماوەیەك نوێژی فەوتاوە کەوا نوێژی سوننەت زۆر بکات بۆ ئەوەی ئەو نوێژە سوننەتانە جێی نوێژە فەرزە فەوتاوەکان بگرنەوە .

بەڵگەش بۆ ئەمە بریتىیە لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) :

**عن أبي هريرةَ (رضي الله عنه) قَالَ : سمعت رسولَ الله (ﷺ) يقُولُ : ((إن أولَ ما يحاسب بِه الْعبد يوم الْقيامة من عمله صلاته فَإنْ صلُحت فَقَد أفْلَح وأنجح ، وإنْ فَسدت فَقَد خاب وخسِر ، فَإن انتقَص من فَريضته شيءٌ قَالَ الرب عز وجل : انظُروا هلْ لعبدي من تطَوعٍ ؟ فَيكَملَ بِها ما انـتقَص مـن الْفَريضة ، ثُم يكُونُ سائر عمله علَى ذَلك))[٦٠].**

---

[٦٠] صحيح سنن الترمذي رقم : (٤١٣) .

واتە : یەکەم شت کەوا لێپرسینەوەی عەبدی لە سەر بکرێت لە قیامەتدا لە کردەوەکانیدا بریتی‌یە لە نوێژەکانی، جا ئەگەر بەچاکی و ڕێکی ئەنجامیانی دابێت ئەوا سەرفیراز و سەرکەتوو دەبێت، وە ئەگەر خراپ بێت و کەموکوڕی تێدا بێت ئەوا بێ‌ئومێد و خەسارۆمەند دەبێت، وە ئەگەر هەندێك نەقوسانی لە فەرزەکانیدا هەبێت (واتە : بە کاملّی هەمووی ئەنجامنەدابێت) ئەوا خوای گەورە دەفەرموێت : بڕوانن بزانن ئایا عەبدەکەم نوێژی سوننەتی هەیە ؟ بەو سوننەتانە نەقوسانی‌یەکانی نوێژە فەرزەکانی بۆ تەواو و کاملّ دەکرێت، ئەنجا هەموو کردارەکانی بەم شێوەیە لێدەکرێت .

وە **(شیخ الإسلام ابن تیمیة)** لەم بارەیەوە فەرموویەتی : **(تارك الصلاة عمداً لا یشرع له قضاؤها ولا تصح منه ، بل یکثر من التطوع)**[٦١].

واتە : ئەو کەسەی کەوا بە ئەنقەست **(عمداً)** واز لە نوێژ دەهێنێت دروست نی‌یە بۆی بە قەزا بیانکاتەوە و لێشی وەرناگیرێت، بەڵکو دەبێت نوێژی سوننەت زۆر بکات .

هەروەها (ابن حزم)یش فەرموویەتی : **(وأما من تعمد ترك الصلاة حتى خرج وقْتهـا فَهذَا لا یقْدر علَى قَضائها أَبداً ، فَلْیکْثر من فعلِ الْخیر وصلاة التطَوعِ لیثْقلَ میزانه یوم الْقیامة ، ولْیتب ولْیستغفر الله عز وجل)**[٦٢].

واتە : ئەو کەسەی کەوا بە ئەنقەست **(عمداً)** واز لە نوێژ دەهێنێت تاوەکو کاتەکەی بەسەر دەچێت، ئەوا ئەمە هەرگێز ناتوانێت بە قەزا بیکاتەوە بە هەتاهەتایی، بەڵکە با کرداری چاکە و نوێژی سوننەت زۆر ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی تەرازووی چاکاکانی قورس بێت لە ڕۆژی قیامەتدا، وە با تەوبە بکات و داوای لێبوردن و لێخۆشبوون لە خوا بکات .

بۆ زانیاری زیاتر لەم بوارەدا ئەوا بابەتی : (ئایا نوێژی (فەرز) ئەگەر فەوتا قەزا دەکرێتەوە ؟) لە گۆڤاری ڕێگای ڕاستدا بخوێنەرەوە / ژمارە (٨) لاپەڕە : (٤١ ـ ٥٦) .

---

[٦١] الفتاوى الكـ ى : (٥ / ٣١٩) .

[٦٢] الـمحلـى بالآثـار : (١ / ٨٥٩) .

**پ٣٤ / من ماوەی چوار مانگە دورم لە نوێژ کردن ئێستا دوای ئەنجام دانی چەند کارێکی دوور لە ئیسلام ئەمەوێت نوێژ بکەم ، ئایا چی بکەم بۆ ئەوەی زیاتر بەردەوام بم ؟**

وەڵام /

پێویستە ئەم کارانە بکەیت :

یەکەم : تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوە لە هەموو ئەو چەند کارە دوور لە ئیسلامە کە ئەنجامت داون بە تایبەت لە نوێژ نەکردنت ، تەوبەش بەم شێوەیە دەبێت :

أ / پەشیمان بوونەوە لە تاوانەکانت .

ب / وازهێنان لە تاوانەکان .

ج / بڕیار دان بۆ ئەنجامنەدانیان لە داهاتوودا .

دووەم : دەست دەکەیتەوە بە ئەنجام دانی نوێژەکانت لە کاتی خۆیاندا و بە جەماعەت لە مزگەوتدا .

سێیەم : دەستکردن بە چاکەکاری و نزیك بوونەوە و تێکەڵاوی کردنی چاکەکاران و دوور کەوتنەوە لە خراپەکاری و خراپەکاران :

چونکە لە ئایەتەکانی **(سورة الفرقان)**دا خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿... إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا ... ﴿٧٠﴾﴾ **[الفرقان] .**

واتە : ئیللا کەسێك نەبێت کەوا تەوبە دەکات و ئیمان و باوەڕ دەهێنێت و کردەوەی چاکە دەکات .

**وعن أبِي طَوِيلٍ شطَبٍ الْممدود أنه أتى رسولَ الله (ﷺ) فَقَالَ : ((أرأيت رجـلا عمـلَ الذنوب كُلها ، فَلَم يترك منها شيئاً ، وهو في ذَلك لَم يترك حاجةً ولا داجةً إلا أتاها ، فَهلْ لَه من توبة ؟ قَالَ : فَهلْ أسلَمت ؟ قَالَ : أما أنا فَأشهد أنْ لا إلَه إلا الله وحده لا شريك لَـه ، وأنك رسولُ الله ، قَالَ : نعم ، تفْعلُ الْخيرات وتترك السيئَات ، فَيجعلُهن الله لَك خيـرات**

**كُلهن ، قَالَ : وغَدراتي وفَجراتي ؟ قَالَ : نعم ، قَالَ : الله أكْبر ، فَمـا زالَ يكَبـر حتـى تواری))[٦٣].**

واتە : (**أبـي طويل**) هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی : هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە كەسێك كەوا هەموو تاوانـەكانی كردبێـت و هـچیانی بەجێنەهێـشتبێت وە ئـەو كەسـە لـە تاونكاریدا هیچی بەجێنەهێشتبێت ئیللا كردبێتی ، ئایا ئەو كەسە بۆی هەیە تەوبە بكات ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئایا تۆ موسڵمان بوویت ؟

وتی : من شایەتی دەدەم كەوا هیچ پەرستراوێك نی‌یە شایستەی پەرستن بێت ئـیللا خوا نەبێت و تۆش پێغەمبەری خوایت .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەگەر كاری خێر و چاكە بكەیت و وازبێنیت لە خراپە و تاوانەكان ئەوا خوا هەموویت بۆ دەكات بە چاكە .

وتی : ئەی غەدر و خیانەت و تاوانكاری‌یەكانمیش ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەڵێ .

وتی : خوا چەند گەورەیە (ا **أك** ) .

لە بەر ئەمە ئەو كابرایە بەردەوام دەیوت : خوا چەند گەورەیە (ا **أك** ) تاوەكو لـە پێش چاو وون بوو .

هەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی : **((اتقِ الله حيثُما كُنت ، وأتبِع السيئةَ الْحسنةَ تمحها ، وخالقِ الناس بِخلُقٍ حسنٍ))[٦٤].**

واتە : لە خوا بترسە و خۆپارێزی بكە لە تاوان لە هـەر كوێـك هـەبیت ، وە بـە دوای تاون و خراپەدا خێر و چاكەیەك بكە بۆ ئەوەی بیسڕێتەوە ، وە هەڵسوكەوت بكە لەگەڵ خەڵدا بە ڕەوشتی چاك و جوان .

---

[٦٣] **الـمعجم الكب للط انـي رقم : (٧٠٨٥) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (٣١٦٤) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقـم : (٣٣٩١) .**

[٦٤] **صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٥٥) .**

وە ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکەم کە بەم تاوانە و جگە لەمەش گرفتار بوون کەوا ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی ڕزگاریان ببێت لە تاوانەکانیان :

چوارەم : وازهێنان و دوور کەوتنەوە و بە جێهێشتنی هاوەڵ و برادەری خراپ و تاوانبار و دوور لە خوا ، وە بە پێچەوانەشەوە نزیك بوونەوە و تێکەڵاوی کردنی هاوەڵ و برادەری خوا ناس و چاکەکار ، چونکە هاوەڵ و برادەر کاریگەریان هەیە بۆ دوور کەوتنەوە لە تاوان بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((إنما مَثَلُ الْجليس الصالح والْجليس السوءِ : كَحامل الْمسك ونافخ الْكِيرِ ، فَحاملُ الْمسك إما أنْ يحذيك ، وإما أنْ تبتاع منه ، وإما أنْ تجِد منه ريحاً طَيبةً ، ونافخ الْكِيرِ إما أنْ يحرق ثيابك ، وإما أنْ تجِد ريحاً خبِيثَةً))**[٦٥].

واتە : نموونەی هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ : وەکو هەڵگری بۆنی میسك (واتە بۆن فرۆش) و فۆکار بە کوورەدا (واتە ئاسنگەر) وایە ، جا هەڵگری بۆنی میسك یان لەو بۆنەت پێدەبەخشێت یان لێی دەکڕیت یان بۆنی خۆشی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت ، بەڵام فۆکار بە کوورەدا یان جلەکانت دەسوتێنێت یان بۆنی پیسی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ تصاحب إلا مؤمناً ، ولاَ يأكُلْ طَعامك إلا تقي))**[٦٦].

واتە : هاوەڵێتی ئیماندار نەبێت نەیکەیت ، وە با کەس خواردنت نەخوات ئیللا کەسێکی لە خوا ترس و خۆپارێز لە تاوان نەبێت .

پێنجەم : دوور کەوتنەوە و بە جێهێشتنی ئەو شوێن و جێگایەی کەوا تاوانی تێدا دەست دەکەوێت ، بە بەڵگەی فەرموودەی ئەو کەسەی کەوا سەد کەسی کوشت و پاشان تەوبەی کرد : پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : **((اخرج من الْقَرية الْخبِيثَة التي أنت**

---

[٦٥] **صحيح البخاري رقم : (٢١٠١) و (٥٥٣٤) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٢٨) من حديث أبي موسى ، واللفظ المذكور لمسلم .**

[٦٦] **صحيح أبي داود رقم : (٤٨٣٢) .**

**فيها إِلى الْقَرية الصالحة قَرية كَذَا وكَذَا [فَإِن بِها أناساً يعبدونَ الله] فَاعبد ربك [معهْم] فيها ، [ولاَ ترجِع إِلَى أَرضك فَإِنها أَرض سوءٍ]))(٦٧).**

واتە : دەرچوو لەو گوندە پیسەی کە تۆ تێیدا دەژیت و بڕۆ بۆ ئەو گوندە چاکەی کەوا خەڵکانێکی تێدایە خوا دەپەرستن و تۆش لەگەڵ ئەواندا خوای پەروەردگارت بپەرستە تێیدا ، وە نەگەڕێیتەوە بۆ زەویەکەی خۆت چونکە خەڵکەکەی خراپە .

شەشەم : دەبێت نوێژی سوننەت زۆر بکەیت بۆ ئەوەی جێگای نوێژە فەرزە فەوتاوەکانت بۆ پڕبکاتەوە ، بەڵگەش بۆ ئەمە بریتی‌یە لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) :

**عن أَبِي هريرةَ (رضي الله عنه) قَالَ : سمعت رسولَ الله (ﷺ) يقُولُ : ((إِن أَولَ ما يحاسب بِه الْعبد يوم الْقيامة من عمله صلاَته فَإِنْ صلُحت فَقَد أَفْلَح وأَنجح ، وإِنْ فَسدت فَقَد خاب وخسِر ، فَإِن انتقَص من فَرِيضته شيءٌ قَالَ الرب عز وجل : انظُروا هلْ لعبدي من تطَوعٍ ؟ فَيكَملَ بِها ما انتقَص من الْفَرِيضة ، ثُم يكُونُ سائر عمله علَى ذَلك))(٦٨).**

واتە : یەکەم شت کەوا لێپرسینەوەی عەبدی لەسەر بکرێت لە قیامەتدا لە کردەوەکانیدا بریتی‌یە لە نوێژەکانی، جا ئەگەر بەچاکی و ڕێکی ئەنجامیانی دابێت ئەوا سەرفیراز و سەرکەتوو دەبێت، وە ئەگەر خراپ بێت و کەموکوڕی تێدا بێت ئەوا بێ‌ئومێد و خەسارۆمەند دەبێت، وە ئەگەر هەندێك نەقوسانی لە فەرزەکانیدا هەبێت (واتە : بە کاملّی هەمووی ئەنجامنەدابێت) ئەوا خوای گەورە دەفەرموێت : بڕوانن بزانن ئایا عەبدەکەم نوێژی سوننەتی هەیە ؟ بەو سوننەتانە نەقوسانی‌یەکانی نوێژە فەرزەکانی بۆ تەواو و کاملّ دەکرێت، ئەنجا هەموو کردارەکانی بەم شێوەیە لێدەکرێت .

وە **(شيخ الإسلام ابن تيمية)** لەم بارەیەوە فەرموویەتی : **(تارك الصلاة عمداً لا يشرع له قضاؤها ولا تصح منه، بل يكثر من التطوع)(٦٩).**

---

(٦٧) سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٤٠) .

(٦٨) صحيح سنن الترمذي رقم : (٤١٣) .

(٦٩) الفتاوى الكبرى : (٥ / ٣١٩) .

واتە : ئەو کەسەی کەوا بە ئەنقەست (**عمداً**) واز لە نوێژ دەهێنێت دروست نی‌یە بۆی بە قەزا بیانکاتەوە و لێشی وەرناگیرێت، بەڵکو دەبێت نوێژی سوننەت زۆر بکات .

هەروەها **(ابن حزم)**یش فەرموویەتی : **(وأما من تعمد ترك الصلاة حتى خرج وقتها فهذا لا يقدر على قضائها أبداً ، فليكثر من فعل الخير وصلاة التطوع ليثقلَ ميزانه يـوم القيامـة ، وليتب وليستغفر الله عز وجل)**[٧٠].

واتە : ئەو کەسەی کەوا بە ئەنقەست (**عمداً**) واز لە نوێژ دەهێنێت تاوەکو کاتەکەی بەسەر دەچێت، ئەوا ئەمە هەرگێز ناتوانێت بە قەزا بیکاتەوە بـە هەتاهـەتایی، بەڵکـە بـا کرداری چاکە و نوێژی سوننەت زۆر ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی تەرازووی چـاکاکانی قـورس بێت لە ڕۆژی قیامەتدا ، وە با تەوبە بکات و داوای لێبوردن و لێخۆشبوون لە خوا بکات .

**پ٣٥ / ئایا ئەگەر کەسێ نوێژ قەرزار بێ ئەتوانێ نوێژی سوننەت بکات ؟ چونکە چەند بۆچوونێک هەیە ئەڵێ تا نوێژی فەرزت لابێ بۆت نی‌یە نوێژی سوننەت بکـەیت ، هیوادارم وەڵامم بدەنەوە .**

وەڵام /

بەڵێ دەتوانێت نوێژی سوننەت بکات بەڵکو دەبێت نوێـژی سـوننەت زۆر بکـات بـۆی ئەوەی جێی نوێژە فەرزە فەوتاوەکانی بۆ بگرێتەوە .

وە کە دەڵێین : (تا فەرز وەستاوە سوننەت بەتاڵە) ئەوا مەبەست ئەوەیە لە کاتێکدا کە قامەت دەکرێت بۆ نوێژی فەرز نابێت خۆت مەشغوڵ بکەیت بە سوننەتەوە بۆ ئەوەی لە فەرزەکە دوانەکەویت لە بەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویـەتی : **((إذَا أقيمت الصلاةُ فَلا صلاةَ إلا الْمكْتوبةُ))**[٧١].

واتە : ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ ئەوا هیچ نوێژێك دروست نی‌یە ئیللا نوێـژە فەرزەکـە نەبێت .

---

[٧٠] المحلى بالآثار : (١ / ٨٥٩) .

[٧١] صحيح البخاري رقم : () وصحيح مسلم رقم : () .

بەڵام خەڵکی لەم وتەیە (تا فەرز وەستاوە سوننەت بەتاڵە) بە هەڵە تێگەیشتوون یان بە هەڵە تێگەینراون .

بۆ زانیاری زیاتر فەتواکانی پێشوتر بخوێنەرەوە .

*** حوکمی نوێژی جومعە** :

**پ٣٦ / ئایا نوێژی جومعە فەرزە ؟ زەحمەت نەبێ بە بەڵگەوە وەڵاممان بدەنەوە**

.

وەڵام /

نوێژی جومعە فەرزە لە سەر هەموو موسڵمانێك ئیللا ئەم پێنج کەسە نەبێت :

١ ـ ئافرەت . ٢ ـ منداڵ . ٣ ـ موسافیر . نەخۆش . ٥ ـ کۆیلە .

چونکە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە ئامادەبوونی نوێژی جومعە و فەرموویەتی :

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩﴾ **[الـجمعة] .**

واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر بانگکرا بۆ نوێژ لە ڕۆژی جومعەدا ئەوا بڕۆن بۆ ئامادەبوونی زیکری خوا (واتە : نوێژی جومعە) و وازبێنن لە کڕین و فرۆشتن ئەوە چاك ترە بۆتان ئەگەر بزانن .

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((الْجمعةُ حق واجِب علَى كُل مسلمٍ في جماعـةٍ إلا أَربعةً : عبد مملُوك ، أَو امرأَةٌ ، أَو صبِي ، أَو مرِيض))**[72] .

واتە : نوێژی جومعە حەق و واجبە لە سەر هەموو موسڵمانێك بە جەماعەت تەنها ئەم چوارە نەبێت : کۆیلەیەك خاوەنی هەبێت یان ئافرەت یان منداڵ یان نەخۆش .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لَيس علَى الْمسافر جمعةٌ))**[73] .

---

[72] صحيح أ داود رقم : (٩٤٢) .

[73] رواه الدارقط : (٤ / ٤ / ٢) .

واتە : نوێژی جومعە لە سەر موسافیر نییە .

**پ٣٧ / ئایا نوێژی نیوەڕۆ دەکرێتەوە لە دوای جمعە ؟ بە بەڵگەی تەواوەوە وەڵامان بدەنەوە .**

وەڵام /

نەخێر ناکرێتەوە ، ئەگەر موسڵمانێك بە جەماعەت نوێژی جومعەی ئەنجام دا ئەوا نوێژی نیوەڕۆی لە سەر دەکەوێت ، بەڵام ئەوانەی کە دوای تەوتاو بوونی جومعە نوێژی نیوەڕۆ دەکەنەوە ئەوا لە بەر دوو هۆکارە :

أ / ئەوانە دەڵێن یان وا تێگەیەنراون کەوا ئەگەر ئەو موسڵمانانەی کە نوێژی جومعە ئەنجام دەدەن ژمارەیان لە (١٢) کەس وە هەندێکیش دەڵێن لە (٤٠) کەس کەمتر بن ئەوا بە ئەنجامدانی جومعە نیوەڕۆیان لە سەر ناکەوێت چونکە بە لای ئەوانەوە گەیشتن بەو ژمارەیە مەرجە بۆ دروستێتی جومعەکە ، بەڵام ئەمە ڕاست نییە چونکە بەڵگەی صەحیح و صەریحی لە سەر نەهاتووە و هەموو ئەو فەرموودانەی کە کراون بە بەڵگە یان (صەریح) نین وە یان لاواز و (ضعیف)ـن[٧٤].

ب / وە هەندێکی تر هەن دەڵێن : لە شارێکدا تەنها نوێژی جومعەی مزگەوتی گەورەی ئەو شارە ڕاستە و تەواوە و نوێژی جومعەی باقی تری مزگەوتەکانی ئەو شارە تەواو نییە و دەبێت نیوەڕۆ بکەنەوە ، هەروەها ئەمەش بۆچوونێکی هەڵەیە و هیچ بەڵگەیەك نییە پشتڕاستی بکاتەوە .

کەواتە دوبارەکردنەوەی نیوەڕۆ لە دوای جومعە بیدعەیە ، چونکە کارێکی بێ بنەوا و بێ بەڵگەیە و کەس لە سەلەفیش ئەم کارەی نەکردووە[٧٥] .

---

[٧٤] بڕوانە : **"سبل السلام" : (٣ / ١٣٠) و "نيل الأوطار" : (٦ / ٢٤٨ ـ ٢٥٨) .**

[٧٥] بڕوانە کتێبی : **الأجوبة النافعة للإمام المحدث الألباني ص : () .**

**پ٣٨ / ئەو سەعاتەی کەوا لە ڕۆژی جومعەدا کڕین و فرۆشتن تێیدا حەرامە دەکەوێتە چ کاتێکەوە ؟**

وەڵام /

حەرامێتی کڕین و فرۆشتن لە ڕۆژی جومعەدا لە کاتی بیستنی بانگی جومعەوە (واتە بانگی دووەم) دەست پێدەکات تاوەکو نوێژی جومعە تەواو دەبێت ، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە :

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩﴾﴾ **[ا معة] .**

واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانتان هێناوە ئەگەر بانگدرا بۆ نوێژ لە ڕۆژی جومعەدا ئەوا بڕۆن بە دەم زیکری خواوە و ئامادەی جومعە ببن و وازبێنن لە کڕین و فرۆشتن ئەوە خێر تر و چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن ، وە ئەگەر نوێژ تەواو بوو ئەوا بڵاوە بکەن بە سەر زەویدا و بە دوای فەزڵی (واتە ریزقی) خوادا بگەڕێن و زیکری خوا زۆر بکەن بۆ ئەوەی ڕزگارتان بێت و بەختەوەر ببن .

**پ٣٩ / ئایا کات و ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژ بە پێی ئایەت یان فەرموودە دیاری کراوە ؟**

وەڵام /

کات و ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژ بە پێی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاری کراوە بە پێی چەندین فەرموودە ، بە تایبەت ئەم فەرموودەیە :

**عن جابِرِ بنِ عبد الله (رضي الله عنه) أن النبي (ﷺ) جاءَه جِبريلُ فَقَالَ : قُم فَصله فَصلى الظهر حـ زالَت الشمس ، ثُم جاءَه العصر فَقَالَ : قُم فَصله فَصلى العصر حـ صار ظل كُل شيءٍ مثْلَه ، ثُم جاءَه الْمغرب فَقَالَ : قُم فَصله فَصلى الْمغرب حـ وجبت الشمس ، ثُم جاءَه الْعشاءَ فَقَالَ : قُم فَصله فَصلى الْعشاءَ حـ غَاب الشفَق ، ثُم جاءَه الْفَجر فَقَالَ : قُم فَصله فَصلى الْفَجـر حـ برق الْفَجر ـ أَو قَالَ حـ سطَع الْفَجر ـ ، ثُم جاءَه من الْغد للظهر فَقَالَ : قُم فَـصله**

**فَصلى الظهر حـ صار ظل كُل شيءٍ مثْله ، ثُم جاءَه للعصر فَقَالَ : قُم فَصله فَصلى الْعـصر حـ صار ظل كُل شيءٍ مثْليه ، ثُم جاءَه للْمغربِ فَصلى الْمغرب وقْتاً واحداً لَم يزلْ عنه ، ثُم جاءَه للْعشاءِ حـ ذَهب نِصف الليلِ ـ أَو قَالَ ثُلُثُ الليلِ ـ فَصلى الْعشاءَ ، ثُم جاءَه للْفَجرِ حـ أَسفَر جِداً فَقَالَ : قُم فَصله فَصلى الْفَجر ، ثُم قَالَ ما بين هذَينِ وقْت))[٧٦].**

وە سەبارەت بە ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژیش بە هەمان شێوە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاری کراوە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی بە کردەوە کردوویەتی پاشان بە هاوەڵانی فەرمووە : **((صلوا كما رأيتموني أُصلي))[٧٧].**

واتە : نوێژ بکەن وەکو چۆن دەبینن من نوێژ دەکەم .

*** قەصر و جەمع :**

**پ٤٠ / ئایا نوێژی قەصر و جەمع چۆن دەکرێت ؟ تکایە بە جوانی بۆمان ڕوون بکەنەوە .**

وەڵام /

**(قصر)** واتە : (کورت کردنەوەی نوێژە چوار رکعاتی‌یەکان بۆ دوو رکعات) .

**(جمع)** واتە : (کۆکردنەوەی نوێژ ، بەوەی نوێژی نیوەڕۆ لەگەڵ نوێژی عەسرا کۆبکەیتەوە جا چ لە کاتی نیوەڕۆدا بێت واتە لە پاش نوێژی نیوەڕۆ ڕاستەخۆ نوێژی عەسریش بکەیت ، یان لە کاتی عەسردا بێت واتە لە پێش نوێژی عەسردا نوێژی نیوەڕۆ بکەیت ئەنجا ڕاستەخۆ نوێژی عەسریش بکەیت ، بە هەمان شێوە نوێژی مەغریب و عیشاش) .

کورت کردنەوەی نوێژە چوار رکعاتی‌یەکان بۆ دوو رکعات تەنها لە کاتی سەفەردا دەبێت :

---

[٧٦] **حديث صحيح مسند الإمام أ د رقم : (١٤٩١٢) وصححه الألبانـي إرواء الغليل رقم : (٢٥٠) .**

[٧٧] **صحيح البخاري رقم : (٦٣١) .**

ئەمەش بە مەرجێك دەبێت کە موسڵمان لە سنوری شار یان شارۆچکە یان گوندی نیشتەجێبوونی دەر بچێتە دەرەوە ، بە بێ دیاری کردنی ماوە یان ئەندازەی دوور کەوتنەوەی لەو جێگایە ، چونکە ئەمە لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) نەهاتووە .

کەواتە ئەوانەی دەڵێن : کورت کردنەوەی نوێژ بە مەرجێك دروستە کە ئەندازەی (٧٠) یان (٧٣) یان (٨٠) کیلومتر یان ماوەی شەو و ڕۆژێك یان .. یان ... دوور کەویتەوە لە جێگای نیشتەجێبووت ! ئەم وتانە هیچ بەڵگەیەکی ڕوونیان لە سەر نەهاتووە .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ ... ﴿١٠١﴾ ﴾ [النساء] .

واتە : ئەگەر دەرچوون بە سەر زەویدا بۆ سەفەر ئەوا هیچ تان لە سەر نىيە کەوا هەندێك لە نوێژەکان ـ واتە : نێوەڕۆ و عەسر و عیشا ـ کورت بکەنەوە .

(**عبد ا** )ی کوڕی ئیمامی (**عمر**) فەرموویەتی : **(لو خرجت میلا قصرت الصلاة)**[٧٨].

واتە : ئەگەر یەك میل (١٦٠٣ متر) دەربچمە دەرەوە ئەوا نوێژ کورت دەکەمەوە .

**ابن القیم** فەرموویەتی : **(ولم یحد** (ﷺ) **لأمته مسافةً محدودةً للقصر والفطر ، بل أطلق لهم ذلك في مطلق السفر والضرب في الأرض ... وأما ما یروی عنه من التحدید بـ الیوم أو الیومین أو الثلاثة فلم یصح عنه منها شيءٌ ...)**[٧٩].

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) ئەندازەیەکی دیاری نەکردووە بۆ ئوممەتەکەی بۆ کورت کردنەوەی نوێژ و ڕۆژوو نەگرتن ، بەڵکو ئەمەی بۆیان بە ڕەهایی هێشتووەتەوە بۆ هەر سەفەرێك بێت و بۆ هەر دەرچوونێك بێت بە سەر زەویدا ...

---

[٧٨] انظر "الـمحلی بالآثار" لابن حزم : (٥ / ١٩ ـ ٢٠) وفتح الباري : () وأضواء البیان للشنقیطي : (١ / ٣٧٠) وفقه الـسنة : (١ / ٢٨٤) .

[٧٩] زاد الـمعاد من هدي خ العباد : (١ / ١٨٩) .

**وقال الصنعانـي : (وجواز القصر والجمع في طويل السفر وقصيره مذهب كثير مـن السلف)[80].**

واته : دروستێتی كورت كردنەوەی نوێژ و كۆكردنەوەی بۆ سەفەری درێژ و كورتیش بۆچوونی زۆرینەی سەلەفە .

**وقال ابن حزم : (ومن خرج عن بيوت مدينته أو قريته أو موضع سكناه فمشى ميلاً فصاعداً صلى ركعتين ولا بد إذا بلغ الميل فإن مشى أقل من ميل صلى أربعاً)[81].**

واتــە : هــەر كەسـێك لــە ماڵــەكانی شــارەكەی یــان گوندەكــەی یــان جێگــای بیشتەجێبوونی دەرچووە دەرەوە و ئەنجا بە ئەندازەی یەك میل (١٦٠٣ متر) یـان زیـاتر ڕێی كرد و ڕۆیشت ئەوا دوو ركعات نوێژ دەكات ، وە پێویستە بگاتە ئەندازەی یەك میل ، وە ئەگەر كەمتر لە یەك میل ڕێی كرد و ڕۆیشت ئەوا چوار ركعات دەكات .

**وقال الشنقيطي : (يبتدىء الـمسافر القصر إذا جاوز بيوت بلده ، بأن خرج من البلـد كله ، ولا يقصر في بيته إذا نوى السفر ولا في وسط البلد)[82].**

واتە : موسافر دەست دەكات بە كورت كردنەوەی نوێژ ئەگـەر ماڵـەكانی شـارەكەی تێپەڕ كرد ، بەوەی لە هەموو شارەكەی دەرچێتە دەرەوە ، وە نابێت لە ماڵەكەی خۆیدا یان لە ناوەڕاستی شارەكەیدا نوێژ كورت بكاتەوە ئەگەر نیەتی سەفەری هەبوو .

**عن علي بن ربيعة قال : (خرجنا مع علي بن أبي طالب (رضي الله عنه) متوجه ـ ها هنا وأشار بيده إلى الشام ـ فصلى ركعتين ركعتين حتى إذا رجعنا ونظرنا إلى الكوفة حضرت الصلاةُ ، فقالوا : يا أمير المؤمنين هذه الكوفةُ نتم الصلاةَ ؟ قال : لا حتى ندخلها)[83].**

---

[80] سبل السلام : (٢ / ٤٤٦) .

[81] "الـمحلى بالآثار" لابن حزم : (٥ / ٢) .

[82] أضواء البيان : (١ / ٣٧١) وانظر : شرح صحيح مسلم للنووي : (٥ / ٢٠٠) والـمحلى : (٥ / ٢) .

[83] رواه البخاري معلقاً باختصار : (باب يقصر إذا خرج من موضعه) وأوصله البيهقي في "السنن الكبرى" رقم : (٥٦٥٦) وانظـر : الفتح : (٢ / ٥٧٠) .

واتە : لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو تالب دا ـ خوای لێ رازی بێت ـ دەرچوینە دەرەوە و ڕوومان کرد لە شام ، جا دوو رکعات دوو رکعات نوێژی دەکرد تاوەکو گەڕاینەوە و سەیری کوفەمان کرد و بینیمان لەو کاتەدا کاتی نوێژ ئامادە بوو ، وترا : ئەی فەرمان ڕەوای ئیمانداران ئەمە کوفەیە ئایا نوێژەکە بە تەواوی بە چوار رکعات ناکەیت ؟ فەرمووی : نەخێر بەردەوام نوێژەکەمان کورت دەکەینەوە تاوەکو دەڕۆینە ژوورەوە .

**قال الحافظ : (المراد بِقَوله : " هذه الْكُوفَة " : أي فَأتم الصلَاة ، فَقَالَ : " لَا ، حتى ندخلها " أي لَا نزال نقْصر حتى ندخلها ، فَإِنا ما لَم ندخلها في حكْم الْمسافرين)[٨٤].**

واتە : مەبەست بە وتەیان : ئەمە کوفەیە ؟ واتە : نوێژەکە تەواو بکە ، فەرمووی : نەخێر بەردەوام نوێژەکەمان کورت دەکەینەوە تاوەکو دەڕۆینە ژوورەوە ، چونکە تاوەکو نەڕۆینە ژوورەوە هەر لە حوکمی موسافر داین .

**پ٤١ / لە چ حاڵەتێکدا نوێژە فەرزەکان کۆدەکرێنەوە ؟**

وەڵام /

١ ـ ئەگەر کەسێك نیازی سەفەر کردنی هەبوو لە پێش نیوەڕۆ ئەوا نوێژی نیوەڕۆ دوا دەخات بۆ لای نوێژی عەسر ئەنجا لە کاتی عەسرا هەردووکیان کۆدەکاتەوە دوو رکعات نوێژی نیوەڕۆ دەکات پاشان دوو رکعات عەسر .

وە ئەگەر کەسێك نیازی سەفەر کردنی هەبوو لە پاش نیوەڕۆ ئەوا چوار رکعات نوێژی نیوەڕۆ لە کاتی خۆیدا دەکات ئەنجا ڕاستەخۆ لە پاش نوێژی نیوەڕۆ چوار رکعات نوێژی عەسریش دەکات و هەردووکیان کۆدەکاتەوە بە بێ کورت کردنەوە چونکە هێشتا سەفەری نەکردووە .

---

[٨٤] **فتح الباري : (٢ / ٥٧٠) .**

وە ئەگەر کەسێك نیازی سەفەر کردنی هەبوو لە پێش مەغریب ئەوا نوێژی مەغریب دوا دەخات بۆ لای نوێژی عیشا ئەنجا لە کاتی عیشادا هەردووکیان کۆدەکاتەوە سێ رکعات نوێژی مەغریب دەکات پاشان دوو رکعات عیشا .

وە ئەگەر کەسێك نیازی سەفەر کردنی هەبوو لە پاش مەغریب ئەوا سێ رکعات نوێژی مەغریب لە کاتی خۆیدا دەکات ئەنجا ڕاستەخۆ لە پاش نوێژی مەغریب چوار رکعات نوێژی عیشاش دەکات و هەردووکیان کۆدەکاتەوە بە بێ کورت کردنەوە چونکە هێشتا سەفەری نەکردووە .

وە ئەگەر لە سەفەردا بوو ئەوا پێویستە نوێژە چواری‌یەکان کورت بکاتەوە بۆ دوو رکعات ، بەڵام کۆکردنەوەیان :

ئەوا دەتوانێت نوێژی نیوەڕۆ دوا بخات بۆ لای عەسر یان نوێژی عەسر پێش بخات بۆ لای نیوەڕۆ .

هەروەها دەتوانێت نوێژی مەغریب دوا بخات بۆ لای عیشا یان نوێژی عیشا پێش بخات بۆ لای مەغریب .

**عن معاذ بن جبلٍ (﵁) : ((أن رسولَ الله (ﷺ) كَانَ في غَزوة تبوك إِذَا زاغَت الشمس قَبلَ أَنْ يرتحلَ جمع بين الظهر والعصر ، وإِنْ يرتحلْ قَبلَ أَنْ تزيغَ الشمس أخر الظهر حتى ينزلَ للعصر ، وفي المغربِ مثْلَ ذَلك إِنْ غَابت الشمس قبلَ أَنْ يرتحلَ جمع بين المغربِ والعشاءِ ، وإِنْ يرتحلْ قَبلَ أَنْ تغيب الشمس أخر المغرب حتى ينزلَ للعشاءِ ثُم جمع بينهما))[85].**

واتە : پێغەمەری خوا (ﷺ) لە غەزای تەبوکدا ئەگەر خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا لایبدایە پێش ئەوەی دەربچوایە ئەوا نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کۆدەکردەوە ، وە ئەگەر پێش ئەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا لایبدایە دەربچوایە ئەوا نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست تاوەکو دادەبەزی بۆ نوێژی عەسری ، وە لە مەغریبیشدا بە هەمان شێوە ئەگەر

---

[85] صحيح أ داود رقم : (١٢٠٨) .

خۆر ئاوا ببوایە پێش ئەوەی دەربچوایە ئەوا نوێژی مەغریب و عیشای کۆدەکردەوە ، وە ئەگەر پێش خۆر ئاوابوون دەربچوایە ئەوا نوێژی مەغریبی دوا دەخست تاوەکو بۆ نوێژی عیشا دادەبەزی ئەنجا هەردووکیانی کۆدەکردەوە .

**تێبینی‌یەك :**

کورت کردنەوەی نوێژە چواری‌یەکان لە سەفەردا واجبە دەبێت دوو رکعات دوو رکعات ئەنجامیان بدات چ بە رێوە بێت و لە سەر سەفەر بێت یان جێگیر بووبێت لە سەفەرەکەیدا .

بەڵام کۆکردنەوەی نوێژەکان ئەوا بە پێی پێویست ئەنجامی دەدات و نابێت بەردەوام نوێژەکان کۆبکاتەوە بە بیانوی ئەوەی لە سەفەردایە !

کەواتە ئەگەر موسافیر پێویستی بە کۆکردنەوە هەبوو ئەوا نوێژەکان کۆدەکاتەوە ، جا چ ئەمە بۆ بەرێوە بوون بێت لە کاتی یەکەمینیاندا یان دووەمینیاندا بێت لە حاڵەتێکدا کە دابەزین نارەحەت بێت لە سەر لەو کاتەدا ، یان لە کاتی دابەزین و جێگیر بوونیدا بێت لە بەر پێویستی‌یەکی تر ، بۆ نموونە ئەگەر پێویستی هەبوو بۆ خەوتن و پشوودان لە کاتی نیوەڕۆ و عیشادا ئەوا لە کاتی نێوەڕۆدا دادەبەزێت کە ئەو ملندووە و خەوی دێت و برسی‌یەی پێویستی بە پشوودان و خواردن و خەوتن هەیە ، لەم حاڵەتەدا نوێژی نیوەڕۆ دوا دەخات بۆ لای کاتی عەسر ، ئەنجا پێویستی هەیە بەوەی کە نوێژی عیشا پێش بخات و لەگەڵ مەغریبدا کۆیبکاتەوە و ئەنجا دوای ئەوە پشوو بدات و بخەوێت .

بەڵام ئەگەر کەسێك چەند ڕۆژێك لە گوندێکدا یان لە شارێکدا بمێنێتەوە و جێگیر ببێت بۆ ماوەیەك ئەوا ئەم کەسە هەرچەندە نوێژەکانی کورت دەکاتەوە بەڵام نابێت کۆیان بکاتەوە ئیللا مەگەر لە بەر پێویستی‌یەك نەبێت[٨٦].

بەڵام نوێژی بەیانیان ئەوا لەگەڵ هیچ نوێژێکدا کۆناکرێتەوە ، بەڵکو دەبێت تەنها لە کاتی خۆیدا بکرێت .

---

[٨٦] بروانە کتێبی : **(سلسلة الأحاديث الصحيحة) للشيخ الألبانـي : (١ / ٣١١ ـ ٣١٥) .**

٢ ـ کۆکردنەوەی نوێژ بە هۆی باران بارینەوە یان قوڕە لێتەوە یان ڕەشەبای ساردەوە .

٣ ـ کۆکردنەوەی نوێژ بە هۆی ترسەوە لە حاڵەتێکی نا ئاساییدا .

٤ ـ کۆکردنەوەی نوێژ بە بێ هۆکارێکی نا ئاسایی بەڵکو بۆ دوور خستنەوەی ناڕەحەتی لە سەر موسڵمانان .

**عن ابن عباسٍ قَالَ : ((جمع رسولُ الله (ﷺ) بين الظهر والعصر والمغربِ والعشاءِ بِالْمدينة في غَيرِ خوف ولاَ مطَرٍ [ولَا سفَرٍ] ، فَقيلَ لابنِ عباسٍ : ما أَراد إِلَى ذَلك ؟ قَـالَ : أَراد أَنْ لاَ يحـرِج أُمته))[٨٧].**

واتە : پێغەمەری خوا (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆ و عەسر ، وە مەغریب و عیشای کۆکردەوە لە ناو مەدینەدا بە بێ ترس و بە بێ باران و بە بێ سەفەر ، وترا بە ابن عباس مەبەستی چی بوو بەوە ؟ فەرمووی : مەبەستی ئەوە بوو کە ئوممەتەکەی نەخاتە ناڕەحەتی‌یەوە .

ئەم فەرموودەیە چەند سودێکی تێدایە لەوانە :

ـ کۆکردنەوەی نوێژەکان بە هۆی ترسەوە کارێکی شەرعی‌یە .

ـ کۆکردنەوەی نوێژەکان بە هۆی بارانەوە کارێکی شەرعی‌یە .

ــ کۆکردنەوەی نوێژەکان بە هەر هۆیەکەوە کە ببێتە مایەی ناڕەحەتی لە ئەنجامدانیاندا لە کاتی خۆیاندا وەك نەخۆشی یان ماندووبوونێکی زۆر ... هتد .

**پ٤٢ / ئەگەر لە سەفەردا بوویت لە ڕێگا مەجالی نوێژت نەبوو بۆت هەیە نییەتی جەمعی لێ بێنی و لە ماڵەوە بیکەی ؟**

وەڵام /

ئەگەر موسافیر لە ڕێگاوباندا دابەزین ناڕەحەت بێت لەسەری و بشزانێت لە کاتی (نوێژی نیوەڕۆ) یان (نوێژی مەغریب)دا ناگاتە جێی خۆی و فریا ناکەوێت نوێژەکەی لە

---

[٨٧] **صحيح مسلم رقم : () وصحيح سنن أبـي داود رقم : (١٢١١) وصحيح سنن الترمذي رقم : (١٨٧) .**

کاتی خۆیدا ئەنجامبدات ئەوا پێویستە نییەتی کۆکردنەوەی ئەو نوێژە بێنێت و دوای بخات بۆ لای نوێژەکەی پاش خۆی .

**عن معاذ بن جبل (رضي الله عنه) : ((أن رسولَ الله (ﷺ) كَانَ في غَزوة تبوك إِذَا زاغَت الـشمس قَبلَ أَنْ يرتحلَ جمع بين الظهرِ والعصرِ ، وإِنْ يرتحلْ قَبلَ أَنْ تزيغَ الشمس أخر الظهر حتـى ينزلَ للعصر ، وفي المغربِ مثْلَ ذَلك إِنْ غَابت الشمس قَبلَ أَنْ يرتحلَ جمع بـين المغـربِ والعشاءِ ، وإِنْ يرتحلْ قَبلَ أَنْ تغيب الشمس أخر المغرب حتى ينـزلَ للعـشاءِ ثُـم جمـع بينهما))[88].**

واتە : پێغەمەری خوا (ﷺ) لە غەزای تەبوکدا ئەگەر خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا لایبدایە پێش ئەوەی دەربچوایە ئەوا نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کۆدەکردەوە ، وە ئەگەر پێش ئەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا لایبدایە دەربچوایە ئەوا نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست تاوەکو دادەبەزی بۆ نوێژی عەسری ، وە لە مەغریبیشدا بە هەمان شێوە ئەگەر خۆر ئاوا ببوایە پێش ئەوەی دەربچوایە ئەوا نوێژی مەغریب و عیشای کۆدەکردەوە ، وە ئەگەر پێش خۆر ئاوابوون دەربچوایە ئەوا نوێژی مەغریبی دوا دەخست تاوەکو بۆ نوێژی عیشا دادەبەزی ئەنجا هەردووکیانی کۆدەکردەوە .

**تێبینییەك** : بەڵام (نوێژی عەسر) دواناخرێت بۆ لای (نوێژی مەغریب) .

**ماوەی کورت کردنەوەی نوێژ :**

**پ٤٣ / تا ماوەی چەند ڕۆژ موسافر دەتوانێت نوێژەکان کورت بکاتەوە ؟**

وەڵام /

هەروەها لێرەشدا بە هەمان شێوە لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) هیچ ماوەیەك دیاری نەکراوە بۆ ئەوەی موسافر تێیدا نوێژەکانی کورت بکاتەوە و ئەنجا دوای ئەوە بە تەواوی چوار چوار بیانکات ئەگەر چی هەر لە سەفەریشدا بێت ! بەڵکو بەردەوام نوێژە چوارییەکان کورت دەکاتەوە تاوەکو دەگەڕێتەوە بۆ جێگای نیشتەجێبوونی خۆی

[88] **صحيح أبي داود رقم : (١٢٠٨) .**

ئەگەر چی چەندین ڕۆژ یان چەندین مانگ یان چەندین ساڵیش بمێنێتەوە ئەوا هەر نوێژەکانی کورت دەکاتەوە مادام لە سەفەردایە .

**عن ابن عمر (رضي الله عنه) قالَ : ((إن رسولَ الله (ﷺ) كانَ إذَا خرج من أهلـه صلى ركْعتين حتى يرجع إليهم))[89].**

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر لە نێو کەسوکاریدا دەربچوایە ئەوا دوو رکعات نوێژی دەکرد تاوەکو دەگەڕایەوە .

کەواتە ئەوانەی دەڵێن : کورت کردنەوەی نوێژ ئەوەندە دروستە کە بۆ ماوەی (٤) ڕۆژ یان (١٠) یان (١٥) یان (١٧) یان (١٩) یان (٢٠) .. یان .. یان ... بمێنیتەوە لە سەفەردا ئەنجا دوای ئەم ماوەیە دەبێت نوێژە چواری‌یەکان بە تەواوی چوار چوار بکات ئەگەر چی لە سەفەریشدا بێت ! ئەم وتانە هیچ بەڵگەیەکی ڕوونی لە سەر نەهاتووە .

بەڵگەی خاوەنی ئەم وتانە بریتی‌یە لەوەی کە دەڵێن : پێغەمەری خوا (ﷺ) لە سەفەرەکانیدا یان (٤) ڕۆژ یان (١٥) یان (١٧) یان (١٩) یان (٢٠) ڕۆژ ماتەوە و نوێژەکانی تێدا کورت کردووەتەوە بۆیە دەبێت ئێمەش هەر ئەوەندە نوێژەکانمان کورت بکەینەوە !

وەڵامی زانایان بۆ ئەم وتەیە ئەوەیە کە دەڵێن : ڕاستە پێغەمەری خوا (ﷺ) لە سەفەرەکانیدا جاری هەبووە (٤) ڕۆژ یان (١٥) یان (١٧) یان (١٩) یان (٢٠) ڕۆژ ماتەوە ، چونکە لە سەفەرەکانیدا هەر ئەوەندە ماتەوە بە پێی پێویستی کات بۆ ئەنجامدانی کارەکانی و پاشان گەڕاوەتەوە ، ئەمەش نابێتە ڕێگر لەوەی کەوا ئەگەر کەسێك لە سەفەرەکەیدا زیاتر لەو ماوانە مایەوە ئەوا ئیتر نابێت نوێژەکانی کورت بکاتەوە ! چونکە پێغەمەری خوا (ﷺ) ئەم تێگەیشتنەی باس نەکردووە و ئاماژەشی بۆ نەکردووە .

هەروەها بۆمان هەیە بڵێین : بەڵگەتان چی‌یە ئەگەر پێغەمەری خوا (ﷺ) لە سەفەرەکانیدا لەو ماوانە زیاتر بمایەتەوە ئەوا نوێژەکانی کورت نەدەکردەوە ؟

---

[89] **رواه أ د رقم : (٥٠٤٢) .**

لە ڕاستیدا هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نىيە !

بۆیە موسافر تاوەکو لە سەفەردایە ئەوا پێویستە نوێژە چواریەکانی کورت بکاتەوە تاوەکو دەگەڕێتەوە هەر چەند بمێنێتەوە .

*** ئایا موسافیر جەماعەتی لە سەرە ؟**

**پ٤٤ / ئایا ئەگەر من لەسەفەردا بووم و ماوەی چوار یان پێنج ڕۆژ لە شوێنێکی وەک لە کەلاردا مامەوە و بۆ دێنی خزمەکانم چوو بووم ئایا بچم بۆ جەماعەت یان نوێژەکانم کورت بکەمەوە ؟ پێشتر پرسیارم کردبوو باسی ئەمەتان نەکردبوو .**

وەڵام /

بەڵێ لەسەر موسافریش واجبە کەوا نوێژەکانی بە جەماعەت بکات بە بەڵگەی ئەم ئایەتە و ئەم فەرموودەیە :

ئایەتەکە : ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ ...(١٠٢)﴾ **[النساء] .**

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر تۆ **[لە کاتی جەنگدا]** لە نێوانیاندا بوویت و بە جەماعەت نوێژت بۆیان کرد ..

کەواتە لە کاتی جەنگ و لە کاتی ترسدا نوێژی جەماعەت پێویستە و واجبە ، بێ گومان زۆر جارێکیش جەنگ لە دەرەوەی شوێنی نیشتەجێبوون دەکرێت واتە لە حاڵەتی سەفەردا .

فەرموودەکە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((ما من ثَلاثَة في قَرية ولاَ بدوٍ [لاَ يؤذنُ] لاَ تقَام فيهم الصلاةُ إلا قَد استحوذَ عليهم الشيطَانُ))[90].**

واتە : سێ کەس نابێت لە گوندێکدا یان لە دەشتاییکدا بانگ نەدەن و نوێژ بە جەماعەت نەکەن لە نێو خۆیاندا ئیللا شەیتان زاڵ دەبێت بە سەر سەریاندا .

---

[90] **أخرجه أ د رقم : (٢٢٣٤٢) وصحيح أ داود رقم : (٥٤٧) .**

ئەمەش بە بێ جیاوازی لە نێوان ئەوەی کە نیشتەجێبن یان موسافیر بن ، **وا أعلم** .

**پ٤٥ / من پێنج ساڵە لە بریتانیا دەژیم ڕەنگە بۆ پێنج ساڵی تریش دابنیشم بەڵام بە نیاز نیم لێرە بمێنمەوە تاوەکو ئێستاش قەصر و جەمع دەکەم ئایا دروستە یان نا ؟ تکایە بە دەلیلەوە .**

وەڵام /

ئەوەی کە تاوەکو ئێستا ئەنجامت داوە دروستە و هیچی تێدا نییە ، بەڵام بە نیسبەت ئەو پێنج ساڵەی ترکە دەڵێی بە نیازم بمێنمەوە ئەوا دەڵێم :

ئەگەر بڕیاری نیشتەجێبوونت **(إقامـــة)** داوە لەوێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراوی درێژخایەن ئەوا بە موسافیر حیساب ناکرێیت و دەبێت نوێژەکانت لە کاتی خۆیاندا بە تەواوی ئەنجام بدەیت نەك بە (قەصر و جەمع) .

وە ئەگەر چاوەڕوانی ئەوە بێت کەوا هەر کاتێك ئیشوکاری ئەوێت تەواو بوو پاشان بگەڕێیتەوە و ناشزانیت کەی لەو ئیشوکارە دەبیتەوە ئەوا پێویستە نوێژەکانت بە (قەصر و جەمع) ئەنجام بدەیت تاوەکو دێیتەوە یان تاوەکو بڕیاری نیشتەجێبوون **(إقامة)** دەدەیت .

بەڵام ئامۆژگاریت دەکەین بە گەڕانەوە بۆ وڵاتی موسڵمانان و بە جێهێشتنی وڵاتی بێباوەڕان ، چونکە مانەوە و نیشتەجێبوون **(إقامة)** لە وڵاتی کافران حەرامە و یەکێکە لە تاوانە گەورەکان **(الكبـــائر)** بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەموویەتی : **((أنا بريءٌ من كُل مسلمٍ يقيم بين أظهر المشرك ، قالُوا يا رسولَ الله لــم ؟ قالَ : لاَ تراءَى ناراهما))**[91].

---

[91] **صحيح أبــي داود رقم : (٢٦٤٥) .**

واتە : من بەریم لەو موسڵمانەی کەوا نیشتەجێدەبێت (إقامە دەکات) لە نێوەنی بێباوەڕ و موشریکەکاندا ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا بۆ چی ؟ فەرمووی : نابێت ئاگری یەکتر ببینن .

**پ٤٦ / ئەگەر کەسێک نوێژی دەکرد دروستە کەسێکی تر بێت و دەست بدات لە پشتی بە مەبەستی ئەوەی بیکات بە ئیمام و نوێژەکە بە جەماعەت بکەن ؟**

وەڵام /

ئەگەر مزگەوتێك پێشنوێژ (ئیمام)ی دیاری کراو و تایبەتی هەبێت و بەردەوام بانگی تێدا بدرێت و هەر پێنج نوێژە فەرزەکەی بە جەماعەت تێدا ئەنجام بدرێت ئەوا نابێت لە پاش تەواو بوونی جەماعەتی یەکەم جارێکی تر یان چەند جارێکی تر هەمان نوێژ بە جەماعەت دوو بارە بکرێتەوە ، چونکە دوو بارە کردنەوەی نوێژی جەماعەت لە مزگەوتەدا بیدعەیە و لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نەکراوە .

بەڵگە لە سەر ئەمە :

**عن أبي بكْرةَ (رضي الله عنه) أن رسولَ الله (ﷺ) أقْبلَ من نواحي الْمدينة يريد الصلاةَ ، فَوجد الناس قَد صلوا فَمالَ إلى منزله فَجمع أهلَه فَصلى بِهم))[٩٢].**

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دەوروبەری مەدینە گەڕاوە بۆ نوێژ ، بینی کەوا خەڵك نوێژیان کردووە ، ئەنجا گەڕایەوە بۆ ماڵەوەیان و کەسوکاری کۆکردەوە و نوێژی پێیان کرد .

جا ئەگەر جەماعەتی دووەم لە مزگەوتدا دروست بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) وازی نەدەهێنا لە فەرزڵی نوێژ کرد لە مزگەوتەکەی خۆیدا کە هەر نوێژێکی خێری هەزار نوێژی هەیە .

وە ئیمامی شافعی ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ فەرموویەتی : (ئەگەر مزگەوت ئیمامی بەردەوامی هەبێت ، وە پیاوێك یان دوو پیاو نوێژی جەماعەتیان لە دەست چوو ، ئەوا بە

---

[٩٢] **رواه الط انـي الـمعجم الأوسط رقم : (٤٧٥٧) وحسنه الألبانـي "تـمام الـمنة" ص : (١٥٥) .**

تاك نوێژەكەیان دەكەن ، وە من پێم خۆش نیـیە بـە جەماعـەت بیكـەن ، وە ئەگـەر بـە جەماعەت بیكەن ئەوا نوێژەكەیان لە سەر كەوتووە ، وە من ئەمـەم پـێ ناخۆشـە بۆیـان چونكە سەلەف و پێشینانی ئێمە ئەم كارەیان نەكردووە ، بەڵكو هەنـدێكیان عەیبـداریان كردووە) .

هەروەها ئیمامی شافعی - ڕەحمەتی خوای لێبێت [لە هەمان شوێندا] ـ فەرموویـەتی : (وە بۆمان سەلمێنراوە كەوا نوێژی جەماعەت لە دەست چەندین پیاو دەرچووە لەگـەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ، ئەوانیش بە تاك كردوویانە بە زانیاری پێغەمبـەرەوە (ﷺ) ، وە دەشیان توانی بە جەماعەت بیكەن ... بەڵام ئەمـەیان پـێ بـاش نـەبووە بـۆ ئـەوەی لـە مزگەوتێكدا دوو جار جەماعەت نەكرێت)[٩٣] .

ئیمامی شافعی بەم وتەیە ئاماژە دەكات بۆ كرداری (**ابن مسعود**) و جگە لەویش :

**عن إبراهيم : (أن علْقَمةَ والأسود أقْبلا مع ابنِ مسعود إلى الْمسجِد فَاستقْبلَهم الناس قَـد صلوا ، فَرجع بِهما إِلى الْبيت فَجعلَ أحدهما عن يمينِه ، والآخر عن شـماله ، ثُـم صـلى بِهما)[٩٤] .**

واتە : **(علقمة والأسود)** لەگەڵ **(ابن مسعود)**دا هـاتن بـۆ مزگـەوت ، خـەڵكیش روویـان تێكردن و نوێژیان كردبوو ، ئەویش هەردووكیانی بردەوە بۆ ماڵ و یەكێكیانی خستە لای ڕاستیەوە و ئەوی ترشی خستە لای چەپێەوە ، ئەنجا نوێژی پێیان كرد .

بەڵام دوو بـارە كردنـەوەی نوێـژی جەماعـەت لـەو مزگەوتانـەدا كـە لـە سـەر ڕێگـا و بانەكان دروست كراون و پێشنوێژ و بانگدەری تایبەتیان نیـیە دروستە[٩٥] .

وە ئەگەر كەسێك خەریكی نوێژ كردن بوو لە ماڵدا وە كەسێكی تر ویستی لەگەڵ ئەو نوێژەكەی بە جەماعەت بكات ئەوا ڕاستەوخۆ دەچێت لای ڕاستیەوە دەوەستێت بە بێ ئەوەی دەست بدات لە شانی چونكە ئەم دەست لێدانە بیدعەیەكی ئیخوانیـیە !

---

[٩٣] **الأم : (١ / ١٨١) .**

[٩٤] **رواه الط انـي الـمعجم الكب رقم : (٩٣٨٠) وحسنه الألبانـي "تـمام الـمنة" ص : (١٥٥) .**

[٩٥] بڕوانە كتێبی : **(القول الـمب أخطاء الـمصل ) ص : (٢٦٩ ـ ٢٧٩) .**

بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە :

**عن ابنِ عباسٍ (رضي الله عنه) قَالَ : ((بِت عند رسولِ الله (ﷺ) لَيلَةً وهو عند ميمونةَ فَنام حتى إِذَا ذَهب ثُلُثُ الليلِ أو نِصفُه استيقَظَ فَقَام إِلَى شن فيه ماءٌ فَتوضأ وتوضأت معه ثُم قَام فَقُمت إِلَى جنبِه علَى يسارِه فَجعلَنِي علَى يمينِه ...))[96].**

واتە : شەوێك لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامەوە لە کاتێکدا کە لای (میمونە)ی پورم بوو ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەوت تاوەکو سێیەکی شەو یان نیوەی شەو ڕۆیشت ئەنجا هەستا بۆ لای مەشکەیەك کە ئاوی تێدا بوو ئەنجا دەستنوێژی گرت و مەنیش لەگەڵ ئەودا دەستنوێژم گرت ئەنجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستا بۆ نوێژ مەنیش ڕۆیشتم لە لای چەپی‌یەوە وەستام ئەویش خستمیە لای ڕاستی‌یەوە ...

**پ٤٧ / نوێژی عیشا تەئخیر بکەی گوناح نی‌یە ؟**

**وەڵام /**

کاتی نوێژی عیشا لە پاشان دیار نەمانی شەفەقە سوورەکەی دوای خۆرئابوونەوە دەست پێدەکات تاوەکو نیوەی ناوەڕاستی شەو ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((.. ووقْت صلاَة الْمغربِ ما لَم يغبِ الشفَق ، ووقْت صلاَة الْعشاءِ إِلَى نِصف الليلِ الأَوسط ..))[97].**

واتە : وە کاتی نوێژی مەغریب تاوەکو شەفەق مابێت و ئاوانەبووبێت ، وە کاتی نوێژی عیشا تاوەکو نیوەی ناوەڕاستی شەوە .

وە لە کتێبەکەی ئیمامی عومەردا بۆ (**أبو موسى الأشعري**) هاتووە : **((... وأنْ صلِّ العشاءَ ما بينك وبين ثُلث الليلِ ، وإنْ أخرت فَإِلَى شطرِ الليلِ ولَا تكُن من الغافلِ ))[98].**

---

[96] صحيح أبي داود رقم : (١٣٦٤) .

[97] صحيح مسلم رقم : () .

[98] أخرجه مالك والطحاوي وابن حزم وسنده صحيح .

واتە : وە نوێژی عیشا ئەنجام بدە لە نێوان سەرەتای کاتەکەی و سێ یەکی یەکەمی شەودا ، وە ئەگەر دوات خست و تەئخیرت کرد ئەوا با تاوەکو نیوەی شەو بێت و لە بێ ئاگا و غافڵەکان مەبە .

ئەمە سەبارەت بە سەرەتا و کۆتایی کاتی نوێژی عیشا .

بەڵام ئایا دوا خستی نوێژی عیشا سوننەتە یان نا ؟

ئەگەر موسڵمانێك خۆی بە تەنها نوێژی عیشا ئەنجام بدات بە بێ ئامادە بوون لە مزگەوتدا بە جەماعەت ئەوا سوننەتە و چاکتر وایە ڕاستەوخۆ لەگەڵ هاتنی کاتی نوێژی عیشادا نوێژەکەی ئەنجام بدات و دوای نەخات .. وە ئەگەر ئامادە بوو لە مزگەوتدا و لەگەڵ موسڵماناندا بە جەماعەت نوێژەکەی ئەنجام دا ئەوا (ئەگەر موسڵمانان بتوانن) سوننەتە و چاکتر وایە ئیمام و پێشنوێژ نوێژی عیشا دوا بخات بۆ سێ یەکی یەکەمی شەو یان بۆ نیوەی شەو بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە :

**عن أبِي هريرةَ (ﷺ) قَالَ : قَالَ النبِي (ﷺ) : ((لَولاَ أَنْ أَشق علَى أُمتي لأَمرتهم أَنْ يؤخروا الْعشاءَ إِلَى ثُلُث الليل أَو نِصفه))[99] .**

واتە : ئەگەر ناڕەحەت نەبوایەت لە سەر ئوممەتەکەم ئەوا فەرمانم پێیان دەکرد بەوەی کەوا نوێژی عیشا دوا بخەن بۆ سێ یەکی یەکەمی شەو یان بۆ نیوەی شەو .

**پ٤٨ / ئەگەر لە کاتی نوێژدا چاوم بنوقێنم دروستە ؟ چونکە بە چاو نوقاندن نوێژەکەم باشتر دەبێ وە خشوعی زیاتر دەبێ ؟**

وەڵام /

سوننەت وایە نوێژگەر لە کاتی وەستانیدا چاو بڕوانێتە شوێنی سوجدە بردنەکەی بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە : **((دخلَ رسولُ الله (ﷺ) الْكَعبةَ ما خلف بصره موضع سجوده حتى خرج منها))[100] .**

---

[99] صحيح سنن الترمذي رقم : (١٦٧) .

واتە : کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشتە ناو کەعبەوە چاوی لانەبرد لە سەر جێگای سوجدەکەی تاوەکو لە نوێژەکەی بویەوە .

وە سوننەتیش وایە لە کاتی تەحیات خوێندتیشدا سەیری پەنجەی شایەتومانی بکات بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە :

**عن عبد الله بن عمر (رضي الله عنه) قَالَ : ((كَانَ رسولُ الله ﷺ إذَا جلَس في الصلاَة وضع كَفه الْيمنى علَى فَخذه الْيمنى وقَبض أصابعه كُلها وأَشار بِإصبعه التي تلي الإِبهام [في الْقبلَة ورمى بِبصره إِلَيها] ، ووضع كَفه الْيسرى علَى فَخذه الْيسرى))[101].**

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر دابنشتایەت لە نوێژدا ـ واتە : لە کاتی تەحیاتدا ـ لەپی دەستی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەنا و هەموو پەنجەکانیشی دەنوقاند و بە **پەنجەی شایەتومانی ئاماژەی دەکرد بەرەو قیبلە و چاوی تیَ دەبڕی و سەیری ئەو پەنجەیەیی دەکرد** ، وە لەپی دەستی چەپیشی لەسەر ڕانی چەپی دادەنا .

بەڵام خاوەنی کتێبی **(القول الـمبـ أخطاء الـمصلـ )** فەرموویەتی : **(والصواب أن يقال : إنْ كان تفتيح العـ لا يخل بالـخشوع فهو أفضل ، وإنْ كان يحول بينه وبـ الـخشوع لـما قبلته من الزخرفة والتزويق أو غـ ه ـا يشوش عليه قلبه ، فهنالك لا يكره تغميض العـ قطعاً ، والقول بالاستحباب هذا ا ـال أقرب إ أصول الشرع ومقاصده من القول بالكراهة ، وا أعلم)**[102].

واتە : وتەی ڕاست ئەوەیە کە بوترێت : ئەگەر چاو کردنەوە خشوع کەم نەکاتەوە ئەوا چاو کردنەوە چاکترە ، وە ئەگەر چاو کردنەوە بووە ڕێگر لە خشوع بە هۆی هەبوونی شتی ڕازاوە و سەرنجڕاکێش یان جگە لەمە لە قیبلەی نوێژگەردا لەوانەی کەوا دڵی پەرتەوازە دەکات و دەیشڵێژێنێت ئەوا لەو حاڵەتەدا چاو نوقاندن مەکروه نییە ،

---

[100] **رواه الـحاكم "الـمستدرك" رقم : (١٧١٦) والبيهقي "السنن الكـ ى" رقم : (١٠٠٠٨) وانظر : "صفة الصلاة" ص : (٨٩) .**

[101] **صحيح مسلم رقم : () وصحيح سنن النسائي رقم : (١١٦٠) والزيادة له ، وانظر : "صفة الصلاة" ص : (١٥٨) .**

[102] بڕوانە : **القول الـمبـ** لاپەڕە : **(١١٢ ـ ١٢٣) .**

بەڵکو لەم حاڵەتەدا ئەو وتەیەی کە دەڵێت نوقاندنی چاو چاکترە نزیك ترە لە بنەواکانی شەریعەت و مەبەستەکانی تاوەکو کەراهەت .

کەواتە : ئەگەر لە شوێنێکدا نوێژت کرد کەوا شتی ڕازاوە و سەرنجڕاکێشی تێدا نەبوو کە ببێتە هۆی نەمانی خشوع لە نوێژدا ئەوا سوننەت وایە چاوت کراوە بێت .

وە ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو ئەوا چاو نوقاندن باشترە ، **وا أعلم** .

**پ٤٩ / ئایا ژن دەتوانێت ئیمامی جەماعەتی پیاوان بکات مەحرەم و نامەحرەم ؟**

وەڵام /

نەخێر بە هیچ شێوەیەك دروست نییە بۆ ژن کە ئیمامەت بکات بۆ پیاوان مەحرەم بن یان نامەحرەم بن بە کۆڕای زانایانی ئیسلام .

وە زانایان ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لن يفْلح قَوم ولوا أمرهم امرأةً))**[١٠٣].

واتە : هیچ قەومێك سەرکەوتو نابێت ئافرەت بکەن بە سەرپەرشتیاری کارەکانیان .

وە لە مێژووی ئیسلامدا هیچ حاڵەتێك نەبووە کەوا تێیدا ئافرەت پێشنوێژی بکات بۆ پیاوان ! ! !

بەڵام ئافرەت دەتوانێت پێشنوێژی بکات بۆ ئافرەت .

**پ٥٠ / بۆ چی ئیمام لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر قورئان بە دەنگی بەرز ناخوێنێت ؟**

وەڵام /

چونکە خوا بەو شێوەیە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەر (ﷺ) کەوا بە دەنگی نزم قورئانەکە بخوێنێت ، وە ئەگەر مەبەستت ئەوەیە ئایا حیکمەت چییە لەوەدا ؟ ئەوا دەڵێم : حیکمەت لەوەدا نەزانراوە .

---

[١٠٣] **صحيح البخاري رقم : (٤٤٢٥) .**

## * زەکات بە کێ دەدرێت ؟

**پ٥١ / من دەمەوێ زەکات بدەم بەڵام بەو شێوەی کە کاتی خۆی دراوە بە (بیت المال) بەڵام من ئێستا نازانم (بیت المال) لە کوێیە ، وە نازانم لای کێیە ؟**

وەڵام /

ئەوانەی کەوا شایستەی ئەوەن زەکاتیان پێبدرێت بریتین لەم هەشت بەشەی کە لەم ئایەتەدا باسکراوە : خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾﴾ [التوبة] .

واتە : زەکات تەنها بۆ ئەمانەیە :

١ ـ ﴿لِلْفُقَرَآءِ﴾ فەقیر و هەژارێك کە هیچی نیە .

٢ ـ ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾ فەقیر و هەژارێك کە هەندێکی هەیە بەڵام بەشی ناکات .

٣ ـ ﴿وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا﴾ ئەو کرێکارانەی کەوا ئیشوکاری لە سەر دەکەن و کۆی دەکەنەوە و دابەشی دەکەن .

٤ ـ ﴿وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵ ڕاگیر کراوەکان .

٥ ـ ﴿وَفِى ٱلرِّقَابِ﴾ ئازاد کردنی کۆیلەکان .

٦ ـ ﴿وَٱلْغَٰرِمِينَ﴾ قەرزارەکان .

٧ ـ ﴿وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە پێناوی خوادا (جیهاد و حەج و بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی) .

٨ ـ ﴿وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ ڕێبوار .

جا لە کاتی بوونی دەوڵـەتی ئیـسلامدا (مـاڵ و شـتومەکی زەکـات)[(١٠٤)] دەدرێـت بـە دەوڵەت و لە خەزێنەی دەوڵەتدا کە پێی دەوترێت (**بيت الـمال**) کۆدەکرێتەوە و پاشان دابەش دەکرێت بە سەر ئەو هەشت بەشەی کە باس کران .

وە ئەگەر دەوڵەتی ئیسلام نەبوو یان ئەگەر دەوڵەت لەم بـوارەدا پـەیڕەوی حـوکمی ئیسلامی نەکرد ئەوا موسڵمانان خۆیان ڕاسـتەوخۆ زەکاتەکـەیان دەدەن بـەو خەڵکانـەی کەوا شایستەین لەوانەی کە باس کراون لە ئایەتەکەی پێشوودا .

**پ٥٢ / مـن براکـەم داوای پـارەم لـێدەکات ژنـی پێبهێنێـت دەسـتی نـاڕوات زۆر کێشە لەگەڵ دایکم دروست دەکات بەڵام براکەم ئیمانی زۆر لاوازە ، ئایا من تا چەند گوناهبار دەبم یارمەتی ئەو بدەم ؟**

**. پرسیارێکی تریشم هەیە : من کەسوکارم زۆریان فەقیرن قـەت لـەوان نامێنێتـەوە کە یارمەتی کەسانی تر بدەم ، ئایا لەم کارەدا خوای گـەورە خێـرم بـۆ دەنوسـێ ؟ خـوا پاداشتان بداتەوە .**

وەڵام /

ئەگەر باوکت نەمابێت و ئەرکی بـەخێوکردن و سەرپـەرشـتیارێتی براکـەت لەسـەر تـۆ بێـت ئـەوا فـەرزە لەسـەر یارمـەتی بـدەیت و ژنـی بـۆ بهێنیـت ، بـەڵام ئەگـەر ئـەرکی بەخێوکردنی لەسەر تۆ نەبوو ئەوا یارمـەتی دانـی کـارێکی چـاکە و خێـرە و فـەرز نـی‌یـە لەسەر تۆ ، لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر بە مەبەستی ڕزگار کردنی دایکیشت بێـت لـە کێـشەی براکەت ئەوا فەرزە یارمەتی بدەیت بۆ ڕزگارکردنی دایکت .

---

[(١٠٤)] **تێبینی‌یەك :** تەنها ئەو ماڵ و سامانانە دەدرێنە (**بيت الـمال**) کە پێیان دەوترێت (**الأموال الظاهرة**) وەك : وشتر و گا و مەڕ و بزن .. بەڵام زێڕ و زیو و پـارە (واتـە : دراو) کـە پێیـان دەوترێـت (**الأمـوال الباطنـة**) ئەمانـە موسڵمان خۆی ڕاستەخۆ دەیانبەخشێتەوە بەسەر کەسانی شایستەدا و نادرێنە (**بيت الـمال**) .

وە ئامۆژگـاری براکـەت بکـە بـۆ چاکـسازی کردنـی خـۆی لـە بـواری دینـداری و خواپەرستیدا و هەوڵیش بدە کچێکی ئیماندار و چاکەکار و پۆشتەی بۆ بدۆزەرەوە بەڵکو نیوەی ئیمانەکەی پێ مسۆگەر بکات .

برام زەکات دان بە خزمی فـەقیر یـاخود یارمـەتی دانـی فـەقیری خـزم دوو پاداشـتی هەیە :

یەکەم : هی زەکات دانەکە یان خێر و صەدەقە کردنەکە .

دووەم : هی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی‌یەکە بە هۆی ئەو یارمەتی دانەوە .

**عن زينب امرأة عبد الله بن مسعود قالت : سألت رسولَ الله (ﷺ) أيجزئ عنـي مـن الصدقة النفقةُ على زوجي وأيتامٍ في حجري ؟ قالَ رسولُ الله (ﷺ) : لها أجران أجر الصدقة وأجر القرابة))[١٠٥].**

واتە : زەینەبی خێزانی (**عبدا** )ی کوڕی (**مسعود**) پرسیاری کرد لە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئایا پارەبەخشین بە سەر مێردەکەم و منداڵانێکی یەتیم کە لە ئامێزی منـدا دەژیـن زەکاتەکەم لە سەر دەخـات ؟ پێغەمبـەری خـواش (ﷺ) فـەرمووی : دوو پاداشـتی هەیـە پاداشتی زەکاتەکە و پاداشتی خزمایەتیەکە .

تۆ لەو کارە خێرت دەگات و تاوانبار نابیت .

*** زەکاتی خشڵی ئافرەتان :**

**پ٥٣ / ئایا خشڵی ئافرەتان ئەگەر بۆ خۆ ڕازاندنەوەی خۆشیان بە کاری بێنن زەکاتی تێدایە ؟**

وەڵام /

خشڵی ئافرەتان چ زێڕ بێت یان زیو ئەگەر چی بۆ خۆ ڕازاندنەوەی خۆشیان بە کاری بێنن ئەوا دەبێت زەکاتەکەی بدەن بەم سێ مەرجەی خوارەوە :

---

[١٠٥] **صحيح سنن ابن ماجه رقم : (١٨٤٣) .**

١ ـ ئەگەر خۆی خاوەنی بێت .

٢ ـ ئەگەر ساڵی بە سەردا تێپەڕ ببێت .

٣ ـ ئەگەر گەیشتبێتە ئەندازەی زەکات دان ، کە بریتی‌یە لە (٨٥) گرام یان (١٧) مسقاڵ زێڕی عەیار (٢٤) .

ئەگەر زێڕەکەی عەیار (١٨) یان (٢١) بوو ئەوا دەبێت حیسابی بکات لای کەسانی شارەزا لەم بوارەدا بۆ ئەوەی بزانێت چەندێك زەکاتی تێدایە و چەندێك زەکاتی دەکەوێتە سەر ، یان دەیشکێنێتەوە بە پارە بە نرخی ڕۆژ جا ئەگەر بەو پارەیە توانی (٨٥) گرام یان (١٧) مسقاڵ زێڕی عەیار (٢٤) بکڕێت ئەوا دەبێت زەکاتەکەی بدات .

بەڵگەی واجبێتی زەکات دانی خشڵی ئافرەتان ئەگەر چی بۆ خۆ ڕازاندنەوەی خۆشیان بێت بریتی‌یە لەم فەرموودەیە :

**عن عائشةَ زوجِ النبي (ﷺ) قَالَت : ((دخلَ علّي رسولُ الله (ﷺ) فَرأى في يدي فَتخـات من ورقٍ فَقَالَ : ما هذَا يا عائشةُ ؟ فَقُلت : صنعتهن أتزين لَك يا رسولَ الله ، قَالَ : أتـؤدين زكَاتهن ؟ قُلت : لاَ أو ما شاءَ الله ، قَالَ : هو حسبك من النار))[١٠٦].**

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام و بینی چەند کلکەوانەیەکی زیو لە دەستم دایە و فەرمووی : ئەمە چی‌یە ئەی عائیشە ؟ وتم : دروستم کردووە بۆ ئەوەی خۆمی پێ‌بڕازێنمەوە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، فەرمووی : ئایا زەکاتەکەی دەدەیت ؟ وتم : نەخێر مەگەر خوا ویستی لێبێت ، فەرمووی : ئەگەر زەکاتەکەی نەدەیت بەسە بۆ ئەوەی بتباتە ئاگرەوە .

---

[١٠٦] صحيح أبي داود رقم : (١٣٨٤) .

**پ٥٤ / من بە هۆی هەبوونی حەملەوە نەمتوانی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرم ، ئایا قەرزدانەوەم لەسەرە یان دەبێت فدییە بدەم یان هەردووکیان ؟**

وەڵام /

ئافرەتی سك پڕ و شیردەر ئەگەر لە خۆیان و منداڵەکانیان بترسن و لە تاوانایاندا نەبێت ڕۆژوو بگرن ئەوا بە ڕۆژوو نابن و هەموو ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدەن و قەزاکردنەوەیان لەسەر نی‌یە .

(**ابن عباس**) فەرموویەتی : **((الحبلى والمرضع إذا خافتا أفطرتا وأطعمتا كل يومٍ مسكيناً ، ولا قضاءَ عليهما))**[107].

واتە : ئافرەتی سك پڕ و شیردەر ئەگەر لە خۆیان و منداڵەکانیان ترسان ئەوا بە ڕۆژوو نابن و بۆ هەموو ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدەن .

وە لە (**مالك**)ەوە دەگێڕنەوە ئەویش لە (**نافع**)ەوە کە (**ابن عمر**) پرسیاری لێکرا سەبارەت ئافرەتی سك پڕ ئەگەر لە منداڵەکەی ترسا ، (**ابن عمر**)یش فەرمووی : **((تفطر وتطعم مكانَ كُل يومٍ مسكيناً مداً من حنطة))**[108].

واتە : ڕۆژوو ناگرێت و بەرامبەر بە هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدات (**مد**)یك لە گەنم .

وە لە (**ابن عمر**)ەوە دەیگێڕینەوە کە فەرموویەتی : **((الحاملُ والمرضع تفطر ولا تقضي))**[109].

واتە : ئافرەتی سك پڕ و شیردەر ڕۆژوو ناگرێت و قەزاشی ناکاتەوە.

وە لە ڕێگەیەکی ترەوە : **((أن امرأته سألته وهي حبلى ، فقالَ : أفطري وأطعمي عن كل يومٍ مسكيناً ولا تقضي))**[110].

---

[107] تفسير الطبري رقم : (٢٧٥٢) وتفسير ابن أبي حاتم الرازي رقم : (١٦٦٠) .

[108] الموطأ للإمام مالك رقم : (١٠٨٩) ومسند الشافعي رقم : (١٠٥٣) والسنن الكبرى للبيهقي رقم : (٨٣٣٥) .

[109] سنن الدارقطني رقم : (٢٤١٠) .

[110] سنن الدارقطني رقم : (٢٤١٣) .

واتە : خێزانەکەی (**ابن عمر**) لە کاتێکدا کە سك پڕ بوو پرسیاری لێ ی کرد ، ئەویش فەرمووی : بەڕۆژوو مەبە و بۆ هەموو ڕۆژێك خواردنی فەقیرێك بدە و بە قەرزیش مەیگێڕەوە .

وە لە ڕێگەی سێیەمەوە : **عن نافعٍ قَالَ : ((كَانت بِنت لابنِ عمر** (رضي الله عنه) **تحت رجلٍ من قُريش ، وكَانت حاملاً ، فَأصابها عطَش رمضان ، فَأمرها أَنْ تفْطر وتطْعم عن كُل يوم مسكيناً))**[111].

واتە : کچێکی (**ابن عمر**) خێزانی پیاوێکی (**قُریش**)ی بوو ، وە سك پڕ بوو ، بە هۆی ئەوەوە تووشی تنویەتی بوو لە ڕەمەزاندا ، ئەویش فەرمانی پێ ی کرد کەوا ڕۆژووەکەی بشکێنێت و بۆ هەموو ڕۆژێك خواردنی فەقیرێك بدات .

وە تەنها فیدیە دانی لەسەرە بە بێ قەزاکردنەوە :

لە (ابن عباس) ەوە دەگێڕنەوە کە یەکێك ـ لەو کەنیزەکانەی کە منداڵی لێی هەبوو (**أم ولد**) ـ بە سك پڕی یان شیردەری بینی و فەرمووی : **((أنت من الـذين لا يطيقُـونَ ، عليك الجزاءُ ، وليس عليك القضاءُ))**[112].

واتە : تۆ لەوانەی کە توانای ڕۆژوویان نی یە ، فیدیەدانت لە سەرە نەك قەزا کردنەوە .

**پ٥٥ / من کوڕێکی دانیشتووی بریتانیام لە کاتی هاتنمدا ڕەمەزان بوو نەمتوانی بە ڕۆژوو ببم ، ئایا دەتوانم هەموو ڕۆژانی دوو شەمە و پێنج شەممە بە ڕۆژوو ببم چونکە ڕەمەزان لە ڕێگا بووم ؟**

وەڵام /

برام دەبێت تۆ هەموو ئەو ڕۆژانە بە قەرز بدەیتەوە ، وە مەرجیش نی یە هەمووی لە ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممەدا بێت بەڵکو لە ڕۆژانی تریشدا دەتوانیت ئەو ڕۆژانە بە

---

[111] سنن الدارقطني رقم : (٢٤١٤) .

[112] سنن الدارقطني رقم : (٢٤٠٧) .

قەرز بدەیتەوە ، بەڵام ئەگەر لە ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممەدا بێت ئەوا چاك ترە ،
**وا أعلم** .

**پ٥٦ / ئایا حوکمی بەکارهێنانی مەعجونی دان چیە بۆ ڕۆژووان لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا ؟**

وەڵام /

بەکارهێنانی مەعجونی دان بۆ ڕۆژووان هیچی تێدا نیە ئەگەر دانەبەزێت بۆ ناو (**معدة**) گەدەی .

چونکە ئاو ڕادانە ناو دەم لە کاتی بە ڕۆژوو بووندا دروستە بەمەرجێك (غەرغەرەی پێ نەکات و نەیگەیەنێتە قوڕگی) ، هەروەها بەکارهێنانی (سیواك)یش دروستە .

کەواتە بەکارهێنانی مەعجونی دانیش دروستە بەمەرجێك وریا بێت و نەگاتە قوڕگی .

### وەرگرتنی مارەیی زۆر :

**پ٥٧ / ئایا دروستە لە کاتی زەواج کردندا مارەیی زۆر وەربگریت ؟**

**وەڵام /**

مەبەست لە ژن هێنان و شوو کردن دروست کردنی خێزانێکی بەختەوەرە نەك (کڕین و فرۆشتنی کچ و پارە پێ پەیدا کردن) ! ! !

بە ڕاستی لە ئیسلامدا کچ زۆر لەوە ڕێزدار و قورس و سەنگین ترە کە بە پارە یان بە زێڕ و شتومەك بەها و وەزن بکرێت ، بۆیە دەبێت ئەوە بزانرێت ئەو مارەییەی کەوا بۆ کچ دادەنرێت لە کاتی بە شوودانیدا بریتی نییە لە نرخی کچەکە بەڵکو دیاری و بەخشیشێکە پێشکەش بە کچ دەکرێت بۆ ئەوەی دڵی پێخۆش بکات و هەندێك شتومەکی پێبکڕێت وەك زێڕ و جلوبەرگ بۆ ئەوەی خۆی پێبڕازێنێتەوە چونکە ئافرەتان زۆر حەزیان لە شتی ڕازاوە و جوان و ناسکە و ئەمەش شتێکی سروشتییە لە ئافرەتاندا وەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي ٱلۡحِلۡيَةِ وَهُوَ فِي ٱلۡخِصَامِ غَيۡرُ مُبِينٖ ﴿١٨﴾ ﴾ **[الزخرف]**

.

واتە : ئافرەتان لە نێو شتی ڕازاوەدا پێگەیشتوون .

بەڵگەش بۆ ئەوەی کەوا مارەیی دیاری و بەخشیشە نەك نرخ و بەهای کچ خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗ ﴿٤﴾ ﴾ **[النساء]** (**نِحْلَةً : أي هدية) .**

واتە : مارەیی بدەن بە ئافرەتان وەك دیاری .

وە پێوەر بۆ بە شوودانی ئافرەت بریتییە لە دین و ئەخلاق نەك پارە و ناوبانگ و پلەوپایە ! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إذَا جاءَكُم من ترضونَ دينه وخلُقَه فأنكحوه إلا تفعلُوا تكُن فتنةٌ في الأرض وفَساد [عريض]))**[113] .

---

[113] **صحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٨٤) .**

واتە : ئەگەر كەسێك هات بۆ خوازبێنی ژن لێتان لە دین و ئەخلاقی ڕازی بوون ئەوا ژنی بدەنێ ، ئەگەر وا نەكەن ئەوا فیتنە و ئاشوب و فەساد و بەدڕەوشتیيەكی گەورە ڕوودەدات لە زەویدا .

وە ئیسلام هانی گەنجانی داوە بۆ ژن هێنان بۆ ئەوەی خۆیان لە تاوان بپارێزن وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((يا معشر الشبابِ من استطَاع منكُم الْباءَةَ فَلْيتزوج ، فَإنه أغَض للْبصر ، وأَحصن للفَرج))[114].**

واتە : ئەی گرۆی گەنجان هەر یەك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە ئەوا با ژن بێنێت چونكە ژن هێنان دەبێتە مایەی چاو گرتنەوە لە سەیر كردن و دامێن پاراستن لە داوێن پیسی .

بۆیە پێویستە هاوكاری گەنجان بكرێت بۆ ژن هێنان بە هەموو شێوەیەكی شەرعی ، یەكێك لەو شێوانە ئەوەیە كە مارەیی كچانیان لە سەر قورس و زۆر و گران نەكرێت تاوەكو بتوانن ژن بهێنن و خێزانێكی دیندار و بە ئەخلاق و بەختەوە پێك بێنن .

وە كار ئاسانی كردن لە بە شوودانی كچدا و كەم كردنەوەی مارەییيەكەی نیشانەی بەرەكەت و خێر و فەڕی ئەو ئافرەتەیە :

**عن عروةَ بنِ الزبير عن عائشةَ (رضي الله عنها) أنها قَالَت : قَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((إن من يمنِ الْمرأة تيسِير خطْبتها وتيسِير صداقها وتيسِير رحمها))[115].**

**قَالَ عروةُ : يعنِي بتيسر رحمها للْولاَدة .. قَالَ عروةُ : وأنا أَقُولُ من عندي : (مـن أولِ شؤمها أنْ يكْثُر صداقُها)[116].**

---

[114] صحيح البخاري رقم : (٥٠٦٦) وصحيح مسلم رقم : () .

[115] مسند الإمام أ د رقم : (٢٥٢١٣) واللفظ له ، والـمعجم الأوسط للط انـي رقم : (٣٦١٢) ، ومستدرك الـحاكم رقم : (٢٧٣٩) والسنن الك ى للبيهقي رقم : (١٤٧٤٦) وصحيح الـجامع الصغ رقم : (٢٢٣٥) .

[116] مستدرك الـحاكم رقم : (٢٧٣٩) والسنن الك ى للبيهقي رقم : (١٤٧٤٦) .

واتــه : پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) فەرموویــەتی : بەڕاســتی لــه بەرەكــەتی ئەوەیــه كــه خوازبێنی كردنی و بە شوودانی ئاسانكاری تێدا بكرێت و **مارەییەكەی سووك و كەم بێت** و منالّدانی ئاسان بێت بۆ منداڵ بوون .

(**عروة**)ی كـوڕی (**الزبیر**)ی خوشـكەزای (**عائــشة** رضي الله عنها) لـه پـاش گێڕانـەوەی ئـەم فەرموودەیەوە فەرموویەتی : مەبەسـت بـه " **وتیسیر رحمها** " : ئەوەیـه كـه " منالّـدانی ئاسان بێت بۆ منداڵ بوون " ..

هەروەها (**عروة**) فەرموویەتی : وه له لایەن خۆمەوە دەڵێم : **لـه یەكـەمین بـێخێری ئافرەت ئەوەیە كه مارەییەكەی زۆر بێت .**

**قال المــناوي في شرح هذا الــحديث : (" إن من يمن المرأة " أي بركتها ، " تيــسير خطبتها " بالكسر أي سهولة سؤال الخاطب أولياءها نكاحها وإجابتهم بسهولة بلا توقف ولا اشتراط ، " وتيسير صداقها " أي عدم التشديد في تكثيره ووجدانه بيد الخاطب فاضــلاً عــن حاجته ، " وتيسير رحمها " أي للولادة بأن تكون سريعة الحمل كثيرة النسل)[117].**

واته : مەبەست به : " **يمن المرأة** " : بەرەكەت و خێر و فەڕی ئەو ئافرەتەیە ..

وه مەبەست به : " **تيسير خطبتها** " : ئەوەیە كه خوازبێنیكار بـه ئاسـانی خـوازبێنی ئەو ئافرەتە بكات له كەسـوكار و سەرپەرشـتیارەكانی و ئـەوانیش بـه ئاسـانی وەڵامـی بدەنەوە بە بێ وەستان و مەرج لەسەر دانان ..

وه مەبەست به : " **وتيسير صداقها** " : ئەوەیە كـه **مارەییەكـەی** زۆر قـورس و گـران نەكەنــەوە لەســەر خوازبێنیكارەكــەی و هــەر ئەوەنــدەی لــێوەربگیرێت كــه زیــاد لــه پێویستییەكانی هەیەتی ..

وه مەبەست به : " **وتيسير رحمها** " : ئەوەیە كـه منالّـدانی ئاسـان بێـت بـۆ منـداڵ بوون بەوەی كه زووزوو سك و حەملی بۆ پەیدا ببێت و منداڵ و وەچەی زۆر بێت .

---

[117] التيسير بشرح الــجامع الصغير : (1 / 713) .

وە پێویستە ئەوەش بزانرێت کەوا ئەمە [واتە : کەمی مارەیی ئافرەت] لە ڕێز و بەهای ئافرەتان کەم ناکاتەوە بەڵکو هاوکاری کردنی ئەوانیشە بۆ شوو کردن و ئارام گرتن لە ماڵی خۆیدا چونکە ئەویش مافی خۆیەتی بچێتە ماڵی خۆی و لە سایەی ژیانی هاوسەرگیریدا بحەسێتەوە .

وە بە پێچەوانەوە هەم کوڕان و هەم کچانیش دووچاری ئەوە دەکرێنەوە کەوا پەنا بۆ کاری حەرام ببەن ئەگەر کاری ئاسانی نەکرێت لە پرۆژەی هاوسەرگیریدا .

## زەواج بە نیەتی تەڵاق ؟

**پ ٥٨ / بەڕێزان من لە وڵاتێکی فەساددام زەروری منی گەیاندوەتە ئێرە ئەوەی زۆر زۆر دەترسم توشی خراپە ببم خۆمم پێ ڕاناگیرێ ، ئایا ئەتوانم ئەگەر کچەکە ڕازی بێت بۆ ماوەی چەند ساڵێک بیهێنم یان پێی نەڵێم کە وازی لێدێنم لەسەر فەتواکەی (ابن باز) کە خۆم گوێم لێ بوو دەڵێ دروستە، وە ئەگەر کچەکە باش بێت لەگەڵم إن شاو الله قەت وازی لێناهێنم ، بەڕێزتان پێتان چۆنە ؟ خێرتان دەگات وەڵامم بدەنەوە چونکە زۆر زۆر ئیلتیزامم هەیە بە دینەوە با توشی هەڵە نەبم ، خوا پاداشتان بداتەوە .**

وەڵام /

پرسیارەکەت دوو پرسیاری لێدەکەوێتەوە :

**أ / ئایا زەواج بۆ ماوەیەکی کاتی دیاری کراو دروستە ؟**

**ب / ئایا زەواج بە نیەتی تەڵاق دان لە داهاتوودا دروستە ؟**

لە وەڵامی یەکەمیاندا دەڵێم : ئەو شێوازە زەواجە کە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو دەکرێت (چ بۆ ماوەی هەفتەیەك بێ یان مانگێك یان ساڵێك یان کەمتر یان زیاتر) لە نێوان کوڕ و کچێکدا پێی دەوترێت (زەواجی موتعە) ئەوەیە کە شیعەکان دەیکەن ، ئەم جۆرە زەواجە حەرامە بە پێی قورئان و فەرموودە و کۆڕای زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە .

**قَالَ علي (رضي الله عنه) قَالَ لابن عباسٍ (رضي الله عنه) : ((إن النبي (ﷺ) نهى عن نِكَاح الْمتعة وعن لُحوم الْحمر الأهلية يوم خيبر))[118].**

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) زەواجی موتعە و گۆشتی کەری ماڵی قەدەغە و حەرام کردووە .

برام تۆ لە پرسیارەکەتدا دەڵێیت : (ئەگەر کچەکە ڕازی بێت بۆ ماوەی چەند ساڵێك بیهێنم) ! ! ! ئەمە دەقاودەق زەواجی موتعەیە و حەرامە .

وە لە وەڵامی دووەمیاندا دەڵێم : زەواج بە نیەتی تەڵاق دان لە داهاتوودا حەرامە و دروست نی‌یە چونکە فێڵ و غەشی تێدا لەگەڵ کچەکەدا ، حەرامێتی فێڵ و غەشیش لە ئیسلامدا بەلێگەی زۆری لەسەر هاتووە ئاشکراتریان فەرموودەکەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە فەرموویەتی : **((من غَشنا فَلَيس منا))**[119].

واتە : هەر کەسێ فێڵ و غەشمان لێبکات ئەوا ئەو کەسە لە ئێمە نی‌یە .

وە ئەم جۆرە زەواجەش لە ناوەڕۆکدا هەر بریتی‌یە لە زەواجی موتعە بەڵام ئەوەندە هەیە بە کچەکە ناوترێت .

کەواتە هەردوو شێوازەکەیان حەرامە و دروست نی‌یە .

بڕوانە کتێبی (**فقه السنة**)ی سيد سابق بابەتی : **(العقد على الـمرأة و نية الزوج طلاقها) : (٢ / ١٣٣)** .

وە کۆتایی وەڵامەکەدا دوو ئامۆژگاریت دەکەم :

یەکەم : گەڕانەوەت بۆ نێو وڵاتی ئیسلام و موسڵمانان و بە جێهێشتنی وڵاتی کافر و بێ باوەڕی و بێ ئەخلاقی ، چونکە نیشتەجێبوون لە وڵاتی بێباوەڕاندا حەرامە و یەکێکە لە تاوانە گەورەکان (بڕوانە وەڵاتی پرسیارەکانی تری گۆشەی فەتوا) .

---

[118] **صحيح البخاري رقم : (٥١١٥) وصحيح مسلم رقم : () وصحيح سنن النسائي رقم : (٤٣٣٤) واللفظ له .**

[119] **صحيح مسلم رقم : () .**

دووەم : هەڵبـژاردنی ئـافرەتێکی بـە دیـن و بـە ئـەخلاق و پێکـەوەنانی خێزانێکـی بەختەوەری بەردەوامی دوور لە فێڵ و حەرام .

**پ٥٩ / من سونیم ئەتوانم کچێکی شیعە بکەم بە هاوسەر بە مەرجێ نەبێ بە سونی ؟**

وەڵام /

نەخێر نابێت ، چونکە بیروباوەڕ و پەرستش و هەڵوێستی ئەو کچە لە دوو حاڵەت بەدەر نیە :

١ ـ یان لەگەڵ خوادا جگە لە خواش دەپەرستێت وەك پەرستنی ئیمامەکان و باوەڕبوون بەوەی کەوا ئەوانیش سود و زیانیان بە دەستە و هەڵوێستی بەرامبەر بە صەحابەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خراپە بە تایبەت بەرامبەر بە (**أبو بکـر و عمـر و عثمان** ﭫ) .

ئەگەر ئاوەها بوو ئەوا ئەو کەسە موشریکە و بە هیچ شێوەیەك حەڵاڵ نیە بۆ ئیماندارێکی یەکخواپەرست و هەڵوێست پاك بەرامبەر بە صەحابەکان .

٢ ـ وە یان بیدعە چیە و لە سەر سوننەت ناڕوات .. ئەوا لەم حاڵەتەیشدا دروست نیە بۆ کەسێکی سوننی کەوا کچێکی بیدعە چی مارە بکات .

کەواتە بە دوای کچێکی یەکخواپەرست و شوێنکەوتەی سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بگەڕێ ئەگەر دەتەوێت تووشی خەیری دونیا و قیامەت بیت .

*** ئەو شتانەی کە فرۆشتنیان حەرامە :**

**پ ٦٠ / ئایا فرۆشتنی شتومەک و بابەتی تایبەت بە (سەری ساڵ)ەوە حەرامە؟**

وەڵام /

فرۆشتنی شتومەك و بابەتی تایبەت بە (سەری ساڵ)ەوە حەرامە ، بۆیە دروست نىیە بۆ موسڵمان کاری لەم شێوازە ئەنجام بدات و هاوکاری گاور و خاچپەرستان و کل و شوێنکەوتە و چاولێکەرەکانیان بکات لە سەر تاوان و خراپە چونکە ئەو کارەی ئەوان تایبەتە بە گاورەکان و بە هیچ شێوەیەك دروست نىیە بۆ موسڵمانان بەشدار بن لەگەڵیاندا ، بە بەڵگەی ئەم ئایەتەی قورئان : ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢﴾ **[المائدة]** .

واتە : هاوکاری یەکتر بکەن لە سەر چاکەکاری و خۆپارێزی لە تاوان وە هاوکاری یەکتر مەکەن لە سەر خراپە و دەست درێژی ، وە لە خوا بترسن چونکە بەڕاستی سزای خوا توندە .

**پ ٦١ / ئەگەر بکرێت ڕای جەنابتان لە بارەی هێنانی کەلوپەل بە قیست و پێدانی حوکمی چیە ؟**

وەڵام /

کڕینی کەلوپەل و شتومەك بە قیست حەڵاڵە بە مەرجێك زیادە نەخرێتە سەر نرخەکەی ، بۆ نموونە ئەگەر بڵێت بە نەقدی بە سەد هەزار و بە قەرزیش بە سەد و دە هەزار ئەوا نابێت و دەبێت بە ریبا ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((من باع بيعتين في بيعة فله أوكسهما أو الربا))**[120].

واتە : هەر کەسێك دوو کڕین و فرۆشتن لە یەك مامەڵەدا بکات ، ئەوا یان کەمترینیانی بۆ دەبێت یان ریبا ، بە واتایەکی تر : بفرۆش دەڵێت : بە نەقدی بە (٥٠٠)

---

[120] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٣٢٦) .

هەزار دینار ، وە بە قەرزیش بە (٥٥٠) هەزار دینار ، جا ئەگەر کڕیار بە (٥٠٠) دینار بیکڕێت کە نرخە کەمەکەیە ئەوا دروستە ، بەڵام ئەگەر بە (٥٥٠) دینار بیبات بە قەرز ئەوا دەبێت بە ریبا .

**پ ٦٢ / بە ناوی خوای گەورە : خوای گەورە پاداشتی بە خێری بەرێزتان بداتەوە ، برایان من پرسیاێکم هەیە ئەویش : ئێستا کۆمپانیایەک دروست بووە کە بە قەرز پارە دەداتە گەنجان بۆ ئەوەی بۆ زەواج بە کاری بهێنن کە بڕەکەی (٣٠٠٠) دۆلارە بەڵام بە مەرجێ دەبێ هەرکەس بەشداری بکات تا شەش مانگ مانگانە بڕی (٣٠) دۆلار بدات پاش ئەو شەش مانگە ئینجا بۆی هەیە ئەو (٣٠٠٠) دۆلارە وەربگرێتەوە پاشان مانگانە پێویستە بڕی (٣٠) دۆلار بدات تا تەواوی پارەکە دەداتەوە ؟**

وەڵام /

نابێت قەرزی لێبکرێت چونکە مەرجی داناوە کەوا دەبێت پێش ئەوەی قەرزەکە بدات شەش مانگ تۆش قەرز بدەیت بە ئەو کۆمپانیایە ، ئەمەش حەرامە بە پێی ئەم بنەمەیە **: (كل قرضٍ جر نفعاً فهو ربا)** واتە : **هەموو قەرزێك سوودێکی بەمەرج گیراو بکێشێت ئەوا ریبایە** ، چونکە ئەوان ئەو شەش مانگەدا سوود لە پارەکەی تۆ دەبینن ئەنجا قەرزت دەدەنێ کەواتە نابێت ، زانایان فەرموویانە : **(كُـل قرضٍ جـر نـفْـعاً فـهو ربا)** .

واتە : **هەموو قەرزێك سوودێکی بە مەرج گیراو لەگەڵ خۆیدا بێنێت بۆ خاوەنەکەی ئەوە ریبایە** ، بڕوانە کتێبی : (**حوکم و ئادابەکانی قەرزدان و قەرزکردن و قەرزدانەوە**) نووسینی مامۆستا (محمد عبد الرحمن کەلاری) .

**پ٦٣ / من نزیکەی حەوت ساڵە لە بریتانیا دەژیم ، وە ئێستا خێزانم پێکهێناوە دەمەوێ خانوو بکڕم بە پارەی بانک بۆ ئەوەی تیایدا بژیم نەک بۆ کڕین و فرۆشتن ، پرسیارەکەم ئەوەیە : ئەگەر پارە لە بانک وەربگرم حەرامە یان حەڵاڵە ؟**

وەڵام / قەرز کردن لە (بانك) ئەگەر بە بێ بەرامبەر بێت دروستە وەك چۆن لە تاکە کەسێك قەرز بکەیت وایە ، بەڵام ئەگەر لە برامبەر ئەو قەرزەدا زیاتری لێت وەرگرتەوە

ئەوا دەبێت بە ریبا (سوو) بۆ هەر چی مەبەستێك بێت ، چونکە ئەگەر کارێك حەرام بێت جیاوازی لە مەبەستدا حوکمەکەی ناگۆڕێت .

کەواتە قەرز کردن لە (بانك)ێك کەوا بە ریبا قەرز دەدات حەرامە ئەگەر بە مەبەستت مامەڵە کردن بێت بەو پارەیە یان بۆ خانو دروست کردن بێت یان بۆ ژن هێنان بێت هیچ جیاوازی‌یەکی نی‌یە هەمووی هەر حەرامە .

**پ ٦٤ / من خانویەکم هەیە خستومەتە سەر خۆم کەشفی زەیبە زۆریان لەسەر دانا بۆیە منیش بڕێک پارەمدا بە فەرمانبەرەکان بۆ ئەوەی کەمی بکەنەوە چونکە بۆ فرۆشتن نی‌یە ئایا تاوانبارم ؟ ئەگەر تاوانبارم چی بکەم ؟**

وەڵام /

بەڵێ تاوانبار دەبیت بەو کارە و نابیت ڕەشوە و بەرتیل بدەیت بە فەرمانبەرەکان بۆ ئەوەی نرخی باجی **(ضريبة)** کەشفت لە سەر کەم بکەنەوە ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لَعنةُ الله علَى الراشي والْمرتشي))**[121].

واتە : نەفرەتی خوا لەو کەسەی کە بەرتیل دەدات و ئەوەش کە دەیخوات .

وە دەبێت تەوبە بکەیت و پەشیمان بیتەوە لەو کارە و جارێکی دووبارەی نەکەیتەوە .

**پ٦٥ / من ئافرەتێکم لە دەرەوەی وڵات دەژیم وە لە کتێبخانەیەک کار دەکەم ئەم کتێبخانەیە جۆرەها کتێبی باش و خراپی تێدایە واتە شەرعی و ناشەرعی بەڵام کتێبی ناشەرعی زۆر زۆرترن هەروەها ئینجیل و تەوراتی زۆر تێدایە ، وە ئێمە ئەم کتێبانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوێزینەوە ، جا پرسیارەکەم ئەوەیە : تا چەند بۆ ئێمەی موسڵمان دروستە کە لەم شوێنەدا کار بکەین ؟ لەگەڵ ڕێزم بۆ ئێوەی بەڕێز ..**

وەڵام /

[121] **صحيح البخاري رقم : (٥١١٥) وصحيح مسلم رقم : () .**

خوشکی بەڕێز درووست نیە بۆ هیچ موسڵمانێك لە شوێنێکدا کار بکات کەوا کارێکی ناشەرعی تێدا ئەنجام بدرێت وەك ئەو کارەی کە تۆ باست کردووە ، چونکە بە هۆی خوێندنەوەی ئەو کتێبە خراپانەوە بە تایبەت (تەوارت و ئینجیل کە هەزاران کوفری تێدایە) خوێندەواری ئەو کتێبانە گومڕا دەبن و تووشی کوفر و تاوان دەبن بۆیە نابێت لەو کتێبخانەیەدا کار بکەیت بەڵکو دەبێت بەدوای کارێکی حەڵاڵدا بگەڕێیت ، وە دڵنیاش بە ئەگەر تۆ لە بەر ڕەزامەندی خوا واز بێنیت لەو کارە خراپە ئەوا خوای گەورە بۆتی دەگۆڕێتەوە بە کارێکی چاکتر ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((من ترك شيئاً لله عوضه الله خيراً منه))**[١٢٢].

واتە : هەر کەسێك واز بێنێت لە شتێك لە بەر خوا ئەوا خوا بۆی دەگۆڕێتەوە بە شتێك لەوە باشتر .

---

[١٢٢] رواه أحمد بسند صحيح قاله الألباني "جلباب المرأة المسلمة" ص : (٤٧) .

**پ ٦٦ / ئایا خواردنی مریشکی بەرازیلی و ڕانی ئەمریکی دروستە ؟**

**وەڵام /**

خواردنی سەربڕاوی (جولەکە و گاور : **أهل الكتاب**) حەڵاڵە بۆ موسڵمانان ، بەڵام سەربڕاوی جگە لەوان لە بێباوەڕان (وەك شیوعیەکان و مانگا پەرستان و خور و بت و بۆزا پەرستان) حەرامە و دروست نییە ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ ﴿٥﴾ ﴾ [المائدة] .

واتە : ئەمڕۆ حەڵاڵ کرا بۆتان ئەو شتانەی کە پاکن ، وە سەربڕاوی ئەوانەی کەوا کتێبیان پێ دراوە (جولەکە و گاور) حەڵاڵە بۆتان و سەربڕاوی ئێوەش حەڵاڵە بۆ ئەوان .

ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لە سەر حەڵاڵێتی سەربڕاوی ئەوانەی کەوا کتێبیان پێ دراوە (جولەکە و گاور) (**طعامهم** واتە : سەربڕاویان) ، ئەمەش ئەو مریشك و گۆشتانە دەگرێتەوە کەوا بە مەبەستی بازارگانی پێکردن سەردەبڕێن و دەفرۆشرێن ، بەڵام ئەگەر ئەو سەربڕاوانە بە بۆنەی جەژن و یادەوەری و بەرزڕاگرتنی دروشمەکانی ئاینی خۆیانەوە کراون ئەوا خواردنیان حرامە (با ناوی خواشی لە سەر بێنن) و ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ...﴿٣﴾ ﴾ [المائدة] .

واتە : حەرام کراوە لە سەرتان : مردارۆبوو ، و خوێن ، و گۆشتی بەراز ، و ئەوەی کە بۆ جگە لە خوا سەردەبڕێت .

هەروەها ئەگەر زانرا و دڵنیا بوویت کەوا ئەو سەربڕاوانە دەکوژرێن چ بە نەتڵەی کارەبایی بێت یان بە خستنە ناو ئاوی گەرمەوە بێت ئەوا ئەمەش حەرامە و ناخۆرێت بە بەڵگەی ئەم ئایەتە : ﴿ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ ﴿٣﴾ ﴾ [المائدة] .

واتە : حەرام کراوە لە سەرتان : خنکێنراو ، و تاسێنراو ، و ئەوەی کە دەکەوێتە خوارەوە و مرداردەبێتەوە ، و ئەوەی کە شاخی لێدەدرێت و مرداردەبێتەوە ، و ئەوەی

کە دڕندە لێی خواردووە ئیللا ئەوە نەبێت کە دەگەنە سەربڕینیدا ، وە ئەوەی کە بۆ جگە لە خوا سەردەبڕێت .

کەواتە ئەوانەش کە مرداردەبنەوە پێش سەربڕین خواردنیان حەرامە چ موسڵمان سەرپەرشتی سەربڕینی بکات یان گاور و جولەکە .

بەڵام ئەگەر وانەبوو ئەوا خواردنیان حەڵاڵە با لە وڵاتی گاور و جولەکەشەوە هێنرابێت وەك (بەرازیل و ئەمریکا)* .

**پ ٦٧ / ئایا خواردنی مریشکی بازیان حەرامە ؟**

**وەڵام /**

نەخێر حەرام نیيە چونکە موسڵمانان سەرپەرشتی سەربڕینی مریشکەکان دەکەن و لە کاتی سەربڕینیاندا ناوی خوا دێنن و (**بسم ا**) دەڵێن ، من خۆم لە کاتێکدا کە مریشکە سەربڕاوەکانی قەسابخانەی بازیان کەوتە بازاڕەوە پرسیارم کرد لە برادەرێکم کە خەڵکی بازیان بوو سەبارەت بەم باسە ، ئەویش وتی : (موسڵمانان سەرپەرشتی سەربڕینی مریشکەکان دەکەن و لە کاتی سەربڕینیاندا ناوی خوا دێنن و (**بسم ا**) دەڵێن) ، کەواتە خواردنی حەڵاڵە .

**پ٦٨ / ئایا لە چ کاتێکدا دروستە گۆشتی سەگ و بەراز و مرۆڤ بخورێت ؟**

بە هیچ شێوەیەك و لە هیچ کاتێکدا دورست نیيە (گۆشتی سەگ و بەراز و مرۆڤ بخورێت) ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ کەوتە حاڵەتێکەوە کە لە برساندا بگاتە حاڵەتی سەرەمەرگ و دوای گەڕان و هەوڵدان هیچی دەست نەکوێت بیخوات ئیللا شتە حەرام کراوەکان نەبێت ئەوا دروستە بۆی ئەوەندەی لێبخوات کەوا لە حاڵەتی مردن ڕزگاری

* **تێبینیيەك :** بە پێی ئەو زانیاریانەی کە لە نێو هەندێك گۆڤار و سایتەکاندا وەك ڕاپۆرت خراونەتە ڕوو سەبارەت بە (ئاژەڵ و پەلەوەرە سەربڕاوەکانی وڵاتانی بیانی) و ئەنجا بە پێی فەتوای هەندێك لە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەی ئەم سەردەمەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێت کەوا ئەو (ئاژەڵ و پەلەوەرانە ..) لە پێش سەربڕینیان دەکوژرێن و ئەنجا سەرەکانیان لێ دەکەنەوە !!!

لەبەر ئەوە بەڕاستی ئێستا وا دەبینم کەوا ئەو (ئاژەڵ و پەلەوەرانە ..) لە حەرامەوە نزیك تر بن ! وە ئەگەر حەرامیش نەبن ئەوا دەچنە ژێر بابەتی شتە گومانلێکراوەکانەوە (المتشابهات) کە دەبێت خۆتیان لێبەدوور بگریت .

بکات و نەمرێت ، (کەواتە نابێت زۆری لێبخوات) بەڵکو بە ئەندازەی پێویست لێی دەخوات ، خوای گەورە لەم بارەیەوە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ ﴾ [البقرة] .

واتە : بەڕاستی حەرام کراوە لە سەرتان مردارۆبوو و خوێن و گۆشتی بەراز و ئەوەی کە بۆ جگە لە خوا سەردەبڕێت ، جا ئەگەر کەسێك ناچار بوو لەوانە بخوات بێ ئەوەی زیادەڕەوی بکات و لە سنوور دەرچێت ئەوا تاوانبار نابێت ، بەڕاستی خوا لێبووردە و بە بەزییە .

ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ ئەو **(قاعـدة)**یە کە زانایان فەرمویانە : (**الـضرورات تبـيح الـمحظورات**) واتە : (پێویستیەکان حەرامکراوەکان حەڵاڵ دەکەن) ، بەڵام ئەمەش بەرەهایی نییە بەڵکو بەند کراوە بەوەی کە بە ئەندازەی پێویست بێت بۆیە زانایان فەرمویانە : (**الضرورة تقدر بقدرها**) واتە : (پێویستیش ئەندازەی بۆ دادەنرێت) .

**تێبینی** : ئەگەر مرۆڤ ناچار بوو بۆ خواردنی شتە حەرام کراوەکان بە مەبەستی ڕزگار بوونی لە حاڵەتی مردن ، ئەوا تا پێیبکرێت دەبێت لەو شتانە بخوات کە لە ئەسڵدا حەڵاڵن بۆ نمونە تاوەکو (مردارۆبوو) هەبێت نابێت گۆشتی بەراز بخوات ، بەڵام نابێت لەو حاڵەتەشدا مرۆڤێکی زیندو بکوژرێت بۆ ئەوەی لە گۆشتەکەی بخورێت چونکە ئەویش مافی ژیانی هەیە ، کەواتە دەبێت تاوەکو پێت دەکرێت خۆپارێزی بکەیت ، خوا پەنامان بدات لە کەوتنە ناو ئەو حاڵەتە نالەبارەوە .

**پ٦٩ / ئایا ڕاستە ئەگەر خواردنەوەی (کحولەکان) بخوێت تا چل ڕۆژ دەنگت بە خوا ناگات ؟**

بەڕاستی من لەم بارەیەوە هیچم نەخوێندووەتەوە و زۆریش بۆی گەڕام بەڵام هیچم دەستنەکەوت ، بەڵام لە کاتی گەڕانمدا بۆ زانیارییەك لەم بارەیەوە ئەم فەرموودەیەم

بەرچاو کەوت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إن ملكاً من بـ إسـرائيلَ أخـذَ رجلاً فَخيره بين أنْ يشرب الْخمر ، أو يقْتلَ صبياً ، أو يزنِي ، أو يأكُلَ لحـم الْخنزيـر ، أو يقْتلُوه إنْ أبى ، فَاختار أنه يشرب الْخمر ، وأنه لَما شرب لَم يمتنِع من شيءٍ أرادوه منه)) .**

**وأن رسولَ الله (ﷺ) قَالَ لَنا حينئذ : ((ما من أحد يشربها فَتقْبلُ له صلاةٌ أربعـ لَيلَةً ، ولا يموت وفي مثَانته منها شيءٌ إلا حرمت علَيه الْجنةُ ، وإنْ مات في الأربعـ مـات ميتـةً جاهليةً))**[123].

واتە : بەڕاستی پادشایەك لە پادشاکانی بەنی ئیسرائیل پیاوێکی برد و ئازادی کرد لە نێوان هەڵبژاردنی ئەوەی کەوا مەشروب (ئارەق) بخواتەوە یان منداڵێك بکوژێت یان زینـا و داوێپیسی بکات یان گۆشتی بەراز بخوات یان بیکوژن ئەگەر خۆی گرتەوە لەو کارانە ، ئەویش مەشروب (ئارەق) هەڵبژارد ، وە کاتێك خواردیەوە خۆی نەگرتەوە لە هیچ شـتێك لەو کارانەی کە لێیان ویست بیانکات ، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو کاتەدا فەرمووی : هیچ کەسێك نییە مەشروب (ئارەق) بخواتەوە و چل ڕۆژ نوێـژی لـێ قـەبوڵ بکرێـت ، وە هـیچ کەسـێك نـیـە مەشـروب (ئـارەق) بخواتـەوە و بمرێـت و لـە میزڵدانیـدا شـتێك لـەو مەشروبەی تێدا هەبێت ئیللا بە هەشتی لێ حەرام و قەدەغە دەکرێت ، وە بەڕاستی هـەر کەسێك لە ماوەی ئەو چل ڕۆژەیشدا بمرێت ئەوا مردنێکی نەفامییانەی کردووە .

هەروەها دواتر ئەم فەرموودانەشم بەرچاو کەوت :

**عن عبد الله بن عمرو بن الْعاص (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((الْخمر أُم الْخبائث ، فَمن شربها لَم تقْبلْ منه صلاته أربعـ يوماً ، فَإنْ مات وهي في بطْنِه مات ميتةً جاهليةً))**[124].

---

[123] **رواه الطـ انـي الـمعجم الكبـ رقم : (١٥٢٨) وصححه الألبانـي سلسلة الأحاديـث الـصحيحة رقـم : (٢٦٩٥) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (٢٣٧٠) .**

[124] **رواه الطـ انـي الـمعجم الكبـ رقم : (١٥٤٣) والـمعجم الأوسط رقم : (٣٨٠٩) وحـسنه الألبانـي صـحيح الـجامع الصغـ رقم : (٣٣٤٤) .**

واتە : مەشروب (ئارەق) دایك و سەرچاوەی خراپە و تاوانەکانە ، وە هەرکەسێك بیخواتەوە ئەوا چل ڕۆژ نوێژی لێ قەبوڵ ناکرێت ، وە ئەگەر بمرێت و ئەو مەشروبە لە ناو سکیدا بێت ئەوا بە مردنێکی نەفامانە دەمرێت .

**وعن عبد الله بن عمرو (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((من شرب الْخمر وسكر لَم تقْبلْ لَه صلاَةٌ أَربع صباحاً وإِنْ مات دخلَ النار فَإِنْ تاب تاب الله علَيه ، وإِنْ عاد فَـشرب فَسكر لَم تقْبلْ لَه صلاَةٌ أَربع صباحاً فَإِنْ مات دخلَ النار فَإِنْ تاب تاب الله علَيه ، وإِنْ عاد فَشرب فَسكر لَم تقْبلْ لَه صلاَةٌ أَربع صباحاً فَإِنْ مات دخلَ النار فَإِنْ تاب تاب الله علَيـه ، وإِنْ عاد كَانَ حقاً علَى الله أَنْ يسقيه من ردغَة الْخبال يوم الْقيامة)) ، قَالُوا : يا رسولَ الله وما ردغَةُ الْخبالِ ؟ قَالَ : ((عصارةُ أَهلِ النارِ))[125].**

واتە : هەرکەسێك مەشروب (ئارەق) بخواتەوە و سەرخۆشی (بێهۆش و بێئاگای) بکات ئەوا چل ڕۆژ نوێژی لێ قەبوڵ ناکرێت وە ئەگەر بمرێت دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە وە ئەگەر تەوبە بکات ئەوا خوا تەوبەی لێ قەبوڵ دەکات ، وە ئەگەر گەڕایەوە و دووبارە خواردیەوە و سەرخۆشی (بێهۆش و بێئاگای) کرد ئەوا چل ڕۆژ نوێژی لێ قەبوڵ ناکرێت وە ئەگەر بمرێت دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە ، وە ئەگەر گەڕایەوە و سێبارە خواردیەوە و سەرخۆشی (بێهۆش و بێئاگای) کرد ئەوا چل ڕۆژ نوێژی لێ قەبوڵ ناکرێت وە ئەگەر بمرێت دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە ، وە ئەگەر گەڕایەوە و چواربارە خواردیەوە ئەوا حەقە لەسەر خوا کە لە (**ردغَة الْخبال**) بدات بەدەرخواردیا لە ڕۆژی قیامەتدا ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا (**ردغَة الْخبال**) چییە ؟ فەرمووی : کێم و زووخاوی ئەهلی دۆزەخە .

---

[125] **صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٣٣٧٧) .**

پ ٧٠ / کچێک لە نامەیەکدا باس و بەسەرهاتی تووشبوونی خۆیی کردووە بە هەندێک تاوان و خراپەکاری .. وە لەبەر ئەوەی کە خۆی داوای کردووە (بەسەرهاتەکەی) بڵاونەکرێتەوە ئێمە لێرەدا پوختەی نامەکەی لە چەند خاڵێکدا دەخەینە ڕوو ئەنجا وەڵامی خاڵەکان دەدەینەوە :

١ . نازانم چی بکەم ؟ نازانم خوا لێم خۆش دەبێت ؟

٢ . چی بکەم بۆ ئەوەی خوا گوناحەکانم بۆ بپۆشێت ؟

٣ . تا رادەیەکی باش پابەندم بە ئاینی ئیسلامەوە !

٤ . باڵا پۆشم واتە لەچکم کردووە !

٥ . یەکتر ناسین و پەیوەندی بە یکتر کردنەوە لە نێوان کوڕ و کچدا ؟

٦ . کارە حەرامەکانی ئەنجام داوە پاشان بیری کردەوەتەوە !

٧ . پەشیمان بوونەوە و خۆ نەدان بە دەستەوە . . .

٨ . زیاد لە حەد پەشیمانە و بێتاقەتە ..

٩ . ئەیەوێت خۆی بکوژێت و بەڵام نایکات !

١٠ . کوڕێک هاتوتە داوای ..

١١ . لەم بێزاریە رزگارم کەن ..

وەڵام /

خوشکی موسڵمان : **السلام عليكم ور ة ا وبركاته** . . .

بڕیاردانی پەشیمان بوونەوەت و واز هێنانت لەو کارە خراپ و زۆر قەبیحانە و هەست کردنت بە بێزاری و بێ تاقەتی لەوەی کە کردووتە . . . ئەمانە هەمووی نیشانەی دۆزینەوەی ڕاستەڕێ و هیدایەت و ڕێگای ڕزگار بوونە لە تاڵاوی ژیانی پڕ لە تاوان و بەد ڕەوشتی ..

جا وەڵامی پرسیارەکانت بەم شێوازە دەبێت :

## پرسیار : نازانم چی بکەم ؟

وەڵام : دەبێت ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدەیت :

١ ـ دەبێت تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەیت لە هەموو تاوانەکانت بە گشتی و ئەو کارە قەبیح و زۆر خراپەیش بە تایبەتی .. تەوبەی ڕاستەقینەش سێ مەرجی هەیە کە بریتیم لە :

أ / پەشیمان بوونەوە لە تاوانەکانت .

ب / وازهێنان لە تاوانەکان .

ج / بڕیار دان بۆ ئەنجامنەدانیان لە داهاتوودا .

چونکە لە ئایەتەکانی **(سورة الفرقان)**دا خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿... إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ **وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا** ... ﴿٧٠﴾﴾ [الفرقان] .

واتە : ئیللا کەسێك نەبێت کەوا تەوبە دەکات و ئیمان و باوەڕ دەهێنێت و **کردەوەی چاکە دەکات** .

٢ ـ بۆ سەلماندنی ڕاستێتی تەوبەکەت و خوا لێت خۆشببێت دەبێت وازبێنیت لە خراپەکاری و تاوانەکان و دەست بکەیت بە چاکەکاری :

**عن أبي طَويلٍ شطَبٍ الْممدود أنه أتى رسولَ الله (ﷺ) فَقَالَ : ((أرأيت رجلا عملَ الذنوب كُلها ، فَلَم يترك منها شيئاً ، وهو في ذَلك لَم يترك حاجةً ولا داجةً إلا أتاها ، فَهلْ لَه من توبة ؟ قَالَ : فَهلْ أسلَمت ؟ قَالَ : أما أنا فَأشهد أنْ لا إلَه إلا الله وحده لا شريك لَه ، وأنك رسولُ الله ، قَالَ : نعم ، تفْعلُ الْخيرات وتترك السيئَات ، فَيجعلُهن الله لَك خيرات كُلهن ، قَالَ : وغَدراتي وفَجراتي ؟ قَالَ : نعم ، قَالَ : الله أكْبر ، فَما زالَ يكَبر حتى توارى))[١٢٦] .**

واتە : (**أبي طويل**) هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی : هەواڵم بدەرێ

[١٢٦] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (٣١٦٤) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٣٣٩١) .

سەبارەت بە کەسێك کەوا هەموو تاوانەکانی کردبێت و هیچیانی بە جێ نەهێشتبێت وە ئەو کەسە لە تاونکاریدا هیچی بە جێ نەهێشتبێت ئیللا کردبێتی ، ئایا ئەو کەسە بۆی هەیە تەوبە بکات ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئایا تۆ موسڵمان بوویت ؟

وتی : من شایەتی دەدەم کەوا هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت ئیللا خوا نەبێت و تۆش پێغەمبەری خوایت .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەگەر کاری خێر و چاکە بکەیت و وازبێنیت لە خراپە و تاوانەکان ئەوا خوا هەموویت بۆ دەکات بە چاکە .

وتی : ئەی غەدر و خیانەت و تاوانکارییەکانمیش ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەڵێ .

وتی : خوا چەند گەورەیە (ا أكـ ) .

لە بەر ئەمە ئەو کابرایە بەردەوام دەیوت : خوا چەند گەورەیە (ا أكـ ) تاوەکو لە پێش چاو وون بوو .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((اتقِ الله حيثُما كُنت ، وأتبِعِ السيئةَ الْحسنةَ تمحها ، وخالقِ الناس بِخلُقٍ حسنٍ))**[١٢٧].

واتە : لە خوا بترسە و خۆپارێزی بکە لە تاوان لە هەر کوێك هەبیت ، وە بە دوای تاون و خراپەدا خێر و چاکەیەك بکە بۆ ئەوەی بیسڕێتەوە ، وە هەڵسوکەوت بکە لەگەڵ خەڵدا بە ڕەوشتی چاك و جوان .

٣ ـ بەردەوام داوا لە خوای گەورە بکە کە هیدایەتت بدات و دامەزراوت بکات لە سەر چاکەکاری و بتپارێزێت لە تاوانەکان ..

وە خۆت بکە بە هاوڕێیەکی ڕاستەقینە و هەمیشەیی قورئـان .. و تا لە

---

[١٢٧] صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٥٥) .

توانتدا هەیە کتێب و نامیلکە و بابەتەکانی (ڕێگای ڕاست و سایتی بەهەشت) بخوێنەرەوە .

٤ ـ وازهێنان و دوور کەوتنەوە و بە جێهێشتنی هاوەڵ و برادەری خراپ و تاوانبار و دوور لە خوا ، وە بە پێچەوانەشەوە نزیك بوونەوە و تێکەڵاوی کردنی هاوەڵ و برادەری خوا ناس و چاکەکار ، چونکە هاوەڵ و برادەر کاریگەریان هەیە بۆ دوور کەوتنەوە لە تاوان بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((إنما مثَلُ الجليس الصالح والجليس السوء : كحامل المسك ونافخ الكير ، فحاملُ المسك إما أنْ يحذيك ، وإما أنْ تبتاع منه ، وإما أنْ تجد منه ريحاً طيبةً ، ونافخ الكير إما أنْ يحرق ثيابك ، وإما أنْ تجد ريحاً خبيثةً))**[128].

واتە : نموونەی هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ : وەکو هەڵگری بۆنی میسك (واتە بۆن فرۆش) و فۆکار بە کوورەدا (واتە ئاسنگەر) وایە ، جا هەڵگری بۆنی میسك یان لەو بۆنەت پێدەبەخشێت یان لێی دەکڕیت یان بۆنی خۆشی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت ، بەڵام فۆکار بە کوورەدا یان جلەکانت دەسوتێنێت یان بۆنی پیسی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ تصاحب إلا مؤمناً ، ولاَ يأكُلْ طعامك إلا تقي))**[129].

واتە : هاوەڵێتی ئیماندار نەبێت نەیکەیت ، وە با کەس خواردنت نەخوات ئیللا کەسێکی لە خوا ترس و خۆپارێز لە تاوان نەبێت .

٥ ـ دوور کەوتنەوە و بە جێهێشتنی ئەو شوێن و جێگایەی کەوا تاوانی تێدا دەست دەکەوێت ، بە بەڵگەی فەرموودەی ئەو کەسەی کەوا سەد کەسی کوشت و پاشان تەوبەی کرد : پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : **((اخرج من القرية الخبيثة التي أنت فيها**

---

[128] **صحيح البخاري رقم : (٢١٠١) و (٥٥٣٤) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٢٨) من حديث أبي موسى ، واللفظ المذكور لمسلم .**

[129] **صحيح أبي داود رقم : (٤٨٣٢) .**

**إلى القرية الصالحة قرية كذا وكذا [فإن بها أناساً يعبدونَ الله] فاعبد ربك [معهم] فيها ، [ولا ترجع إلى أرضك فإنها أرض سوءٍ]))**[١٣٠] .

واتە : دەرچوو لەو گوندە پیسەی کە تۆ تێیدا دەژیت و برۆ بۆ ئەو گوندە چاکەی کەوا خەڵکانێکی تێدایە خوا دەپەرستن و تۆش لەگەڵ ئەواندا خوای پەروەردگارت بپەرستە تێیدا ، وە نەگەڕێیتەوە بۆ زەویەکەی خۆت چونکە خەڵکەکەی خراپە .

کەواتە دەبێت خۆپارێزی بکەیت لە ڕۆیشتن بۆ ئەو شوێن و جێگایانەی کەوا تاوانی تێدا ئەنجام دەدرێت .

**پرسیار : نازانم خوا لێم خۆش دەبێت ؟**

وەڵام : وە بێ ئومێد مەبە لە ڕەحم و لێخۆشبوونی خوا چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ **[الزمر]** .

بڵێ بە عەبدەکانم ئەوانەی کەوا ڕۆچوون لە ستەم کردن لە خۆیان بە تاوان کردن با بێ ئومێد نەبن لە ڕەحمەتی خوا ، بەڕاستی خوا لە هەموو تاوانەکان خۆش دەبێت ، بەڕاستی خوا لێبووردە و بە بەزەییە .

**پرسیار : چی بکەم بۆ ئەوەی خوا گوناهەکانم بۆ بپۆشێت ؟**

وەڵام : ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدە :

١ ـ تەوبە کردنێکی ڕاستەقینە و داوای لێخۆشبوون لە خوا و چاکە کردن و وازهێنان لە خراپە کردن و هاوەڵێتی و تێکڵاوی کردنی چاکەکاران و ئەو جێگایانەی کە چاکەی تێدا دەکرێت و دوور کەوتنەوە لە تاونباران و خراپەکاران و ئەو جێگایانەی کە خراپە و تاوانی تێدا دەکرێت وەك لە پێشەوە باس کرا .

٢ ـ داوا بکە لە خوا و بەردەوام لێی بپاڕێرەوە کەوا سترت بکات :

---

[١٣٠] **سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٤٠) .**

وە بە تایبەت بەردەوام بەیانیان پێش خۆر کەوتن و ئێواران پێش خۆر ئاوا بوون ئەم دوعایە بخوێنە : ((**اللهم إني أسألك العفو والعافية في الدنيا والآخرة ، اللهم إني أسألك العفو والعافية في ديني ودنياي وأهلي ومالي ، اللهم استر عوراتي وآمن روعاتي واحفظني من بين يدي ومن خلفي وعن يميني وعن شمالي ومن فوقي وأعوذ بك أن أغتال من تحتي**))[131].

٣ ـ تورەیی خۆت بخۆرەوە بۆ ئەوەی خوا سترت بکات و گوناهەکانت دادەپۆشێت :

**عن عبد الله بن عمر (رضي الله عنهما) قالَ : أن رجلاً جاءَ إلى النبي (ﷺ) فقالَ : يا رسولَ الله أي الناس أحب إلى الله ؟ وأي الأعمال أحب إلى الله ؟**

**فقالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((أحب الناس إلى الله تعالى أنفعهم للناس ، وأحب الأعمال إلى الله تعالى : سرور تدخله على مسلم ، أو تكشف عنه كُربةً ، أو تقضي عنه ديناً ، أو تطرد عنه جوعاً ، ولأنْ أمشي مع أخي المسلم في حاجة أحب إلي من أنْ أعتكف في هذا المسجد ـ يعني مسجد المدينة ـ شهراً ، ومن كف غضبه ستر الله عورته ، ومن كظم غيظه ولو شاءَ أنْ يمضيه أمضاه ملأ الله قلبه رجاءً يوم القيامة ، ومن مشى مع أخيه المسلم في حاجة حتى يثبتها له أثبت الله تعالى قدمه يوم تزل الأقدام ، وإن سوءَ الخلق ليفسد العملَ كما يفسد الخل العسلَ))**[132].

واتە : خۆشەویسترینی خەڵك لای خوا ئەوەیە : سوودمەندترینیان بێت بۆ خەڵك ..

وە **خۆشەویسترین کردەوە لای خوای گەورە ئەوەیە** :

خۆشیەك بهێنیت بە سەر موسوڵمانێکدا ، یان ناڕەحەتی‌یەکی لە سەر لابەریت ، یان قرزێکی بۆ ببژێریت ، یان برسێتیەکی دەربکەیت ، وە ئەگەر لەگەڵ برایەکی موسوڵمانمدا بڕۆم بۆ بەجێهێنانی پێویستیەك لام خۆشەویسترە لەوەی کە لەم مزگەوتەدا (مزگەوتی

---

[131] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٣٨٧١) .

[132] صحيح الجامع الصغ رقم : (١٧٦) ، وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (٢٦٢٣) ، وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٩٠٦) .

مەدینە) یەك مانگ بمێنمەوە بۆ خوا پەرستی و ئیعتیکافکردن ، **وە هەرکەسێك تووڕەیی خۆی بگرێتەوە ئەوا خوا عەورەتی دادەپۆشێت** ، وە هەرکەسێك ڕق و تووڕەییەك بخواتەوە لە کاتێدا ئەگەر ویستی هەبێت بەجێی بێنێت بەجێی دێنێت ئەوا خوا دڵی پڕ دەکات لە ڕەزامەندی لە ڕۆژی دوایدا ، وە هەرکەسێك لەگەڵ برایەکی موسوڵمانیدا بڕوات بۆ بە جێهێنانی پێویستیەکی هەتا جێبەجێی دەکات ئەوا خوا پێی جێگیر دەکات لە ڕۆژێکدا کە پێکان تیایدا دەخلیسکێن ، وە ڕەوشت خراپی کردەوە تێك دەدات وەك چۆن خەڵ هەنگوێن تێك دەدات .

لێرەدا مەبەست بە (داپۆشینی عەورەت) داپۆشینی تاوانەکانە .

وە تاوەکو پێتدەکرێت بە هەموو ئەم ڕەوشتە جوانانە خۆت برازێنەوە بە گشتی .

٤ ـ تۆ گوناهەکانی خەڵکانی تر بپۆشە خواش گوناهەکانی تۆ دادەپۆشێت :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((من نفس عن مؤمنٍ كُربةً من كُربِ الدنيا نفس الله عنه كُربةً من كُربِ يومِ القيامة ، ومن يسر على معسِرٍ يسر الله عليه في الدنيا والآخرة ، ومن ستر مسلماً ستره الله في الدنيا والآخرة ، والله في عون العبد ما كانَ العبد في عون أخيه ، ومن سلك طَريقاً يلتمس فيه علما سهلَ الله له بِهِ طَريقاً إِلى الجنة ، وما اجتمع قَوم في بيت من بيوت الله يتلونَ كتاب الله ويتدارسونه بينهم إِلا نزلت عليهم السكينةُ وغَشيتهم الرحمةُ وحفتهم الملائكةُ وذكَرهم الله فيمن عنده ، ومن بطأَ بِهِ عملُه لَم يُسرع بِهِ نسبه))**[١٣٣].

واتە : هەر کەسێك نارەحەتیەك لە نارەحەتیەکانی دونیا کەمە کاتەوە لە سەر ئیمانداریك ئەوا خوای گەورە نارەحەتیەك لە نارەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەتی لە سەر کەم دەکاتەوە ، وە هەر کەسێك چاوپۆشی لە کەسێکی نەدار و دەستنەڕۆیشتو بکات ئەوا خوا چاوپۆشی لێدەکات لە دونیا و دوارۆژدا ، وە هەر کەسێك عەیبە و کەمکوڕی و تاوانی موسڵمانێك بپۆشێت ئەوا خوای گەورە دایدەپۆشێت لە دونیا و دوارۆژدا ، وە

---

[١٣٣] صحيح مسلم

خوای پەروەردگار لە هاوکاری عەبدەکەیدایە تاوەکو ئەو عەبدە لە هاوکاری براکەیدا بێت ، وە هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتەبەر بۆ بەدەست خستنی زانستی شەرعی ئەوا خوا ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات ، وە هیچ کۆمەڵە کەسانێك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوادا کۆنابنەوە بۆ خوێندنەوەی قورئان و لێکدانەوەی لە نێوان خۆیاندا ئیللا ئارامی دادەبەزێت بە سەر سەریاندا و ڕەحمەتی خوا دەیانگرێتەوە و فریشتەکان چواردەوریان دەدەن و خوایش باسیان دەکات لە لای فریشتەکانی لای خۆی ، وە هەر کەسێك کردەوەکانی دوای بخات ئەوا پشت و ڕەچەڵەکی پێشی ناخات .

مەبەست لێرەدا بریتی‌یە لە برگەی (وە هەر کەسێك عەیبە و کەمکوڕی و تاوانی موسڵمانێك بپۆشێت ئەوا خوای گەورە تاوانەکانی دادەپۆشێت لە دونیا و دوارۆژدا) ، وە تاوەکو پێتدەکرێت بەو هەموو ڕەوشتە جوانانە خۆت برازێنەوە بە گشتی .

٥ ـ زمانت بگرەوە لە وتەی خراپ و بێ سوود ئەوا خوا گونا‌حەکانت دادەپۆشێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((من خزنَ لسانه ستر الله عورته))**[١٣٤].

واتە : هەر کەسێك زمانی بگرێتەوە ئەوا خوا کەموکوڕی و تاوانەکانی دادەپۆشێت .

٦ ـ خۆت خۆت ستر بکە و تاوانەکات ئاشکرا مەکە بەڵکو خوا سترت بکات و گوناحەکانت دادەپۆشێت :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((كُل أمتي معافًى إلا المجاهرين ، وإن من المجاهرة أنْ يعملَ الرجلُ بِالليل عملاً ، ثُم يصبح وقَد ستره الله ، فَيقُولَ يا فُلاَنُ عملْت الْبارِحةَ كَذَا وكَذَا ، وقَد بات يستره ربه ويصبح يكْشف ستر الله عنه))**[١٣٥].

واتە : هەموو ئوممەتەکەم عەفو دەکرێن و چاوپۆشیان لێدەکرێت ئیللا ئەوانە نەبێت کە تاوانەکانیان ئاشکرا دەکەن ، وە بەڕاستی بەشێك لە ئاشکراکردنی تاوان ئەوەیە کەوا بە شەو کردەوەیەك بکات ئەنجا ڕۆژی لێدەبێتەوە و خواش تاوانەکەی بۆ داپۆشیوە کە

---

[١٣٤] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٣٦٠) .

[١٣٥] صحيح البخاري رقم : (٦٠٦٩) وصحيح رقم : (٧٤١٠) .

چی خۆی دەڵێت : من دوێنێ شەو فلان و فلان کردەوەم کردووە ، لە کاتێکدا کە لە شەودا خوا داپۆشیوە کە چی خۆی لە بەیانیدا ئەو داپۆشین سترەی خوا هەڵدەماڵێت و تاوانەکەی ئاشکرا دەکات .

کەواتە پێویستە تۆ خۆت تاوانەکانی خۆت دابپۆشیت و پەردەی خوا لەسەر خۆت هەڵنەماڵیت بەڵکو خوا سترت بکات ئەو کردەوە خراپەیەت داپۆشێت .

خوشکی موسڵمان ئەمانە چەند ڕێگا و وەسیلەیەك بوون بۆ ئەوەی ئەگەر تۆ بە ڕێکوپێکی ئەنجامیان بدەیت ئەوا ـ **إنْ شاء ا** ـ خواش تۆ دادەپۆشێت و پەردەت لە سەر هەڵناماڵێت .

* دوای ئەو هەموو ڕوون کردنەوە و ئامۆگاریانە دەڵێم هەندێك تێبینم هەیە لە سەر هەندێك لە وشەکانت جا بۆ ئەوەی زیاتر بە ئاگا بێیتەوە هەندێك زانیاری ترت پێشکەش دەکەم بۆیە دەڵێم :

ـ تۆ نووسیوتە : (تا رادەیەکی باش پابەندم بە ئاینی ئیسلامەوە) ! ! !

ـ منیش دەڵێم : داوای لێبووردنت لێدەکەم لەوانەیە ئەمە بە گومانی خۆت وابێت ! ئەگینا ئەگەر تۆ تا رادەیەکی باش پابەند ببوایەیت بە ئاینی ئیسلامەوە ئەوا تووشی ئەو هەموو کردارە خراپانە نەدبویتەوە !

ئەمەش بۆ ئەوە ناڵێم کە تۆ بێ ئومێد بکەم ! نەخێر بەڵکو بۆ ئەوە دەیڵێم کەوا پێداچوونەوەیەکی خۆت و زانیاریەکانت سەبارەت بە ئاینی ئیسلام و پابەند بوونت بە ڕەوشت و ئادابەکانی ئیسلامەوە بکەیت بۆ ئەوەی بزانیت چەندێك ئاشنایت بە ئیسلام و چەندێك پابەندی بەو ئاینە پاکەوە کە ڕێگری هەموو خراپە و تاوانێکت لێدەکات .

خوشکی موسڵمان : زۆرێك هەن وەك تۆ دەڵێن : (تا رادەیەکی باش پابەندم بە ئاینی ئیسلامەوە) ! بەڵام کردەوە ئەمە دەسەلمێنێت ..

خۆ ئەگەر بە هۆی شەیتان و نەفسی تاوانبارەوە هەندێك جار موسڵمان کەوتە نێو تاوانەوە ئەوا دەبێت زۆر زوو بە ئاگا بێتەوە و پابەند بوونی بە ڕەوشت و ئاکارە جوانەکانی ئاینە ڕاست و پاکەکەی نەشکێنێت .

جا هیوادارم ئەو پێداچوونەوەیەت هاندەر و پاڵنەرێکی بە هێز بێت بۆ ئەوەی زیاتر و زیاتر و زیاتر زانیاریەکانت سەبارەت بە ئاینی ئیسلام و پابەند
بوونت بە ڕەوشت و ئادابەکانی ئیسلامەوە بەرەو ئاستێکی بەرزتر بڕوات ...

ـ هەروەها تۆ نووسیوتە : (باڵا پۆشم واتە لەچکم کردووە) !

ـ منیش دەڵێم : بە هەمان شێوەی پێشوو داوای لێبووردنت لێدەکەم ! باڵا پۆشی بریتی نییە لە تەنها (لەچك کردن) ! چونکە (لەچك) تەنها (سەر و مل) دادەپۆشێت .. بۆیە دەبێت باڵا بە پۆشاکێك بپۆشرێت کەوا ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا هەبێت :

**مەرجەکانی باڵا پۆشی لە شەریعەتی ئیسلامدا بریتین لە هەشت مەرج :**

١ ـ دەبێت ئەو پۆشاکە هەموو لاشە و جەستەی ئافرەتەکە داپۆشێت جگە لە ڕوومەت و هەردوو لەپی نەبێت .

٢ ـ دەبێت فراوان بێت و تەنگ و تەسك نەبێت و نەلکێت بە لاشەیەوە ، بە شێوەیەك کە قەبارەی ئەندامەکانی لاش دەرنەخات .

٣ ـ دەبێت ئەستور بێت و تەنك نەبێت ، بە شێوەیەك کە ڕەنگی پێستی دەرنەخات .

٤ ـ دەبێت ڕازاوە و سەرنج ڕاکێش نەبێت ، چونکە مەبەست بە پۆشینی باڵا پۆش داپۆشینی جوانیەکانی جەستەی ئافرەتە کەواتە نابێت شتێکی ڕازاوە لەبەر بکات بۆ ئەوەی سەرنجی پیاوان بخۆی ڕابکێشێت .

٥ ـ نابێت پۆشاکەکە پۆشاکی پیاوان بێت .

٦ ـ نابێت لە پۆشاکی کافر و بێباوەڕ و فاسق و تاوانبارن بچێت .

٧ ـ نابێت پۆشاکەکە بۆن خۆش کرابێت .

٨ ـ نابێت پۆشاکەکە پۆشاکی شوهرەت و ناوبانگ دەرکردن بێت .

ئێستایش پرسیارت لێدەکەم ئایا باڵا پۆشیەکەی تۆ هەموو ئەم هەشت مەرجەی تێدایە ؟

ئەگەر تێیدایە ئەوا سوپاسی خوا بکە و بەردەوام ببە لە سەری ..

وە ئەگەر نا ئەوا تەوبە بکە و بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت .

ـ هەروەها لە نامەکەتدا باسی : (یەکتر ناسین و پەیوەندی بە یەکتر کردنەوە لە نێوان کوڕ و کچدا) کردووە !

ـ منیش دەڵێم : خوشکی موسڵمان ئەو (یەکتر ناسین و پەیوەندی بە یەکتر کردنەوە) کارێکی حەرام و قەدەغە کراوە لە ئاینی ئیسلامدا چونکە چەندین کاری حەرامی تری لێدەکەوێتەوە لە : (نەزەر کردن و سەرنج ڕاکێشانی یەکتر و دەمەتەقێ و گفتوگۆ کردن و هەواڵ و نامە گۆڕینەوە لەگەڵ یەکتردا ئەنجا ووردە ووردە دروست بوونی پەیوەندیەکی توندی نارەوای پڕ لە بێ شەرمی و تا دەگاتە پلەی ئەوین و عیشق) ئەنجا سەر دەرکردن لەوەوە کە چەندین کچی وەکو تۆ چاوەڕوان نەبوو ڕوویدات کە چی ڕووی داو ئێستا گرفتاری و بە دەستیەوە بیزار بوویت لە ژیان ..

کەواتە دەبێت هەموو کچێك بە ئاگا و وریا بێت و هەرگیز و هەرگیز خۆی نەناسێنێت بە گورگێکەوە کە شەرەف و ناموسی لێ دەوێت !!!

ـ هەروەها لە نامەکەتدا باسی ئەوەت کردووە کەوا : (کارە حەرامەکانت ئەنجام داوە پاشان بیرت کردوەتەوە )!

ـ منیش دەڵێم : بەڕاستی مرۆڤی ژیر و زانا و دانا پێش هەنگاونان بۆ هەر کارێك بیری لێدەکاتەوە و هەڵیدەسەنگێنێت ، کەواتە بیرنەکردنەوە لە ئەنجامی کارێك لە پاش ئەنجامدانی زۆر دوورە لە ژیری و زانایەتی و دانایەتیەوە بۆیە دووچاری هەڵە و زیان و زەرەرت دەکاتەوە ...

بەهەر حاڵ بیرکردنەوە لە ڕوودانی کاری تاوان و حەرام و هەڵە و نابەجێ خۆی بۆ خۆی کارێکی چاکە و پەشیمان بوونەوەی لێدەکەوێتەوە ، بەڵام من لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە دەبێت پێشتر بیربکەیتەوە بۆ ئەوەی تێ نەکەوێت .

ـ هەروەها تۆ باسی : (پەشیمان بوونەوە و خۆ نەدان بە دەستەوە)ت کردووە !

ـ منیش دەڵێم : بەڕاستی ئەمە هەڵوێستێکی زۆر چاك و ژیرانە بووە و خۆتت پێ ڕزگار کردووە لە چنگ ئەو گورگە بێ شەرەف و بێ ناموس و بێ غیرەتە ..

یا ڕەبی زیاتر خوا دەمەزراوت بکات لە سەر خۆ پاراستن لە هەڵە و تاوان و خراپەکاری ..

ـ هەروەها تۆ نووسیوتە : (زۆر جار ئەمەوێت خۆم بکوژم و بەڵام لە بەر ئەوەی گوناحە پەشیمان ئەبمەوە و نایکەم) !

ـ منیش دەڵێم : بیرکردنەوە لە خۆش کوشتن چارەسەر نی‌یە بەڵکو ئەمەش فێڵێکی تری شەیتانە بۆ ئەوەی بە یەکجاری ئیمان و ئیسلامت لێ دەربێنێت و بە بێ دینی بتمرێنێت دوای ئەوەی کە تووشی ئەو هەموو تاوانانەی کردوویت .. بۆیە دەڵێم : نەخێر ئامان سەد ئامان هەرگیز و هەرگیز بیر لە شتی وا مەکەرەوە ، بەڵکو هەموو ئەو کارانەی کە لە سەرەوە باس کران ئەنجام بدە بە ویستی خوا ڕزگارت دەبێت لەو بیرە گەندەڵ و خراپانە کە وەسوەسەی شەیتانن .

ـ هەروەها تۆ نووسیوتە : (کوڕێك هاتووەتە داوم و هەر چەند ئەکەم ناتوانم ڕازی ببم چونکە ئەترسم ئەو کردەوە خراپانەم کەشف ببێت) !

ـ منیش دەڵێم : لە بەر ئەوەی پەردەی کچێنیت لە دەست نەداوە ئەوا ڕازی ببە بەو کوڕە و شووی پێ بکە و مەش ترسە لە کەشف بوونی خراپەکانت ، ـ **إن شـاء ا** ـ خوا سترت دەکات بە مەرجێك تۆ ئەو کارانەی پێشەوە ئەنجام بدەیت و لە خوا بترسیت و خۆت بپارێزیت لە تاوان .

خوای گەورە فەرمووية‌تی : ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢﴾ **[الطلاق]** .

واتە : هەر کەسێك لە خوا بترسێت و خۆپارێزی بکات لە تاوان ئەوا خوا دەرگای ناڕەحەتی لێدەکاتەوە و ڕزگاری دەکات .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤﴾ [الطلاق] .

واتە : هەر کەسێك لە خوا بترسێت و خۆپارێزی بکات لە تاوان ئەوا خوا کار ئاسانی بۆ دەکات .

ـ هەروەها تۆ نووسیوتە : (زیاد لە حەد پەشیمان و بێتاقەتم) !

ـ هەروەها نووسیوتە : (لەم بێزاریە رزگارم کەن ) !

ـ منیش دەڵێم : هەموو ئەو کارانەی سەرەوە ئەنجام بدە کە باس کران لەگەڵ ئەم کارانەی خوارەوە ـ إن شاء ا ـ رزگارت دەبێت لە هەموو بێتاقەت و بێزارییەك :

١ ـ ئیمانێکی بەرز و ڕاستەقینە و ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان ، خوای گەورە فەرموویـــــــــەتی : ﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٧﴾ [النحل] .

واتە : هەرکەسێك کردەوەی چاکە بکات لە نێر و مێ و ئیماندار بێت ئەوا خۆشترین ژیانی پێدەدەین و خۆشگوزرانی دەکەین لە دونیادا و بە باشترین شێواز پاداشتی کردەوەکانی دەدەینەوە لە قیامەتدا .

٢ ـ بەردەوام با خوات لە یاد بێت و زیکری خوا بکە چونکە بە زیکری خوا دڵت ئارام دەگرێت و ئاسوودە دەبیت ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ [الرعد] .

واتە : ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە و دڵیان بە زیکری خوا ئارامدەگرێت ، ئاگادار بن کەوا تەنها بە زیکری خوا دڵەکان ئارام دەگرن و ئاسوودە دەبن .

٣ ـ باوەڕ بوونێکی تەواو و کامڵ و تێکەڵ نەکردنی بە ستەم و تاوان ، خـوای گـەورە فەرموویـــــەتی : ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾﴾ [الأنعام] .

واتە : ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە و ئیمانەکەیان تێکەڵ نەکردووە بە زوڵم (شیرك بە تایبەت) ئەوانە ئاسوودە و بەختەوەر دەبن و هیدایەت دەدرێن .

٤ ـ پەیوەست بوون بە ئاینی ئیسلام و بەرنامەکەی خـوای پـەروەردگارەوە ، خـوای گەورە فەرموويەتی : ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِيٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾﴾ [سورة طـه] .

واتە : هەر کەسێك شوێنی بەرنامەی خوا بکەوێت ئەوا لە دونیادا سەرگەردان و گومڕا نابێت و لە قیامەتیشدا بەدبەخت و دۆڕاو نابێت ﴿١٢٣﴾ وە هەر کەسـێك پـشت هـەڵبکات لـە بەرنامەکـەی خـوا ئـەوا بەڕاسـتی ژیـانێکی پـڕ لـە بێـزاری و ناسـۆری هەیـە و لـە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشری دەکەین ﴿١٢٤﴾ دەڵێت : پـەروەردگارم ئـەوە بـۆ بـە کـوێری حەشری دەکەیت خۆ مـن لـە دونیـادا بینـا و چـاو سـاغ بـووم ؟ ﴿١٢٥﴾ خـوا دەفـەرموێت : ئاوەها ئایەتەکانی ئێمەت بۆ دەهات و تۆیش پشت گوێت دەخست بۆیە تۆیش ئەمڕۆ بێ بایـەخ و ئیهمـال دەکرێیـت ﴿١٢٦﴾ وە بـەو شـێوەیە پاداشـتی ئـەو کەسـە دەدەینـەوە لـە خراپەکاریدا ڕۆچووە و باوەڕناهێنێت بە ئایەتـەکای پـەروەردگاری ، وە بەڕاسـتی سـزای دواڕۆژ سەخت تر و بەردەوام ترە .

٥ ـ بەردەوام ئەم زیکرە بخوێنەرەوە :

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((ما أصاب أحداً هم ولا حزنٌ فقال :**

**اللهم إني عبدك ، وابن عبدك ، وابن أمتك ، ناصيتي بِيدك ، ماضٍ في حكْمك ، عدلٌ في قَضاؤك ، أسألُك بِكُل اسمٍ هو لَك ، سميت بِه نفْسك ، أو علمته أحداً من خلْقك ، أو أنزلْته فـي كتابِك ، أو استأثَرت فـي علْمِ الغيبِ عندك ، أنْ تجعلَ القُرآنَ رِبِيع قَلْبِي ونور صدرِي وجلاءَ حزنِي وذَهاب همي .**

**إلا أذْهب ا ُ همه وحزنه وأبدلَه مكانه فَرجاً))[١٣٦].**

واتە : هەرکەسێك غەم و پەژارە و ناڕەحەتی‌یەکی تووش ببێت و بڵێت :

خوایە من بەندەی تۆم ، و کوڕی پیاوێکم کە بەندەی تۆیە ، و کوڕی ئافرەتێکم کە بەندەی تۆیە ، پێشەسەرم لە دەستی تۆدایە ، حوکمی تۆ بەسەرمدا پەیڕەوکراوە ، بڕیاری تۆ بەسەرمدا ڕاست و دادپەروەرانەیە ، داوات لێدەکەم بە هەموو ناوێك کە ناوی خۆتت پێ‌ناوە ، یان فێری کەسێکت کردووە لە دروستکراوەکانت ، یان داتبەزاندووە لە کتێبەکەتدا ، یان تایبەتت کردووە بە خۆتەوە لە زانستی غەیبدا لای خۆت ، کەوا قورئان بکەیت بە بەهاری دڵم و ڕووناکی سێنگم و هەڵگری پەژارەم و لابەری غەمم .

ئیللا خوا غەم و پەژارەی لادەبات و لە جێ‌ی ئەوەدا دەیگۆڕێتەوە بە دڵ فراوانی .

لە کۆتایدا هیوادارم کە ئەم نامە و وەڵامە ببێتە مایەی دڵئارام بوونت و دامەزرانت لە سەر ڕێگای تەوبە و چاکەکاری و خۆپاراستن لە هەموو تاوانەکان ، وە هەمیشتە هاوەڕێ و میوانی سایتی بەهەشت بە و بە تایبەت گۆشەی ئافرەتان و هەمیشە زنجیرەکانی گوڵی کۆمەڵگا بخوێنەرەوە ..

**والسلام عليكم ور ة ا وبركاته ...**

---

[١٣٦] **صحيح رواه أ ـد رقم : (١ / ٣٩١) ، صححه الألبانـي سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٩٩) .**

**پ٧١ / ئەگەر کەسێک زینای نەکردبێت بەڵام بە تـەواوەتی ئافرەتەکەی رووت کردبێتـەوە ، وە بێجگـە لـە زینـا کـردن هـەموو شـتێکی لەگەڵـدا کردبێـت .. وە لای هەندێ خەڵک باسی کردبێت .. ئایا حوکمی چیە ؟؟؟**

وەڵام /

کارێکی زۆر خراپ و تاوانی کردووە و دەبێت تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خـوا و پەشیمان بێتەوە لەو تاوانە و هەموو تاوانەکانی تری بە گشتی .

چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویـەتی : **((الْعينان زناهما النظر ، والأُذُنان زناهمـا الاستماع ، واللسانُ زناه الْكَلام ، [والْفَم يزنِي فَزناه الْقُبلُ] والْيد زناها الْبطْش [و روايـة ((اللمس))] ، والرجلُ زناها الْخطا ، ...))[137].**

واتە : زینای چاو سـەیرکردنی ئـافرەتی نامەحرەمـە ، وە زینـای گـوێ گوێگرتنـە لـە وتەی خراپ ، وە زینای زمان قسەکردنی حەرامە ، وە زینای دەم مـاچ کردنـی حەرامـە ، وە زینـای دەسـت دەستوەشـاندنە **[**لـە ریوایـەتێکی تـردا : دەسـت پێـوەدانی ئـافرەتی نامەحرەمە**]** ، وە زینای پێ هەنگاونانە بۆ کاری خراپ ..

کەواتە تۆ هەموو جۆرە زینایانەت ئەنجام داوە کە هەموویان ڕێخۆشـکارن بـۆ زینـای داوێن پیسی و بێئەخلاقی ! بۆیە دەبێت تەوبە بکەیت و زوو پەشـیمان ببیتـەوە و بڕیـار بدەیت کەوا جارێکی تر کاری ئاوەها خراپ ئەنجام نەدەیتەوە .

وە نابێت نزیکی ئەو کەس و جێگایانە ببیتەوە کەوا کاری وا خراپیان لێدەکەوێتـەوە چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ ...﴿٣٢﴾ ﴾ **[الإسراء] .**

واتە : نزیکی زینا نەبنەوە .

---

[137] **صحيح البخاري رقم : (٦٢٤٣) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٥٧)، والزيادة الأو أخرجه أبو داود رقـم : (٢١٥٣) والثانيـة أخرجه أ د ((ا سند)) رقم : (٢٦٥٧) .**

وە باس کردن و ئاشکرا کردنی تاوان لە لای خەڵکی کارێکی زۆر ترسناکە و دەبێت لەو کارەش تەوبە بکات ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((كُل أمتي معافًى إلا الْمجاهرين ، وإن من الْمجاهرة أنْ يعملَ الرجلُ بِالليل عملاً ، ثُم يصبِح وقَد ستره اللـه ، فَيقُولَ يا فُلاَنُ عملْت الْبارحةَ كَذَا وكَذَا ، وقَد بات يستره ربه ويصبِح يكْشف ستـر اللـه عنه))**[138].

واتە : هەموو ئوممەتەکەم چاوپۆشی لێدەکرێت تەنها ئەوانە نەبێت کە تاوانەکانیان ئاشکرا دەکەن ، وە بەڕاستی بەشێك لە ئاشکرا کردنی تاوان بریتییە لەوەی کە پیاو بە شەو کارێك بکات ئەنجا کە ڕۆژ دەبێتەوە ـ خوا داپۆشیوە ـ بەڵام خۆی دەڵێت ئەی فڵان ئەوا من ئەمشەو فڵانە کار و فڵانە کارم ئەنجامداوە ، شەو خەوی لێکەوتووە و خوا داپۆشیوە بەڵام بەیانی خۆی پەردەی خوا لە سەر خۆی هەڵدەماڵێت .

وە بەو ئاشکراکردنە ئابرووی خۆی دەبات .

کەواتە ئەمەش هەر تاوانە و دەبێت تەوبەی لێبکات .

---

[138] **صحيح البخاري رقم : (٦٠٦٩) وصحيح رقم : (٧٤١٠) .**

**خووی نهێنی :**

پ٧٢ / چەند پرسیارێک هاتووە سەبارەت بە حوكمی دامركاندنەوەی شەوەت بە دەست (واتە : دەست پەڕ) كە لە عەرەبیدا پێی دەڵێن : **(الاستمناء)** یان (**العادة السرية**) ؟

وەڵام /

(دامركاندنەوەی شەهوەت بە دەست) یان (دەرهێنانی مەنی بە دەست) یان (دەست پەڕ) یان (خۆڕەحەت كردن بە دەست) كە بە عەرەبی پێی دەوترێت (**الاستمناء**) یان (**العادة السرية**) كارێكی حەرامە و ناشەرعیيە و دروست نییە لە بەر ئەم بەڵگانەی خوارەوە :

١ ـ خوای گەورە فەرموويەتی : ﴿ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ۝٧ ﴾ **[المؤمنون]** .

واتە : ئەوانەی كە عەورەتیان دەپارێزن ئیللا لە خێزانەكانیان و كەنیزەكەكانیان نەبێت ئەوانە لەمەدا هیچ لۆمەيەكیان لە سەر نیيە ، هەر كەسێك بەدوای جگە لەمەدا بگەڕێت و عەورەتی تێدا بە كار بێنێت ئەوا ئەوانە سنوری خوایان شكاندووە و تەعەدا و ستەمیان كردووە .

٢ ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموويەتی : **((يا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج ، فإنه أغض للبصر وأحصن للفرج ، ومن لم يستطع فعليه بالصوم ، فإنه له وجاء))**[١٣٩] .

واتە : ئەی چینی گەنجان هەر كەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە ئەوا با ژن بێنێت ، چونكە ژن هێنان چاو دەگرێتەوە لە نەزەر كردن و قەڵايەكیشە بۆ عەورەت و

---

[١٣٩] صحيح البخاري رقم : (٥٠٦٦) وصحيح مسلم رقم : (٣٤٦٤) .

دەپارێزێت ، وە هەر کەس توانای ژن هێنانی نییە ئەوا با ڕۆژو بگرێت چونکە ڕۆژو دەبێتە پارێزەر بۆی .

جا ئەگەر (دامرکاندنەوەی شەهوەت بە دەست) دروست بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێنمایی گەنجانی بۆ دەکرد ، بەڵام دەبینین ڕێنمایی گەنجانی کردووە بۆ ڕۆژو گرتن بۆ ئەوەی زەوق و شەهوەتیان کەم بێتەوە و لاواز بێت .

هەروەها ئەم کارە زیان و زەرەری زۆری هەیە بۆ ئەنجامدەرەکەی ، لەوانە :

- ئەوانەی کە زۆر ئەم کارە ئەنجامدەدەن لە کاتی ژن هێناندا دوچاری ئەوە دەبنەوە کە ئاویان نەیەتەوە بە جووت بوون چونکە ئەو بە شێوازێکی تر ڕاهاتووە .

- هەندێك لەو کەسانە زەکەریان هەڵناسێت بۆ جووت بوون لەگەڵ ژنەکەیدا .

- یان ئاویان زوو دێتە دەرەوە ، بەمەش ناتوانێت مافی خۆی و هاوسەرەکەی بە تەواوی بدات .

- ئەم کارە هۆکارێکە بۆ توشبوون بە نەخۆشی فەقەرات .

- هەروەها چەندین زیانی تر ...

**پ٧٣ / حوکمی دامرکاندنەوەی شەهەوەت بە دەست چی یە ؟ چونکە من [کچێکم] زیاتر لە ٤ ساڵە ئەم کارە دەکەم ، ئێستا زۆر پەشیمانم چی بکەم بۆ ئەوەی خوای گەورە لێم خۆش بێ ؟**

وەڵام /

(دامرکاندنەوەی شەهوەت بە دەست) یان (دەرهێنانی مەنی بە دەست) یان (دەست پەڕ) یان (خۆڕەحەت کردن بە دەست) کە بە عەرەبی پێی دەوترێت (**استمناء**) یان (**العادة السرية**) کارێکی حەرامە و ناشەرعی یە و دروست نی یە چ بۆ کوڕان بێت یان بۆ کچان لە بەر ئەم بەڵگانەی خوارەوە :

١ ـ خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ۝٧ ﴾ **[الـمؤمنون]** .

واتە : ئەوانەی کە عـەورەتیان دەپـارێزن ئـیللا لـە خێزانـەکانیان و کەنیزەکـەکانیان نەبێت ئەوانە لەمەدا هیچ لۆمەیەکیان لە سەر نیـیە ، هـەر کەسـێك بـەدوای جگـە لەمـەدا بگەڕێت و عەورەتی تێدا بە کار بێنێت ئەوا ئەوانە سنوری خوایان شکاندووە و تەعـەدا و ستەمیان کردووە .

ئەمـە ئـافرەتیش دەگرێتـەوە چـونکە ئـەویش دەبێـت عـەورەتی بپارێزێـت تـەنها لـە مێردەکەی خۆی نەبێت کە حـەڵاڵی خۆیـەتی ، کـەوا بـە هـەر ڕێگایـەکی تـر ئـاوی خـۆی بێنێتەوە و خۆی ڕەحەت بکات ئەوا تەعەدای کردووە و تاوانبار دەبێت چونکە عەورەتی خۆی نەپاراستووە لە کاری نابەجێ .

٢ ـ پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی : **((یا معشر الشبابِ منِ استطاع منکُم الْباءَةَ فَلْیتزوج ، فَإِنه أَغَض للْبصر وأَحصن للْفَرجِ ، ومن لَم یستطع فَعلَیـه بِالـصومِ ، فَإِنـه لَـه وِجاءٌ))**[١٤٠].

واتە : ئەی چینی گەنجان هەر کەس لـە ئێـوە توانـای ژن هێنـانی هەیـە ئـەوا بـا ژن بێنێت ، چونکە ژن هێنان چاو دەگرێتەوە لە نەزەر کـردن و قەڵایەکیـشە بـۆ عـەورەت و دەپارێزێت ، وە هەر کـەس توانـای ژن هێنـانی نیـیە ئـەوا بـا ڕۆژو بگرێـت چـونکە ڕۆژو دەبێتە پارێزەر بۆی .

هەروەها ئەمە ئافرەتیش دەگرێتەوە چونکە ئەویش دەبێـت مێـرد بکـات بـۆ ئـەوەی چاوی بگرێتەوە لە نەزەر کردن و قەڵایەکیش بێت بۆی بـۆ پاراسـتی عـەورەتی لـە کـاری حەرام .

---

[١٤٠] **صحیح البخاري رقم : (٥٠٦٦) وصحیح مسلم رقم : (٣٤٦٤) .**

وە ئەگەر مێردی بۆ نەبوو ئەوا دەبێت ڕۆژو بگرێت چونکە ڕۆژو دەبێتە پارێزەر بۆی

.

جا ئەگەر (دامرکاندنەوەی شەهوەت بە دەست) دروست بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێنمایی گەنجانی بۆ دەکرد ، بەڵام دەبینین ڕێنمایی گەنجانی کردووە بۆ ڕۆژو گرتن بۆ ئەوەی زەوق و شەهوەتیان کەم بێتەوە و لاواز بێت .

کەواتە پێویستە تۆ تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەیت بۆ ئەوەی خوا لێت خۆش ببێت ، وە مەرجەکانی تەوبەی ڕاستەقینەش ئەمانەن :

أ / پەشیمان بوونەوە لە تاوانەکانت .

ب / وازهێنان لە تاوانەکان .

ج / بڕیار دان بۆ ئەنجامنەدانیان لە داهاتوودا .

جار ئەگەر بەم شێوازە تەوبەت کرد و وازت هێنا لە تاوان و خراپە کردن و دەستت کرد بە چاکە کردن ئەوا خوا لێت خۆش دەبێت .

ـ ئایا پێت چۆنە لە کاتێکدا کە تۆ خەرکی ئەنجامدانی ئەو کارە ناشیرینەیت باوکت یان دایکت یان برایەکت بتبینێت ؟! ! یان خەڵکانێکی تر بتبینن ؟! ئایا هەڵوێستت چی دەبێت و هەست بە چی دەکەیت ؟! !

ئەی باشە خۆ چاك دەزانیت خوا دەتبینێت و ئاگای لێتە .. ئایا شەرم لە خوا ناکەیت ؟! !

ئایا ناترسیت لەو کاتەدا بمریت و بەو شێوازە بگەڕێیتەوە بۆ لای خوا ؟!

وە بێ ئومێد مەبە لە ڕەحم و لێخۆشبوونی خوا چونکە خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ [الزمر] .

بڵێ بە عەبدەکانم ئەوانەی کەوا ڕۆچوون لە ستەم کردن لە خۆیان بە تاوان کردن با بێ ئومێد نەبن لە ڕەحمەتی خوا ، بەڕاستی خوا لە هەموو تاوانەکان خۆش دەبێت ، بەڕاستی خوا لێبووردە و بە بەزەیی‌یە .

وە بۆ ئەوەی تەوبەکەت ڕاست و دروست بێت و خوا لێت خۆشبێت دەبێت ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدەیت :

ـ دەستکردن بە چاکەکاری و نزیك بوونەوە و تێکەڵاوی کردنی چاکەکاران و دوور کەوتنەوە لە خراپەکاری و خراپەکاران :

چونکە لە ئایەتەکانی **(سورة الفرقان)**دا خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿... إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا ... ﴿٧٠﴾﴾ **[الفرقان]** .

واتە : ئیللا کەسێك نەبێت کەوا تەوبە دەکات و ئیمان و باوەڕ دەهێنێت و کردەوەی چاکە دەکات .

**وعن أبي طَويلٍ شطَبٍ الْممدود أنه أتى رسولَ الله (ﷺ) فَقَالَ : ((أرأيت رجلا عمل الذنوب كُلها ، فَلَم يترك منها شيئاً ، وهو في ذَلك لَم يترك حاجةً ولا داجةً إلا أتاها ، فَهلْ لَه من توبة ؟ قَالَ : فَهلْ أسلَمت ؟ قَالَ : أما أنا فَأشهد أنْ لا إِلَه إلا الله وحده لا شريك لَه ، وأنك رسولُ الله ، قَالَ : نعم ، تفْعلُ الْخيرات وتترك السيئَات ، فَيجعلُهن الله لَك خيرات كُلهن ، قَالَ : وغَدراتي وفَجراتي ؟ قَالَ : نعم ، قَالَ : الله أكْبر ، فَما زالَ يكَبر حتى توارى))[١٤١] .**

واتە : (**أبي طويل**) هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی : هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە کەسێك کەوا هەموو تاوانەکانی کردبێت و هچیانی بە جێ نەهێشتبێت وە ئەو کەسە لە تاونکاریدا هیچی بە جێ نەهێشتبێت ئیللا کردبێتی ، ئایا ئەو کەسە بۆی هەیە تەوبە بکات ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئایا تۆ موسڵمان بوویت ؟

---

[١٤١] **صحيح الترغيب رقم : (٣١٦٤) والصحيحة رقم : (٣٣٩١) .**

وتی : من شایەتی دەدەم کەوا هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت ئیللا خوا نەبێت و تۆش پێغەمبەری خوایت .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەگەر کاری خێر و چاکە بکەیت و وازبێنیت لە خراپە و تاوانەکان ئەوا خوا هەموویت بۆ دەکات بە چاکە .

وتی : ئەی غەدر و خیانەت و تاوانکاریەکانمیش ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەڵێ .

وتی : خوا چەند گەورەیە (اللە أكبر) .

لە بەر ئەمە ئەو کابرایە بەردەوام دەیوت : خوا چەند گەورەیە (اللە أكبر) تاوەکو لە پێش چاو وون بوو .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((اتق الله حيثُما كُنت ، وأتبع السيئةَ الْحسنةَ تمحها ، وخالق الناس بِخلُقٍ حسنٍ))[١٤٢].**

واتە : لە خوا بترسە و خۆپارێزی بکە لە تاوان لە هەر کوێك هەبیت ، وە بە دوای تاوان و خراپەدا خێر و چاکەیەك بکە بۆ ئەوەی بیسڕێتەوە ، وە هەڵسوکەوت بکە لەگەڵ خەڵدا بە ڕەوشتی چاك و جوان .

وە ئامۆژگاری تۆ و ئەو کەسانەش دەکەم کە بەم تاوانە و جگە لەمەش گرفتار بوون بە :

وازهێنان و دوور کەوتنەوە و بە جێهێشتنی هاوەڵ و برادەری خراپ و تاوانبار و دوور لە خوا ، وە بە پێچەوانەشەوە نزیك بوونەوە و تێکەڵاوی کردنی هاوەڵ و برادەری خوا ناس و چاکەکار ، چونکە هاوەڵ و برادەر کاریگەریان هەیە بۆ دوور کەوتنەوە لە تاوان بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((إنما مثَـلُ الجلـيس الصالحِ والْجليسِ السوءِ : كَحاملِ الْمسك ونافخِ الْكـ ِ ، فَحاملُ الْمسك إما أنْ يحذيك ، وإما**

---

[١٤٢] **صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٥٥) .**

**أنْ تبتاع منه ، وإما أنْ تجِد منه ريحاً طَيبةً ، ونافخ الكـ ِ إما أنْ يحرق ثيابك ، وإما أنْ تجِد ريحاً خبِيثَةً))**[١٤٣].

واتە : نموونەی هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ : وەكو هەڵگری بۆنی میسك (واتە بۆن فرۆش) و فۆكار بە كوورەدا (واتە ئاسنگەر) وایە ، جا هەڵگری بۆنی میسك یان لەو بۆنەت پێدەبەخشێت یان لێی دەكڕیت یان بۆنی خۆشی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت ، بەڵام فۆكار بە كوورەدا یان جلەكانت دەسوتێنێت یان بۆنی پیسی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ تصاحب إلا مؤمناً ، ولاَ يأكُلْ طَعامك إلا تقي))** [١٤٤].

واتە : هاوەڵێتی ئیماندار نەبێت نەیكەیت ، وە با كەس خواردنت نەخوات ئیللا كەسێكی لە خوا ترس و خۆپارێز لە تاوان نەبێت .

وە بۆ ئەوەی لەم تاوانە ڕزگارەت ببێت ئەوا دەبێت ئەم كرانەی خوارە ئەنجام بدەیت :

١ ـ هەوڵبدە شوو بكە بە پیاوێكی بە دین و بە ئەخلاق .

٢ ـ ئەگەر ئەوەت بۆ نەكرا ئەوا ڕۆژووی سوننەت زۆر بگرە بە تایبەت دووشەمان و پێنجشەمان بۆ كەم بوونەوە و دامركاندنەوەی زەوق و شەهوەت .

٣ ـ وازهێنان لە سەریر كردنی كەناڵە ئاسمانیيە خراپەكان .

٤ ـ وازهێنان لە هاوڕێی خراپ و نەخوێندنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامە خراپەكان .

٥ ـ تێكڵاوی نەكردنی ئەو جێگایانەی كە دەبێتە هاندەرت بۆ ئەو تاوانە .

٦ ـ دەست بكە بە قورئان خوێندن و لە خوا بپاڕێتەوە بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات بۆ وازهێنان لەو تاوانە

---

[١٤٣] **صحيح البخاري رقم : (٢١٠١) و (٥٥٣٤) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٢٨) من حديث أبـي موسى ، واللفظ الـ ـمذكور لـمسلم .**

[١٤٤] **صحيح أ داود رقم : (٤٨٣٢) .**

٧ ـ خوێندنەوەی کتێب و گۆڤار و نامیلکە بە سوودەکانی ڕێگای ڕاست و سایتی بەهەشت .

**پ٧٤ / بەڕێزان من تاوانی دەستپەڕم کردوە ، ئایا چ ڕێگاچارەیەک بگرمەبەر بۆ ئەوەی بتوانم وازبێنم لەم تاوانە ؟**

وەڵام /

پێویستە تۆ چەند ڕێگایەك بگریتە بەر بۆ ڕزگارت بوونت لەو تاوانە قەبیحە :

١ ـ دەبێت تۆ مەرجەکانی تەوبە کردنی ڕاستەقینە و دروست بزانیت و پەیوەست بیت پێیانەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر نەگەڕێیتەوە سەر ئەو تاوانە قەبیحە :

**مەرجەکانی تەوبە کردن بە ڕاستی :**

أ / پەشیمان بوونەوە لە تاوانەکانی ڕابووردووت .

ب / وازهێنان لە تاوانەکان لە ئێستادا .

ج / بڕیار دان لەسەر ئەنجامنەدانیان لە داهاتوودا .

جار ئەگەر بەم شێوازە تەوبەت کرد و وازت هێنا لە تاوان و خراپە کردن و دەستت کرد بە چاکە کردن ئەوا خوا لێت خۆش دەبێت .

٢ ـ ئایا پێت چۆنە لە کاتێکدا کە تۆ خەرکی ئەنجامدانی ئەو کارە ناشیرینەیت باوکت یان دایکت یان برایەکت بتبینێت ؟! ! یان خەڵکانێکی تر بتبینن ؟! ئایا هەڵوێستت چی دەبێت و هەست بە چی دەکەیت ؟! !

ئەی باشە خۆ چاك دەزانیت خوا دەتبینێت و ئاگای لێتە .. ئایا شەرم لە خوا ناکەیت ؟! !

ئایا ناترسیت لەو کاتەدا بمریت و بەو شێوازە بگەڕێیتەوە بۆ لای خوا ؟!

٣ ـ ئایا دەزانیت ئەو کارە کارێکی حەرامە و ناشەرعیە و دروست نیە لە بەر ئەم بەڵگانەی خوارەوە :

أ ـ خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ۝٧ ﴾ [المؤمنون]

.

واتە : ئەوانەی کە عەورەتیان دەپارێزن ئیللا لە خێزانەکانیان و کەنیزەکەکانیان نەبێت ئەوانە لەمەدا هیچ لۆمەیەکیان لە سەر نیە ، هەر کەسێك بەدوای جگە لەمەدا بگەڕێت و عەورەتی تێدا بە کار بێنێت ئەوا ئەوانە سنوری خوایان شکاندووە و تەعەدا و ستەمیان کردووە .

ب ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((يا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج ، فإنه أغض للبصر وأحصن للفرج ، ومن لم يستطع فعليه بالصوم ، فإنه له وجاء))[١٤٥].**

واتە : ئەی چینی گەنجان هەر کەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە ئەوا با ژن بێنێت ، چونکە ژن هێنان چاو دەگرێتەوە لە نەزەر کردن و قەڵایەکیشە بۆ عەورەت و دەپارێزێت ، وە هەر کەس توانای ژن هێنانی نیە ئەوا با ڕۆژو بگرێت چونکە ڕۆژو دەبێتە پارێزەر بۆی .

جا ئەگەر (دامرکاندنەوەی شەهوەت بە دەست) دروست بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێنمایی گەنجانی بۆ دەکرد ، بەڵام دەبینین ڕێنمایی گەنجانی کردووە بۆ ڕۆژو گرتن بۆ ئەوەی زەوق و شەهوەتیان کەم بێتەوە و لاواز بێت .

هەروەها ئەم کارە زیان و زەرەری زۆری هەیە بۆ ئەنجامدەرەکەی ، لەوانە :

ـ ئەوانەی کە زۆر ئەم کارە ئەنجامدەدەن لە کاتی ژن هێناندا دوچاری ئەوە دەبنەوە کە ئاویان نەیەتەوە بە جووت بوون چونکە ئەو بە شێوازێکی تر ڕاهاتووە .

ـ هەندێك لەو کەسانە زەکەریان هەڵناسێت بۆ جووت بوون لەگەڵ ژنەکەیدا .

---

[١٤٥] صحيح البخاري رقم : (٥٠٦٦) وصحيح مسلم رقم : (٣٤٦٤) .

ـ یان ئاویان زوو دێتە دەرەوە ، بەمەش ناتوانێت مافـی خـۆی و هاوسـەرەکەی بـە تەواوی بدات .

ـ ئەم کارە هۆکارێکە بۆ توشبوون بە نەخۆشی فەقەرات .

ـ هەروەها چەندین زیانی تر ...

٤ ـ وە ئەگەر جارێکی تر ویستت ئەم کارە بکەیت یـان هـەر کـارێکی تـری ناشـەرعی ئەوا :

ـ تاوانەکە لە شوێن و جێگایەکدا ئەنجامی بدە کە موڵکی خوا نەبێت !

ـ یان لە کاتێکدا ئەنجامی بدە کە ڕزقی خوا نەخۆیت و لە لایەن کەسێکی ترەوە ڕزق بۆ خۆت پەیدا بکە !

ـ یان لە شوێن و جێگایەکدا ئەنجامی بدە کە خوا نەتبینێت تێیدا !

ئایا چی دەڵێیت ؟!!

دەتوانیت وا بکەیت ؟!! ئەگەر ناتوانیت ـ بێ گومان ناشتوانیت ـ ئەوا شـەرم بکـە و خۆت بە دوو بگرە لە خراپەکاری ..

٥ ـ ئامۆژگاریـت دەکـەم بـە خوێندنـەوەی قورئـان و کتـێبی شـەرعی بـە سـوود و هاوەڵێتی کردنی کەسانێك کە دەسـتت بگـرن و بـەرەو مزگـەوت بتبـەن و ڕێگـای خێـر و چاکەت پێشان بدەن و وریا و ئاگادارت بکەنەوە لە تاوان و خراپەکان .

وە ئامۆژگاریـت دەکـەم بـە وازهێنـان و دوور کەوتنـەوە و بـە جێهێـشتنی هـاوەڵ و بـرادەری خـراپ و تاوانبـار و دوور لـە خـوا ، وە بـە پێـچەوانەشەوە نزیـك بوونـەوە و تێکـەڵاوی کردنـی هـاوەڵ و بـرادەری خـوا نـاس و چـاکەکار ، چـونکە هـاوەڵ و بـرادەر کاریگەریان هەیە بۆ دوور کەوتنەوە لە تـاوان بـە بەڵگـەی ئـەم فەرموودەیـە : پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی : **((إنما مَثَلُ الْجليسِ الصالحِ والْجليسِ السوءِ : كَحاملِ الْمسك ونـافخِ**

**الكـ ِ ، فَحاملُ الْمسك إما أَنْ يحذيك ، وإما أَنْ تبتاع منه ، وإما أَنْ تجِد منه رِيحاً طَيبــةً ، ونافخ الكـ ِ إما أَنْ يحرق ثيابك ، وإما أَنْ تجِد رِيحاً خبِيثَةً))[١٤٦].**

واتە : نموونەی هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ : وەكو هەڵگری بۆنی میسك (واتە بۆن فرۆش) و فوكار بە كوورەدا (واتە ئاسنگەر) وایە ، جا هەڵگری بۆنی میسك یان لەو بۆنەت پێدەبەخشێت یان لێی دەكڕیت یان بۆنی خۆشی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت ، بەڵام فوكار بە كوورەدا یان جلەكانت دەسوتێنێت یان بۆنی پیسی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ تصاحب إلا مؤمناً ، ولاَ يأْكُلْ طَعامك إلا تقي))[١٤٧].**

واتە : هاوەڵێتی ئیماندار نەبێت نەیكەیت ، وە با كەس خواردنت نەخوات ئیللا كەسێكی لە خوا ترس و خۆپارێز لە تاوان نەبێت .

وە ئامۆژگاریت دەكەم بە دوور كەوتنەوە و بە جێهێشتنی ئەو شوێن و جێگایەی كەوا تاوانی تێدا دەست دەكەوێت ، بە بەڵگەی فەرموودەی ئەو كەسەی كەوا سەد كەسی كوشت و پاشان تەوبەی كرد : پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : **((اخرج من الْقَريــة الْخبِيثَة التي أنت فيها إِلَى الْقَرية الصالحة قَرية كَذَا وكَذَا [فَإِن بِها أُناساً يعبدونَ الله] فَاعبــد ربك [معهم] فيها ، [ولاَ ترجِع إِلَى أَرضك فَإِنها أَرض سوءٍ]))[١٤٨].**

واتە : دەرچوو لەو گوندە پیسەی كە تۆ تێیدا دەژیت و بڕۆ بۆ ئەو گوندە چاكەی كەوا خەڵكانێكی تێدایە خوا دەپەرستن و تۆش لەگەڵ ئەواندا خوای پەروەردگارت بپەرستە تێیدا ، وە نەگەڕێیتەوە بۆ زەویەكەی خۆت چونكە خەڵكەكەی خراپە .

---

[١٤٦] صحيح البخاري رقم : (٢١٠١) و (٥٥٣٤) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٢٨) .

[١٤٧] صحيح أ داود رقم : (٤٨٣٢) .

[١٤٨] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٤٠) .

٦ ـ وە ئامۆژگاریت دەکەم بە خۆپارێزی کردن لە نەزەر کردن و تێکەڵاوی ئافرەتـان و بە تەنها مانەوە لەگەڵ ئافرەتی بیگانە و نامەحرەمدا .. چونکە ئەمانە دەبنـە هانـدەر بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە خراپە ..

وە ئامۆژگاریت دەکەم بە ژن هێنـان ، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی : **((یـا معشر الشبابِ من استطاع منكُم الباءَةَ فَليتزوج ، فَإنه أغَضُ للبصرِ وأحصن للفَرجِ ، ومن لَم يستطع فَعليه بِالصومِ ، فَإنه لَه وجاءٌ))**[149].

واتە : ئەی کۆمەڵی لاوان هەر یەکێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەبوو با ژن بهێنێـت ، چـونکە زیـاتر چـاو دەپارێزێـت لـە بینینـی نـاڕەوا ، و پارێزەریـشە لـە کەوتنـە داوێـن پیسیەوە ، ئەوەش توانای ژن هێنانی نەبوو ، با پەنا بەرێتـە بـەر ڕۆژوو گـرتن ، چـونکە ڕۆژوو پارێزەرە بۆی .

بە هەموو ئەم کارانە ـ **إن شاء الله** ـ ڕزگارت دەبێت لەو تاوانە .

**پ٧٥ / چارەسەری گونجاو چیـە بـۆ ئـەو گەنجانـەی کـە تووشی (ئاوی شـەهوەت هێنانەوە بە دەست) بوون ؟**

وەڵام /

چارەسەری گونجـاو بـۆ ئـەو گەنجانـەی کـە تووشـی (ئـاوی شـەهوەت هێنانـەوە بـە دەست) بوون بریتی‌یە لەم خاڵانەی خوارەوە :

١ ـ سەرەتا دەبێت بزانیت ئەنجامدانی ئەو کارە حەرامە و تاوانە .

٢ ـ پێویستە گەنجان ژن بێنن و لە حەڵاڵی خۆیاندا ئارەزوویان دابمرکێننەوە .

٣ ـ ئەگـەر ژنیـان پێنـەهێنرا ئـەوا دەبێـت ڕۆژووی سـوننەت زۆر بگـرن ، بـۆ ئـەوەی شەهوەتیان بشکێنێت .

---

[149] صحيح البخاري رقم : (٥٠٦٦) وصحيح مسلم رقم : (٣٤٦٤) .

٤ ـ وە دەبێت خۆیان بپارێزن و خۆیان بە دوور بگرن لە نێواندانەدا کە شەهوەت و ئارەزوو دەورووژێنێت وەك تێکڵاو بوونی ئافرەتان و نەزەر کردنی حەرام .

٥ ـ وە دەبێت هاوڕێی چاك و لە خوا ترس هەڵبژێرن بۆ هاوەڵێتی خۆیان بۆ ئەوەی هاندەریان بن بۆ کاری چاکە و دوور کەوتنەوە لە خراپە .

## پەیوەندی نێوان کوڕان و کچان :

**پ٧٦ / من لە دائیرەیەک دەوام دەکەم لەگەڵ ئافرەتێکدا حەزمان لە یەکە بەڵام ئەم ئافرەتە شوی کردووە و منداڵیشی هەیە درسوتە تەڵاقی خۆی لە مێردەکەی بسێنێ و من مارەی بکەم؟**

وەڵام /

نەخێر دروست نی‌یە بۆ تۆ ئەو ئافرەتە لە خۆت مارە بکەیت !

چونکە ئەوە ئافرەتێکی خیانەت کارە و شایەنی ئەوە نی‌یە کەوا گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵدا ببەسرێت .

باشە ئایە تۆ لە خوا ناترسیت کەوا پەیوەندیت هەیە لەگەڵ ئافرەتێکدا کە خاوەنی مێرد و منداڵیشە لەو مێردە ؟!!!

من پرسیارێکت لێ‌دەکەم (داواکاریشم جوان لێم تێبگەیت) : ئەگەر تۆ خۆت خاون خێزان بیت ئایە پێت چۆنە ئەو خێزانەت پەیوەندی هەبێت لەگەڵ پیاوێکی تردا بە دزی تۆوە ؟!! ئایە ئەو خیانەتەت پێ باشە ؟!!

ئایا خۆت دایك و خوشکت نی‌یە ؟ ئایە شتی وات پێ خۆشە بۆ دایك و خوشکی خۆت ؟!!

بێ گومان لە وەڵامدا دەڵێیت : نەخێر .

کەواتە نابێت بۆ خێزان و دایك و خوشکی خەڵکی تریش کاری وات پێت خۆش بێت .

**عن أبِي أُمامةَ (رضي الله عنه) قَالَ : ((إن فَتى شاباً أتى النبِي (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ يا رسولَ الله : ائْذَنْ لـي بِالزنا ، فَأَقْبلَ الْقَوم علَيه فَزجروه وقَالُوا : مه مه !**

فَقَالَ : ادنه ، فَدنا منه قَريباً ، قَالَ : فَجلَس .

قَالَ : أتحبه لأمك ؟

قَالَ : لاَ ، والله جعلَنِي الله فداك .

قَالَ : ولاَ الناس يحبونه لأمهاتهم .

قَالَ : أفَتحبه لابنتك ؟

قَالَ : لاَ ، والله جعلَنِي الله فداك .

قَالَ : ولاَ الناس يحبونه لبناتهم .

قَالَ : أفَتحبه لأختك ؟

قَالَ : لاَ ، والله جعلَنِي الله فداك .

قَالَ : ولاَ الناس يحبونه لأخواتهم .

قَالَ : أفَتحبه لعمتك ؟

قَالَ : لاَ ، والله جعلَنِي الله فداك .

قَالَ : ولاَ الناس يحبونه لعماتهم ؟

قَالَ : أفَتحبه لخالَتك ؟

قَالَ : لاَ ، والله جعلَنِي الله فداك .

قَالَ : ولاَ الناس يحبونه لخالاَتهم .

قَالَ : فَوضع يده علَيه ، وقَالَ : اللهم اغْفر ذَنبه ، وطَهر قَلْبه ، وحصن فَرجه .

قَالَ : فَلَم يكُن بعد ذَلك الْفَتى يلْتفت إِلَى شيءٍ))(١٥٠).

واتە : گەنجێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتـی : ئـەی پێغەمبـەری خـوا مۆڵـەتم بدرێ بۆ زینا (دامێن پیسی) كردن ، خەڵكەكەش رویـان تـێكرد و سەرزەنـشتیان كـرد و پێیان وت : وس بە وس بە !

---

(١٥٠) سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٣٧٠) .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) پێی فەرموو : نزیك ببەرەوە ، ئەویش نزیك بووەوە لـێی .

فەرمووی : ئەنجا دانیشت .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : ئایە زینا (دامێن پیسی) کردنت پـێ خۆشـە بـۆ دایکت ؟

وتی : نەخێر سوێند بە خوا ، خوا بمکاتە قوربانت .

پێغەمبەری خـوایش (ﷺ) پـێی فـەرموو : بـە هـەمان شـێوە خـەڵکیش زینـا (دامـێن پیسی)یان پێخۆش نی‌یە بۆ دایکیان .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : ئایە زینا (دامێن پیسی) کردنت پێ خۆشـە بـۆ کچەکەت ؟

وتی : نەخێر سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ، خوا بمکاتە قوربانت .

پێغەمبەری خـوایش (ﷺ) پـێی فـەرموو : بـە هـەمان شـێوە خـەڵکیش زینـا (دامـێن پیسی)یان پێخۆش نی‌یە بۆ کچەکانیان .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : ئایە زینا (دامێن پیسی) کردنت پـێ خۆشـە بـۆ خوشکەکەت ؟

وتی : نەخێر سوێند بە خوا ، خوا بمکاتە قوربانت .

پێغەمبەری خـوایش (ﷺ) پـێی فـەرموو : بـە هـەمان شـێوە خـەڵکیش زینـا (دامـێن پیسی)یان پێخۆش نی‌یە بۆ خوشکەکانیان .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : ئایە زینا (دامێن پیسی) کردنت پـێ خۆشـە بـۆ پورت (خوشکی باوکت) ؟

وتی : نەخێر سوێند بە خوا ، خوا بمکاتە قوربانت .

پێغەمبەری خـوایش (ﷺ) پـێی فـەرموو : بـە هـەمان شـێوە خـەڵکیش زینـا (دامـێن پیسی)یان پێخۆش نی‌یە بۆ پورەکانیان .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : ئایە زینا (دامێن پیسی) کردنت پێ خۆشە بۆ پورت (خوشکی دایکت) ؟

وتی : نەخێر سوێند بە خوا ، خوا بمکاتە قوربانت .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) پێی فەرموو : بە هەمان شێوە خەڵکیش زینا (دامێن پیسی)یان پێخۆش نیە بۆ پورەکانیان .

ئەنجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی خستە سەر دەمی گەنجەکە و فەرمووی : خوایە لە تاوانی خۆشبە و دڵی پاك کەرەوە و دامێنیشی بپارێزە .

جا دوای ئەوە ئەو گەنجە لای نەدەکردەوە بۆ لای هیچ شتێك .

کەواتە دەبێت موسڵمان بەم شێوەیە بیر بکاتەوە ، بۆ ئەوەی بزانێت چۆن مامەڵە دەکات لەگەڵ ئافرەتانی دەوروبەری .

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لا يؤمن أحدكُم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفْسِه))**[151].

واتە : هیچ کەسێك لە ئێوە ئیمانی نیە تاوەکو ئەوەی پێخۆش نەبێت کە بۆ خوودی خۆی پێی خۆشە .

جا هەر شتێکت بۆ خۆت پێخۆش بوو ئەوا لەگەڵ خەڵیشدا ئاوەها بە ، وە هەر شتێکت بۆ خۆت پێناخۆش بوو ئەوا لەگەڵ خەڵیشدا ئەنجامی مەدە .

بۆیە پێویستە لەسەرت تەوبە بکەیت و پەیوەندیت ببڕیت لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا و بە دوای کچێکی بە دین و خاوەن ڕەوشت و ئەخلاقدا بگەڕێ بۆ ئەوەی خیانەتت لێ نەکات .

---

[151] **صحيح البخاري رقم : () وصحيح مسلم رقم : () .**

**پ٧٧ / بە ناوی خودا ، سڵاو ، دەستان خۆش ، من خوشکێکم هەیە شەوانە بە مۆبایل زۆر قسە دەکات لەگەڵ کەسی بەرامبەر بە بێ ئاگاداری ماڵەوە ئەمەوێت ماڵەوەی لێئاگادارکەمەوە چونکە بە قسەم ناکات ، چی بکەم باشە چونکە ناتوانم بێدەنگ بم ؟**

وەڵام /

زۆر پێویستە بە زووترین کات ژیرترین و داناترین کەسی ماڵەوەی خۆتان ئاگادار بکەیتەوە لەو کارە ناشەرعی‌یەی خوشکەکەت بۆ ئەوەی نەکەوێتە ناو داو و تەڵەکەی شەیتان و گورگە چاو برسی‌یەکانی شەرەف و ناموس و حەیای خوشکەکەت ، جا چی تر بێ دەنگ مەبە و ژیرترین و داناترین کەسی ماڵەوەی لێ ئاگادار بکەرەوە و بیخەنە ژێر چاودێریەوە و بەرامیش بە لە ئامۆژگاری کردنی و دەستی بگرە و هەوڵ بدە هاوڕێی چاك و لە خوا ترسی بۆ دۆزەرەوە و پێشی بڵێ با تەوبە بکات و چی تر موزایەدە بە شەرەف و ناموسی خۆی نەکات لەگەڵ کوڕانی بێ غیرەت و بێ وەفا و لە خوا نەترسدا .

**پ٧٨ / حوکمی نامە گۆڕینەوە لە نێوان کوڕ و کچدا بە نی‌یەتی مارەکردنی لە داهاتودا ؟**

وەڵام /

دروست نی‌یە بۆ هیچ پیاوێك کەوا نامە بگۆڕێتەوە لەگەڵ ئافرەتێکدا کە نامەحرەمی بێت چونکە ئەمە دەبێتە مایەی فیتنە و تاوان ، هەرچەندە بشڵێن ئێمە مەبەستمان پاکە و لە داهاتودا خێزانێك پێك دێنین ! ئەم بیانوە نابێتە ڕێدەر بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ناشەرعی‌یە ، وە لەوانەیە شەیتان لەم ڕێگەیەوە هەوڵ بدات بۆ هەڵخەڵەتاندیان و هانیان بدات و سەریان لە تاوان و کاری نابەجێوە دەربکات ، چونکە ئەو دوو کوڕ و کچە هیچ پەیوەندی‌یەکی شەرعی لە نێوانیاندا نی‌یە ، کەواتە نابێت نامە لەگەڵ یەکتردا بگۆڕنەوە تاوەکو مارەی دەبڕێت و دەبن بە هاوسەری یەکتر .

وە زۆربەی ئەم کارانە سەر لە دڵداری و عیشقەوە دەردەکات بەڵکو ئەم نامەگۆڕینەوەیە پاڵنەر بۆی بریتیەیە لە خۆشەویستی و عیشق ! نەك نیەتی پاك !!!

**پ ٧٩ / کەی خۆشەویستی حەڵاڵە ؟**

وەڵام /

خۆشەویستی نێوان کوڕ و کچ دوای مارە بڕین حەڵاڵە .. بەڵام لە پێش مارە بڕین ئەوا سەیر کردنی یەکتر و بە یەکتر گەیشتن و قەسە کردن لەگەڵ یەکتردا و نامە گۆڕینەوە و هاوشێوەکانی ئەمانە لە نێوان کوڕ و کچدا حەرامە و بە هیچ شێوەیەك دروست نیە .. وە ئەگەر خوای گەورە خوازبێنی کچێکی خستە ناو دڵی کوڕێکەوە ئەوا دەبێت ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بگرێتە بەر :

١ ـ سەرتا دەبێت بە دوای کچێکی دیندار و بە ڕەوشت و خاوەن ئیمان و ئەخلاقدا بگەڕێیت ، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۝٣﴾ [النساء] .

واتە : لەو ئافرەتانە بخوازن کەوا پاکن .

واتە : ئافرەتێك کە بیروباوەڕی پاك بێت ، وە ئەخلاق و ڕەوشتی پاك بێت ، وە ڕابوردووی پاك بێت ، وە ئێستای پاك بێت ..

وە پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی : **((تنكَح المرأةُ لأربعٍ : لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينِها ، فَاظفَر بِذَات الدين تربت يداك))**[152].

واتە : خەڵك لە بەر چوار هۆکار ژن دەخوازن : بۆ پارەکەی و ناوداریەکەی و جوانیەکەی و دینداریەکەی ، جا تۆ خاوەن دینداریەکەیان دەستی خۆت بخە دەستت بچێت بە خێردا .

---

(١٥٢) صحيح البخاري رقم : (٥٠٩٠) وصحيح مسلم رقم : () .

٢ ـ ئەنجا لە پاش دۆزینەوە و دەستنیشان کردنی کچێکی دیندار و بە ڕەوشت و خاوەن ئیمان و ئەخلاق پێویستە بڕۆیت سەیری کچەکە بکەیت و بیبینیت بۆ ئەوەی بزانیت ئایا بە دیمەنی ڕازی دەبیت ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إذَا أَلْقَى الله في قَلْبِ امرئٍ خطبةَ امرأة فَلاَ بأس أَنْ ينظُر إليها))**[١٥٣].

واتە : ئەگەر خوای گەورە خوازبێنی کچێکی خستە ناو دڵی کەسێکەوە ئەوا هیچی تێدا سەیری بکات و بیبینێت .

**عن أنس بن مالك : أن المغ ةَ بن شعبةَ أراد أَنْ يتزوج امرأةً فَقَالَ له النبي (ﷺ) : ((اذْهب فَانظُر إليها فَإنه أحرى أَنْ يؤدم بينكُما)) فَفَعلَ فَتزوجها**[١٥٤].

واتە : (**أ غ ة بن شعبة**) ویستی ژنێك بخوازێت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : بڕۆ سەیری بکە و بیبینە چونکە ئەوە لە پێشترە بۆ ئەوەی بە یەکەوە بگونجێن و پێکبێن ، ئەویش سەیری کرد و مارەی کرد .

٣ ـ دوای هەڵبژاردنی کچێکی خاوەن ئیمان و ئەخلاق و سەیر کردن و بینینی دەچیتە خوازبێنی کچەکە و داوای دەکەیت لە سەرپەرشتیارەکەی (باوکی بێت یان برا یان باپیر یان مام ...) .

جا ئەگەر کچەکە و سەرپەرشتیارەکەشی بە کوڕەکە ڕازی بوون ئەوا کچەکەی لێ مارە دەکەن و بۆی مارە دەبڕن و دەبێتە خێزان و هاوسەری و لە یەکەم چرکەی مارەبڕنەوە خۆشەویستی لە نێوانیاندا حەڵاڵ دەبێت .

بەڵام هەبوونی پەیوەندی لە نێوان کوڕ و کچدا لە پێش مارە بڕینەوە بە هەموو شێوەیەك قەدەغە و حەرامە ئەگەر چی بە ناوی خۆشەویستیەوە بێت !! یان بە بیاونووی داخوازی کردنی کچەکەوە بێت !!

---

[١٥٣] **صحيح ابن ماجه رقم : (١٨٦٤) .**

[١٥٤] **صحيح ابن ماجه رقم : (١٨٦٥) .**

**پ٨٠ / من چوار ساڵە کچێکم خۆش ئەوێ ئەویش بە هەمان شێوە بەڵام دایک و باوکی ڕازی نین ، ئیستا کچەکە چووەتە تەمەنەوە و شوو ناکات ئایا دایک و باوکی تاوانبارن ؟**

وەڵام /

هەر کاتێك کوڕێکی خاوەن دین و ئەخلاق هاتە خوازبێنی کچێك ئەوا نابێت باوك و دایکی ئەو کچە ڕێگری بکەن لە بە شوودانی کچەکەیان ئەگەر کچەکە ڕازی بێت بەو کوڕە و هیچ گرفتێك نەبێت بۆ سەرنەگرتنی ئەو پرۆژەیە .

**عن أبِي هريرةَ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((إِذَا خطَب إِلَيكُم من ترضونَ دينَه وخلُقَه فَزوجوه إِلا تفْعلُوا تكُن فتنةٌ في الْأَرض وفَساد عريض))[155].**

واتە : ئەگەر کەسێك خوازبێنی کچی لێتان کرد کە ئێوە لە دین و ئەخلاق و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا ژنی بدەنێ ، وە ئەگەر ئەمەتان نەکرد ئەوا لە سەر زەویدا فیتنە و گەندەڵکاریەکی بەرفراوان ڕوودەدات .

**وفي رواية أخرى : ((إِذَا جاءَكُم من ترضونَ دينه وخلُقَه فَأَنكحوه إِلا تفْعلُوا تكُن فتنةٌ في الْأَرض وفَساد ، قَالُوا : يا رسولَ الله وإِنْ كَانَ فيه ، قَالَ : إِذَا جاءَكُم من ترضونَ دينَه وخلُقَه فَأَنكحوه ، ثَلاثَ مرات))[156].**

واتە : ئەگەر کەسێك هات و خوازبێنی کچی لێتان کرد کە ئێوە لە دین و ئەخلاق و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا ژنی لێ مارە بکەن ، وە ئەگەر ئەمەتان نەکرد ئەوا لە سەر زەویدا فیتنە و گەندەڵکاری ڕوودەدات ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا : ئەی ئەگەر کەم و کوڕیەکی تێدا هەبوو - وەکو پارەی کەم بوو یان هاوئاست نەبوو - ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ئەگەر کەسێك هات و خوازبێنی کچی لێتان کرد کە ئێوە لە دین و ئەخلاق و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا ژنی لێ مارە بکەن ﴿سێ جار ئەمەی فەرموو﴾ .

---

[155] صحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٨٤) .

[156] صحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٨٥) .

کەواتە پێویستە لە سەر بەخێوکار و سەرپەرشتیاری کچان دڵسۆز و غەم خۆری ڕاستەقینەیان بن ، و دەبێت ئەوەش بزانن هەروەکو چۆن پێویستە لە سەریان خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگیان بۆ دابین بکەن ئاوایش پێویستە لە سەریان هاوسەر و مێردی هاوبەشی ژیانیان بۆ هەڵبژێرن لەو کەسە دیندار و لە خوا ترس و ڕەوشت بەرزانەی کەوا دەبنە مایەی بەختەوەری و خۆش گوزرانی دونیا و دوا ڕۆژیان .

وە بە پێچەوانەوە ئەگەر بە بێ هۆکارێکی شایستە ببنە ڕێگر لە بە شوودانی کچەکەیان ئەو تاوانبار دەبن .

**تێبینیەك** : لە پرسیارەکەدا هاتووە (من چوار ساڵە کچێکم خۆش ئەوێ ئەویش بە هەمان شێوە ...) ئەگەر مەبەست بەم خۆشەویستیەیە عیشق و ئەوینی بووبێت و پەیوەندی لە نێوان هەردوو لادا دروست کردبێت و دەرگایەك بووبێت بوو قسە کردن و یەکتر بینین و نامەگۆڕینەوە لەگەڵ یەکتردا .. ئەوا کارێکی حەرام بووە و تاوانە و دەبێت هەردووکتان تەوبە بکەن و پەشیمان ببنەوە و واز لەو کارە بێنن .

وە ئەگەر مەبەست تەنها ویستی هاوسەر گیری بێت و بەس بە بێ پەیوەندی ئەوا هیچی تێدا نیە و خوا بۆتانی ئاسان بکات .

وە تەنها ڕێگاچارەی شەرعی بۆ ئێوە و هاوشێوەکانی ئێوە بریتیە لە زەواجی شەرعی وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لَم يرَ للمتحابين مثْلَ النكاح))**[157] .

واتە : کارێکی چاکتر نەبینراوە وەك زەواج بۆ کوڕ و کچێك کە یەکتریان خۆش بوێت .

---

[157] المستدرك للحاكم رقم : (٢٦٢٨) والمعجم الكبير للطبراني رقم : (١٠٧٣٦) وصححه الألباني صحيح سنن ابن ماجه رقم : (١٨٤٧) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٦٢٤) .

فائدة : ورد سبب ورود هذا الحديث قصة ـ لكن سندها ضعف ـ وهي : عن ابن عباس قال : جاء رجل إلى النبي (ﷺ) فقال : إن عندنا يتيمة وقد خطبها رجل معدم ورجل موسر وهي تهوى المعدم ونحن نهوى الموسر ؟ فقال (ﷺ) : ((لم ير للمتحابين مثْلَ النكاح)) [انظر : سلسلة الأحاديث الصحيحة : (٢ / ١٩٧ ـ ١٩٨] .

## زینا و بەدڕەوشتی :

**پ٨١ / ئایا زینا لێخۆشبوونی هەیە ؟**

وەڵام /

پێشەکی ئەوە بزانە کەوا زیناکردن و داوێن پیسی یەکێکە لە تاوانە گەورەکان و کارێکی زۆر نابەجێ و ترسناکە ، خوای گەورە لە قورئاندا فەموویەتی : ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ٣٢ ﴾ **[الإسراء] .**

واتە : نزیکی زینا مەبنەوە چونکە زیناکردن کارێکی زۆر ناشیرینە و ڕێگایەکی خراپە .

بەڵام ئەگەر کەسێك شەیتان هەڵیخەڵەتاند و نەفسی بەدکاری خیانەتی لێکرد و ئەم کارە زۆر ناشیرینەی کرد ئەوا پێویستە لەسەری ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجامدات بۆ ئەوەی خوا لێی خۆشببێت :

١ ـ تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوەیەکی ڕاستەقینە بۆ خوا :

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ٦٨ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ٧٠ ﴾ **[الفرقان] .**

واتە : وە ئەوانەی کەوا لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی تر ناپەرستن و هاواری تێناکەن و کەسێك ناکوژن کەوا خوا کوشتنی حەرام کردبێت ئیللا بە حەق نەبێت و زینا و داوێن پیسی ناکەن .. وە هەر کەسێك ئەمانە بکات ئەوا تاوانبار دەبێت و سزای تاوانەکەی دەبینێتەوە و لە ڕۆژی قیامەتدا سزاکەیان بۆ چەند قات دەکرێتەوە و بە سەرشۆڕی هەتاهەتایی تێدا دەمێنێتەوە .. ئیللا کەسێك نەبێت کەوا تەوبە دەکات و ئیمان و باوەڕ

دەهێنێت و کردەوەی چاکە دەکات ، ئا ئەوانە خوا خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێتەوە بە چاکە ، وە خوا لێبوردە و بە بەزەییە .

وە مەرجەکانی تەوبەکردنیش بریتین لە :

أ / پەشیمان بوونەوە لە تاوان .

ب / وازهێنان لە تاوان .

ج / بڕیار دان بۆ ئەنجامنەدانی لە داهاتوودا .

٢ ـ خۆ ستر کردن و ئاشکرا نەکردنی ئەو تاوانە :

**عن أبي هريرةَ (رضي الله عنه) قَالَ : سمعت رسولَ الله (ﷺ) يقُولُ : ((كُـل أمتـي معـافًى إلا المجاهرين ، وإن من المجاهرة أنْ يعملَ الرجلُ بِالليل عملاً ، ثُم يصبح وقَد ستره الله ، فَيقُولَ يا فُلاَنُ عملْت الْبارحةَ كَذَا وكَذَا ، وقَد بات يستره ربه ويصبِح يكْشف ستر الله عنه))[١٥٨].**

واتە : هەموو ئوممەتەکەم عەفو دەکرێت و چاوپۆشی لێدەکرێت ئیللا ئەوانە نەبێت کەوا تاوانەکانیان ئاشکرا دەکەن ، وە بەڕاستی بەشێك لە تاوان ئاشکرا کردن ئەوەیە کەوا پیاو بە شەو کارێك بکات و ئەنجا بەیانی ـ لە کاتێکدا کە خوا دایپۆشیوە ـ بڵێت : ئەی فڵان من شەوی ڕابردوو ئەو کارە و ئەو کارەم کردووە ، لە کاتێکدا کە لە شەودا خوای پەروەردگار دایپۆشیوە ، کەچی خۆی بەیانی خۆی ئاشکرا دەکات و ستر و پەردەی خوا لە سەر خۆی هەڵدەماڵێت .

٣ ـ دەستکردن بە چاکەکاری و نزیك بوونەوە و تێکەڵاوی کردنی چاکەکاران و دوور کەوتنەوە لە خراپەکاری و خراپەکاران :

چونکە لە ئایەتەکانی **(سورة الفرقان)**دا خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ ... إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا ... ﴿٧٠﴾ ﴾ **[الفرقان]** .

واتە : ئیللا کەسێك نەبێت کەوا تەوبە دەکات و ئیمان و باوەڕ دەهێنێت و کردەوەی چاکە دەکات .

---

[١٥٨] **صحيح البخاري رقم : (٦٠٦٩) وصحيح رقم : (٧٤١٠) .**

**وعن أبي طَويلٍ شطَبٍ الْممدود أنه أتى رسولَ الله (ﷺ) فَقَالَ : ((أرأيت رجـلا عمـلَ الذنوب كُلها ، فَلَم يترك منها شيئاً ، وهو في ذَلك لَم يترك حاجةً ولا داجةً إلا أتاها ، فَهلْ لَه من توبة ؟ قَالَ : فَهلْ أسلَمت ؟ قَالَ : أما أنا فَأشهد أنْ لا إلَه إلا الله وحده لا شريك لَـه ، وأنك رسولُ الله ، قَالَ : نعم ، تفْعلُ الْخيرات وتترك السيئَات ، فَيجعلُهن الله لَك خيـرات كُلهن ، قَالَ : وغَدراتي وفَجراتي ؟ قَالَ : نعم ، قَالَ : الله أكْبر ، فَمـا زالَ يكَبـر حتـى توارى))[159].**

واتە : (**أبـي طويل**) هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی : هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە كەسێك كەوا هەموو تاوانەكانی كردبێت و هچیانی بە جێ نەهێشتبێت وە ئەو كەسە لە تاونكاریدا هیچی بە جێ نەهێشتبێت ئیللا كردبێتی ، ئایا ئەو كەسە بۆی هەیە تەوبە بكات ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئایا تۆ موسڵمان بوویت ؟

وتی : من شایەتی دەدەم كەوا هیچ پەرستراوێك نیيە شایستەی پەرستن بێت ئیللا خوا نەبێت و تۆش پێغەمبەری خوایت .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەگەر كاری خێر و چاكە بكەیت و وازبێنیت لە خراپە و تاوانەكان ئەوا خوا هەموویت بۆ دەكات بە چاكە .

وتی : ئەی غەدر و خیانەت و تاوانكارییەكانمیش ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەڵێ .

وتی : خوا چەند گەورەیە (ا أكـ ) .

لە بەر ئەمە ئەو كابرایە بەردەوام دەیوت : خوا چەند گەورەیە (ا أكـ ) تاوەكو لە پێش چاو وون بوو .

---

[159] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (٣١٦٤) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٣٣٩١) .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((اتق الله حيثما كُنت ، وأتبع السيئةَ الْحسنةَ تمحها ، وخالق الناس بِخلُقٍ حسنٍ))**[١٦٠].

واتە : لە خوا بترسە و خۆپارێزی بکە لە تاوان لە هەر کوێك هەبیت ، وە بە دوای تاون و خراپەدا خێر و چاکەیەك بکە بۆ ئەوەی بیسڕێتەوە ، وە هەڵسوکەوت بکە لەگەڵ خەڵدا بە ڕەوشتی چاك و جوان .

وە ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکەم کە بەم تاوانە و جگە لەمەش گرفتار بوون کەوا ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی ڕزگاریان ببێت لە تاوانەکانیان :

١ ـ وازهێنان و دوور کەوتنەوە و بە جێهێشتنی هاوەڵ و برادەری خراپ و تاوانبار و دوور لە خوا ، وە بە پێچەوانەشەوە نزیك بوونەوە و تێکەڵاوی کردنی هاوەڵ و برادەری خوا ناس و چاکەکار ، چونکە هاوەڵ و برادەر کاریگەریان هەیە بۆ دوور کەوتنەوە لە تاوان بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((إنما مثَـلُ الْجالـيس الصالح والْجليس السوءِ : كَحامل الْمسك ونافخ الْكـ ِ ، فَحاملُ الْمسك إما أنْ يحذيك ، وإما أنْ تبتاع منه ، وإما أنْ تجِد منه ريحاً طَيبةً ، ونافخ الْكـ ِ إما أنْ يحرق ثيابك ، وإما أنْ تجِد ريحاً خبِيثَةً))**[١٦١].

واتە : نموونەی هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ : وەکو هەڵگری بۆنی میسك (واتە بۆن فرۆش) و فۆکار بە کوورەدا (واتە ئاسنگەر) وایە ، جا هەڵگری بۆنی میسك یان لەو بۆنەت پێدەبەخشێت یان لێی دەکڕیت یان بۆنی خۆشی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت ، بەڵام فۆکار بە کوورەدا یان جلەکانت دەسوتێنێت یان بۆنی پیسی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ تصاحب إلا مؤمناً ، ولاَ يأكُلْ طَعامك إلا تقي))**[١٦٢].

---

[١٦٠] صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٥٥) .

[١٦١] صحيح البخاري رقم : (٢١٠١) و (٥٥٣٤) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٢٨) .

[١٦٢] صحيح أ  داود رقم : (٤٨٣٢) .

واتـە : هـاوەڵێتی ئیمانـدار نـەبێت نەیکـەیت ، وە بـا کـەس خواردنـت نـەخوات ئـیللا کەسێکی لە خوا ترس و خۆپارێز لە تاوان نەبێت .

٢ ـ دوور کەوتنەوە و بە جێهێشتنی ئەو شوێن و جێگایەی کەوا تاوانی تێدا دەست دەکەوێت ، بـە بەڵگـەی فـەرموودەی ئـەو کەسـەی کـەوا سـەد کەسـی کوشـت و پاشـان تەوبەی کرد : پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : **((اخرج من القرية الخبيثة التي أنت فيها إلــى القرية الصالحة قرية كذا وكذا [فإن بها أناساً يعبدونَ الله] فاعبد ربك [معهْم] فيهـا ، [ولا ترجع إلى أرضك فإنها أرض سوءٍ]))**[١٦٣].

واتە : دەرچوو لەو گوندە پیسەی کە تۆ تێیدا دەژیت و بڕۆ بـۆ ئـەو گونـدە چـاکەی کـەوا خـەڵکانێکی تێدایـە خـوا دەپەرسـتن و تـۆش لەگـەڵ ئەوانـدا خـوای پـەروەردگارت بپەرستە تێیدا ، وە نەگەڕێیتەوە بۆ زەویەکەی خۆت چونکە خەڵکەکەی خراپە .

٣ ـ ئەم خاڵە تایبەتە بەو کەسانەی کەوا تووشی تـاوانی زینـا دەبنـەوە .. بـۆ ڕزگـار بوونیان لەم تاوانە دەبێت :

أ / خۆپارێزی بکەن لە نەزەر کردن و تێکەڵاوی ئافرەتان و بە تـەنها مانـەوە لەگـەڵ ئافرەتی بیگانە و نامەحرەمدا ..

ب / ژن هێنان : چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی : **((يا معشر الشبابِ من استطاع منكم الباءةَ فليتزوج ، فإنه أغض للبصر وأحصن للفرج ، ومن لم يستطع فعليه بالصومِ ، فإنه له وجاءٌ))**[١٦٤].

واتە : ئەی کۆمەڵی لاوان هەر یەکێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەبوو با ژن بهێنێت ، چـونکە زیـاتر چـاو دەپارێزێت لـە بینینـی نـاڕەوا ، و پارێزەریـشە لـە کەوتنـە داوێـن پیسیەوە ، ئەوەش توانای ژن هێنانی نەبوو ، با پەنا بەرێتـە بـەر ڕۆژوو گـرتن ، چـونکە ڕۆژوو پارێزەرە بۆی .

---

[١٦٣] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٤٠) .

[١٦٤] صحيح البخاري رقم : (٥٠٦٦) وصحيح مسلم رقم : (٣٤٦٤) .

**پ٨٢ / ئایا ئیسلام بە چ چاوێک سەیری ئەو پیاوانە دەکات کە ژنیانیش هەیە و لە هەمان کاتدا زینا دەکەن لەگەڵ ئافرەتی تردا ؟**

وەڵام /

ئەو جۆرە پیاوانە بە پیاوانێکی تاونبار و فاسق و خیانەتکار سەیر دەکرێن :

تاونبار و فاسقە : چونکە یەکێك لە تاوانە گەورەکانی ئەنجامداوە ، خوای گەورە لە قورئاندا فەموویەتی : ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ٣٢ ﴾ **[الإسراء]** .

واتە : نزیکی زینا مەبنەوە چونکە زیناکردن کارێکی زۆر ناشیرینە و ڕێگایەکی خراپە .

**هەروەها خوای گەورە فەموویەتی :** ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ٦٨ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ٧٠ ﴾ **[الفرقان]** .

واتە : وە ئەوانەی کەوا لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی تر ناپەرستن و هاواری تێناکەن و کەسێك ناکوژن کەوا خوا کوشتنی حەرام کردبێت ئیللا بە حەق نەبێت و زینا و داوێن پیسی ناکەن .. وە هەر کەسێك ئەمانە بکات ئەوا تاوانبار دەبێت و سزای تاوانەکەی دەبینێتەوە و لە ڕۆژی قیامەتدا سزاکەیان بۆ چەند قات دەکرێتەوە و بە سەرشۆڕی هەتاهەتایی تێدا دەمێنێتەوە .. ئیللا کەسێك نەبێت کەوا تەوبە دەکات و ئیمان و باوەڕ دەهێنێت و کردەوەی چاکە دەکات ، ئا ئەوانە خوا خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێتەوە بە چاکە ، وە خوا لێبوردە و بە بەزەییە .

وە خیانــەتکارە لــە خــۆی و ژنەکەشــی : چــونکە شــەهوەتی خــۆیی لــە حەڵاڵــدا دانەمرکاندووەتەوە لەگەڵ ژنەکەیدا بەڵکو لەگەڵ ئافرەتێکی تردا بـە حـەرام ئـەو کـارەی ئەنجام داوە ، ئەمەش خیانەتە لە ژنەکەی .

وە ئەم جۆرە پیاوانە (کـە ژنایـانیش هەیـە و لـە هـەمان کاتـدا زینـا دەکـەن لەگـەڵ ئافرەتی تردا) ئەگەر ئەم کارەیان لە سەر سەلمێنرا و ئاشکرا بوو ئەوا دەبێت بـەردباران (ڕەجم) بکرێن تاوەکو مردن .

ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) فەرموویـەتی : **((الرجم في كتابِ الله حق على من زنى إذَا أُحصن من الرجالِ والنساءِ ، إذَا قَامت الْبينةُ أو كَانَ الْحبلُ أو الاعتراف [وقَــد قَرأتهــا : "الــشيخ والشيخةُ إذَا زنيا فَارجموهما الْبتةَ" [نكالًا من الله واللهُ عزيز حكيم]))**[١٦٥] .

واتە : بەردباران (ڕەجم) کردن حەقـە و پێویـستە لـە سـەر کەسـێك کـە زینـا بکـات ئەگەر لەو پیاوانەی بێت کە ژنیان هەیە و لەو ژنانەش بێت کە پیاویان هەیە ئەگەر بەڵگە (چوار شایەت) یان سکپڕبوون یان دانپێدانان هەبوو لە سەری ، وە من خوێندوومەتـەوە : پیاوی ژندار و ژنی شوودار ئەگەر زینایـان کـرد ئـەوا بـەردباران (ڕەجـم)یـان بکـەن بـە یەکجاری وەك سزایەك لە لایەن خواوە ، خواش بە دەسەڵات و دانایە .

ئەمەیە هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە پیاوی ژندار ئەگەر زینا و داوێن پیسی بکات : تاونبار و فاسق و خیانەتکارە و پێویستە بەردباران (ڕەجم) بکرێت .

---

[١٦٥] **صحيح البخاري رقم : (٥٠٦٦) وصحيح مسلم رقم : (٣٤٦٤) وصحيح سنن ابن ماجه رقــم : (2553) والزيــادة لــ ــه ، والزيادة الثانية للبيهقي السنن الكـ ى رقم : (١٧٣٦٥) وانظر : إرواء الغليل رقم : (٢٣٣٨) وانظر : سبل السلام : (٧ / ١٠٨) .**

### * جووتبوون لەگەڵ ژنـــدا لە کۆمەوە : (اتيان الـمرأة فـي دبرها) !

پ٨٣ / سڵاوی خوای گەورەتان لێ بێ زەحمەت نەبێ ئەمەوێ بزانم حوکمی کرداری جنسی لەگەڵ خێزانی خۆت لە دواوە چیە ؟ تکایە بە جوانی ڕوونی بکەنەوە بۆم لەگەڵ ڕێزدا .

وەڵام /

چەند بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی حەرامێتی (جووتبوون لەگەڵ ژنـــدا لە کۆمـەوە !) لە ئیسلامدا :

**١ ـ عن جابِر بن عبد الله (رضي الله عنه) قَالَ : كَانت الْيهود تقُولُ : إِذَا أتى الرجلُ امرأته مـن دبرِها في قُبلها كَانَ الْولَد أحولَ ، فَنزلَـت : ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ ﴿٢٢٣﴾﴾ [البقرة] ، [فَقَالَ رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم) : ((مقْبِلَةً ومدبِرةً إِذَا كَانَ ذَلك في الْفَرجِ]))[١٦٦] .**

واتە : جوولەکەکان (یەهودیەکان) دەیانووت : ئەگەر پیاو بچێتە لای ژنەکەی لە دواوە و لە جێگای پێشەوە (واتە لە پاشەوە دەچێتە لای بەڵام لە ڕێگای منداڵدانەوە) ئەوا منداڵەکەی چاو خێل دەردەچێت ، بە هۆی ئەمەوە ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿ ژنەکانتان جێگای تۆو چاندنی ئێوەن جا ئێوەش بچنە لای جێگای تۆوەکانتان بە هەرچی شێوازێك خۆتان ئارەزووی دەکەن ﴾ ، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : واتە : لە ڕووی پێشەوە و داوەوە ئەگەر ئەمە لە دامێنیەوە بوو .

**٢ ـ عن ابنِ عباسٍ (رضي الله عنه) قَالَ : ((كَانَ هذَا الْحي من الأَنصارِ - وهم أَهلُ وثَنٍ - مـع هذَا الْحي من يهود - وهم أَهلُ كتابٍ - وكَانوا يرونَ لَهم فَضلاً علَيهم في الْعلْمِ ، فَكَـانوا يقْتدونَ بِكَثيرٍ من فعلهم ، وكَانَ من أَمرِ أَهلِ الْكتابِ أَنْ لاَ يأتوا النساءَ إِلا علَى حرف* وذَلك**

---

[١٦٦] صحيح البخاري رقم : (٤٥٢٨) وصحيح مسلم رقم : (٣٥٢١) والزيادة وردت تفسير ابن أبي حاتـم : (٢١٦٩) ومشكل الآثار للطحاوي رقم : (٥٣٥٣) ومستخرج أبـي عوانة رقم : (٣٤٧٦) ، وانظر : آداف الزفاف للألبانـي ص : (٢٧) .

* أي : على جانب [النهاية غريب الـحديث] .

**أستر ما تكُونُ الْمرأةُ ، فَكَانَ هذَا الْحي من الْأَنصار قَد أَخذُوا بِذَلك من فعلهم ، وكَانَ هـذَا الْحي من قُريش يشرحونَ النساءَ شرحاً** منكَراً ، ويتلَـذذُونَ مـنهن مقْـبِلَات ومـدبِرات ومستلْقيات ، فَلَما قَدم الْمهاجِرونَ الْمدينةَ تزوج رجلٌ منهم امرأَةً من الْأَنصار فَذَهب يـصنع بِها ذَلك فَأَنكَرته علَيه وقَالَت : إِنما كُنا نؤتى علَى حرف فَاصنع ذَلك وإِلا فَـاجتنِبنِي حتـى شرِي أَمرهما فَبلَغَ ذَلك رسولَ الله (ﷺ) فَأَنزلَ الله عز وجل :** ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ [البقرة] **، أَي مقْبِلَات ومدبِرات ومستلْقيات يعنِي بِذَلك موضع الْولَد))**[١٦٧] **.**

واتە : جاران خەڵکی ئەم گەڕەکە لە (ئەنصاری‌یەکانی مەدینە) کە بت پەرست بوون ، لەگەڵ خەڵکی ئەم گەڕەکە لە جوولەکەکان (یەهودیەکان) کە خاوەنی (کتێب) بوون ، لە بەر ئەمە بۆچوونیان وابوو کەوا جوولەکەکان فەزڵ و چاکەیان هەیە بە سەریانەوە لە زانست و شارەزاییدا ، بە هۆی ئەمەوە لاسایی زۆرێك لە کردارەکانیانیان دەکردوە و چاویان لێیان دەکرد ، وە بەشێك لە حاڵی (ئەهلی کتێب / جوولەکە) بریتی بوو لەوەی کە نەدەڕۆیشتنە لای ژن ئیللا بە لاوە نەبێت ، وە ئەمەش داپشراوترین شێوە بوو بۆ ئافرەت ، بۆیە خەڵکی ئەم گەڕەکەی ئەنصاری‌یەکان ئەم شێوازەی چوونە لای ژنیان لە کردەوەی جوولەکەکانەوە وەرگرتبوو ، بەڵام خەڵکی ئەم گەڕەکەی (قورەیشی‌یەکانی مەککە) دەچوونە لای ژن بە هەڵاژیانەوە لە سەر پشت ، وە خۆشی و لەزەتیان لێیان دەبینی **لە پێشەوە و لە پاشەوە و بە هەڵاژیانەوە** ، بەڵام کاتێك کۆچکارەکانی مەککە روویان کردە مەدینە پیاوێکیان ژنێکی لە ئەنصاری‌یەکان هێنا و بوو بە هاوسەری ، ئەنجا ڕۆیشت وەك شێوازی خەڵکی مەککە لەگەڵیدا جووت ببێت ، بۆیە ژنەکەی ئەمەی لێ قەبووڵ نەکرد و ئینکاری کرد و فەرمووی : ئێمە پیاو لە لاوە دێتە لامان ، بۆیە تۆیش بەو شێوازە وەرە لام ئەگینا لێم دوور بکەرەوە ، تاوەکو ئەمە گەورە بووەوە و ئەنجا

---

** قال لسان العرب (٢ / ٤٩٨) : (قال ابن عباس : " كانَ أَهلُ الْكتابِ لا يأْتونَ نِساءَهم إِلا علَى حرف ، وكَانَ هذَا الْحي مـن قُريش يشرحونَ النساءَ شرحاً " شرح جاريته إذا وطئها نائمة على قفاها) .

[١٦٧] صحيح سنن أبـي داود رقم : (٢١٦٤) والـمستدرك للـحاكم رقم : (٢٧٤٢) والسنن الكبرى للبيهقي رقم : (١٤٤٨٨) ، وانظر : آداف الزفاف للألبانـي ص : (٢٨) .

گەیشت بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، جا بە هۆی ئەمەوە ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿ژنەکانتان جێگای تۆو چاندنی ئێوەن جا ئێوەش بچنە لای جێگای تۆوەکانتان بە هەرچی شێوازێك خۆتان ئارەزووی دەکەن﴾ واتە : لە پێشەوە و لە پاشەوە و بە هەڵژیانەوە ، **مەبەستیشی بەمە ئەوەیە کە لە جێگای منداڵەوە بچێتە لای .**

**٣ ـ عن ابن عباس (رضي الله عنه) قَالَ : ((جاءَ عمر بن الْخطابِ إِلى رسول الله (ﷺ) فَقَالَ يـا رسولَ الله هلَكْت ، قَالَ : وما الذي أَهلَكَك ؟ قَالَ : حولت رحلي* الليلَةَ ، فَلَم يـرد علَيـه رسولُ الله (ﷺ) شيئاً ، قَالَ : فَأُوحى الله إِلى رسوله (ﷺ) هذه الآيةَ :** ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ [البقرة] **، قَالَ : أَقْبِلْ وأَدبِر واتقِ الدبر والْحيضةَ))[١٦٨] .**

واتە : عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا تیاچووم ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : چی لە ناوی بردوویت ؟ وتی : ئەم شەو جێگای دانیشتنەکەم هەڵەودیوکرد (واتە : لە دواوە لە شوێنی منالّدانەوە چوومە لای خێزانەکەم) ، پێغەمبەریش (ﷺ) بە هیچ شتێك وەڵامی نەدایەوە ، ئەنجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) : ﴿ژنەکانتان جێگای تۆوچاندنی ئێوەن جا ئێوەش بچنە لای جێگای تۆوەکانتان بە هەرچی شێوازێك خۆتان ئارەزووی دەکەن ﴾ ، فەرمووی : لە پێشەوە و لە دواوە بڕۆرە لای ، وە **خۆپارێزی بکە لە کونی دواوە و هەروەها لە کاتی حەیز و بێنوێژیشدا .**

**٤ ـ عن خزيمةَ بن ثَابِت (رضي الله عنه) : ((أَن رجلاً سأَلَ النبِي (ﷺ) عن إِتيان النـساءِ فـي أَدبارهن أَو إِتيان الرجلِ امرأَته في دبرها ؟ فَقَالَ النبِي (ﷺ) : حلالٌ ، فَلَما ولى الرجلُ دعاه أَو أَمر بِه فَدعي فَقَالَ : كَيف قُلت ؟ في أَي الْخربتين أَو في أَي الْخرزتين أَو في أَي الْخصفَتين***

---

* كنـى برحله عن زوجته ، أراد بـها غشيانـها قبلها من جهة ظهرها [النهاية غريب الـحديث] .

[١٦٨] مسند الإمام أ د رقم : (٢٧٥٥) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٢٩٨٠) ، وانظر : آداف الزفاف ص : (٣١) .

* يعنـي : أي الثقب ، والألفاظ الثلاثة بـمع واحد كما [النهاية غريب الـحديث] .

**أمن دبرها في قُبلها ؟ فنعم ، أم من دبرها في دبرها ؟ فلا ، إن الله لا يستحيي من الحــق : لا تأتوا النساءَ في أدبارهن))**[١٦٩]

واتە : پیاوێك پرسیاری كرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە چوونە لای ژن لـە دواوە ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : حەڵاڵە ، كاتێك پیاوەكە ڕۆیـشت پێغەمبـەر (ﷺ) بانگی كردەوە یان فـەرمانی كـرد بـە بـانگ كردنـەوەی و بـانگ كـرا ، ئـەنجا فـەرمووی : چۆنت وت ؟ لە كـام لـە دوو كونەكانـەوە ؟ ئایـا لـە دواوە و لـە ڕێگـای پێشەوە ؟ ئـەوا ئەمەیان دەبێت و دروستە ، **یان لە دواوە و لە كۆمەوە (واتــە لـە كـونی دواوە) ؟ ئـەوا ئەمەیان نابێت دروست نی‌یە** ، چونكە خوا لە حەق شەرم ناكات : **نەچنە لای ژن لە كونی دواوە واتە : لە كۆمەوە** .

**٥ ـ عن أبي هريرةَ (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قالَ : ((لا ينظُر الله إلى رجلٍ جامع امرأته في دبرها))**[١٧٠]**.**

واتــە : خـوا ـ لـە تووڕەییـدا ـ سـەیری پیاوێـك ناكـات كـەوا لـە كـونی دواوە لەگـەڵ ژنەكەیدا جووت ببێت .

**٦ ـ ((ملعونٌ من يأتي النساءَ في محاشهن ، يعني : أدبارهن))**[١٧١]**.**

واتە : لەعنەت و نەفرەت لێكراوە ئەو كەسەی بچێتە لای ژن لە كۆمەوە ، واتــە : لـە كونی دواوە .

**٧ ـ عن أبي هريرةَ (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قالَ : ((من أتى حائضاً أو امرأةً في دبرها أو كاهناً فصدقه بما يقُولُ فقَد كفَر بما أُنزلَ على محمد ﷺ))**[١٧٢]**.**

---

[١٦٩] مسند الإمام الشافعي رقم : (١٢٣٥) والسنن الكـ ى للبيهقي رقم : (١٤٤٩٣) ، وانظر : آداف الزفاف ص : (٣٢) .

[١٧٠] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (١٩٢٣) واللفظ له والسنن الكـ ى للبيهقي رقم : (١٤٥٠٣) ، وانظـر : آداف الزفـاف ص : (٣٣) .

[١٧١] [أخرجه ابن عدي من حديث عقبة بن عامر بسند حسن ، وهو من رواية ابن وهب عن ابن  يعة ، وله شاهد من حـديث أ هريرة مرفوعا به ، أخرجه أبو داود وأ د] قاله الألبانـي "آداف الزفاف" ص : (٣٣) .

[١٧٢] مسند الإمام أ د رقم : (١٠٤٣٥) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٢٩٨٠) وصحيح سنن ابن ماجه رقم : (٦٣٩) ، وانظـر : آداف الزفاف ص : (٣٣) .

واتە : هەر کەسێك بچێتە لای ژنەکەی لە کاتی حەیزدا ، یان لە کونی دواوە ، یان بچێت بۆ لای جادووبازێك و قسەکەی بە ڕاست بخاتەوە ، ئەوا کوفری کردووە و بێباوەڕ بووە بەوەی کە دابەزیوەتە سەر (**محمد** ﷺ) .

ئەمانە (٧) حەوت فەرموودەی پێغەمبەری خوا بوون (ﷺ) ، کەوا باسی دوو شتی لەخۆ گرتبوو :

**یەکەم** : ڕوونکردنەوەی شێوەی چوونە لای ژن لە جێگای منداڵبوونەوە (**الفـرج**) چ بە هەڵاژیانەوە بێت لە سەر پشت بێت (**مستلقيات**) ، یان لە پێشەوە بێت (**مقبلات**) ، یان لە پاشەوە بێت (**مدبرات**) ، یان بە لاوە بێت (**على جنب**) ، یان بەهەرچ شێوەیەك کە پیاو و ژن خۆیان ئارەزوویان لێبێت ، بەڵام بە مەرجێك لە منالّدانەوە بێت کە جێگای تۆوناشتنە وەك لە ئایەتەکەدا فەرموویەتی : ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ [البقرة] **أي : مقبلات ومدبرات ومستلقيات ، يع بذلك موضع الولد** ، واتە : ﴿ژنەکانتان جێگای تۆو چاندنی ئێوەن جا ئێوەش بچنە لای جێگای تۆوەکانتان بە هەرچی شێوازێك خۆتان ئارەزووی دەکەن﴾ واتە : لە پێشەوە و لە پاشەوە و بە هەڵاژیانەوە ، **مەبەستیشی بەمەش ئەوەیە کە لە جێگای منداڵەوە بچێتە لای** .

**دووەم** : ڕوونکردنەوە و ئاشکرا کردنی حەرامێتی چوونە لای ژن لە کۆمەوە (واتە لە کونی دواوە) ، بەڵکو سەرەڕای حەرامێتی ئەو کارە خوا سەیری ئەو کەسانە ناکات کە لە (کۆم و کونی دواوە) دەچنە لای ژن و بەر لەعنەت و نەفرەتی خوا دەکەون و ئەو کردارەشیان بە کوفر و بێباوەڕی لە سەر دەژمێردرێت .. چوونکە (کۆم و کونی دواوە) جێگای دەرچوونی پیسییە لە لەش نەك جێگای وەچەخستنەوە و جووت بوون و لەزەت بینین ! ! !

---

**فائدة : قال الإمام اللبانـي كتابه الفريد "آداف الزفاف" ص : (٣٣) بعد سرد هذه الأحاديث الـسبعة : (وروى النـسائي وابن بطة "الإبانة" عن طاوس قال : سئلَ ابن عباس عن الذي يأ امرأته دبرها ؟ فقال : "هذا يسأل عـن الكفـر" وسـنده صحيح ... وقال الذهـ "سـ أعلام النبلاء" : "قد تيقنا بطرق لا يد عنها ي النـ ﷺ عن أدبار النساء وجزمنا بتحريـمه ، و ذلك مصنف كبـ ") .**

هەموو ئەم فرموودانەم دەرهێناوە لە کتێبی (**آداف الزفاف**) واتە : (**ئادابەکانی ژن گواستنەوە**) ، کە یەکێکە لە کتێبە زۆر بە نرخ و ناوازەکەی زانا و فەرموودەناسی سەردەم (الشيخ المحدث : محمد ناصر الدين الألباني) ڕەحمەتی خوا لێبێت .

## * نەزەر چیە ؟

**پ٨٤ / ئەگەر لە بازار خزمێک ببینی چاک و چۆنی و هەواڵ پرسی بکەی سەیری بکەی یان من قوتابیم ماموستاکەمان حیجاب نیە لە کاتی وانە شەرح کردن مەجبووری سەیریکەی یان سەیر کردنی ئەو دراما تەلەفزوینیانە وەکو تولەفزوینی سەحەری ئێرانی کە حیجابی تەواون ئەوانە نەزەرن یان نە ؟**

وەڵام /

نەزەر بریتیە لە سەیرکردنی ئافرەتێك کەوا مارە کردنی لێت حەڵاڵ بێت ، واتە نامەحرەم بێت وەك ئامۆزا و خاڵۆزا و براژن ...

بەڵام سەیرکردنی روومەت و دەستی ئەو ئافرەتانەی کە مەحرەمتن وەك دایك و خووشك و میمك و برازا و خووشکەزا ، واتە ئەوانەی کەوا مارەکردنیان لێت حەڵاڵ نیە دروستە .

کەواتە سەیرکردنی ئافرەتی خزم و مامۆستا و هەروەها ئەو ئافرەتانەش کەوا لە تەلەفزیون دەردەچن حەرامە و دروست نیە ئەگەر چی پۆشتەش (حیجاب) بن چونکە ڕوومەتیان بە دەرەوەیە ، ئاشکراشە جوانی ئافرەت زیاتر لە ڕوومەتیدا دەردەکەوێت .

**چەند بەڵگەیەك لەسەر حەرامێتی سەیرکردنی ئافرەتی نامەحرەم :**

**١** ـ خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾ **[النور]** .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا بە ئیمانداران بڵێ : با چاوەکانیان دابخەن ـ واتە : لە ئاستی نامەحرەمەکانیاندا ـ و عەوەرتیان بپارێزن .. ئەوە پاکترە بۆیان ، بەڕاستی خوا زانا و بە ئاگایە بەوەی کە دەیکەن .

**٢ ـ عن أبِي هريرةَ (رضي الله عنه) أن رسولَ الله (ﷺ) قَالَ : ((... الْعينان تزنِيان وزناهما النظَـر ...))[١٧٣].**

واتە : هەردوو چاو زینا دەکەن وە زینای چاوەکانیش سەیرکردنە ..

**٣ ـ عن جرير بن عبد الله (رضي الله عنه) قَالَ : سأَلْت رسولَ الله (ﷺ) عن نظْرة الْفَجأة ؟ فَقَالَ : ((اصرف بصرك))[١٧٤].**

واتە : پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە بینینی کتوپڕ ؟

ئەویش فەرمووی : چاوت لا ببە لەسەری .

**پ ٨٥ / تا چەند سەیرکردن (نەزەر) کاردەکاتە سەر لەدەستدانی باوەڕ ؟**

**وەڵام /**

سەیرکردن (نەزەر)ی حەرام باوەڕی موسڵمان لاواز دەکات و بەرەو تاوانی دڵ ڕەقی و شەهوەت بازی دەبات و لەوانەشە تووشی زینا و داوین پیسی بکات ..

وە بۆ زیاتر ئاگادار بوونەوە لە زیانەکانی تاوانی نەزەر ئامۆژگاریت دەکەم بە خوێندنەوەی کتێبی (تێڕوانینی حەرام / **النظر**) کە لە ساتی بەهەشتدا بڵاوکراوەتەوە .

---

[١٧٣] مسند الإمام أحمد رقم : (٨٧٥٢) واللفظ له وصحيح البخاري رقم : (٦٢٤٣) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٥٧) .

[١٧٤] صحيح مسلم رقم : (٥٦٠٩) وصحيح سنن أبي داود رقم : (٢١٤٨) واللفظ له .

پ٨٦ / پۆشاکی درێژ تا چەند لەبەرکردنی حەرامە ؟

وەڵام /

لەبەرکردنی پۆشاك یان جلوبەرگی درێژ بۆ پیاوان حەرامە بە هەموو شێوەیەك و یەکێکیشە لە تاوانە گەورەکان (الكبائر) چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((ما أسفَلَ من الكَعبين من الإزار فَفي النار))**[١٧٥].

واتە : ئەوەی لە خواروی (قاپەڕەقە)وەیە لە جلی خوار ناوکەوە ئەوا لە ئاگردایە .

(**الإزار**) بە پۆشاکێك دەوترێت : کە لە خواروی ناوکەوە داپۆشێت ، چ شەرواڵ بێت یان پانتۆڵ بێت یان هەر جلێکی تر بێت .

ئەمە سزای کەسێکە کە تەنها جلەکەی درێژ و شۆڕ بێت ، بەڵام ئەگەر ئەم کارەی بە مەبەستی تەکەبور و فیز زلیەوە بێت ئەوا سزاکەی سەخت و ناڕەحەت ترە لەوە ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((من جر ثَوبه خيلاءَ لَم ينظُر الله إلَيه يوم القيامة))**[١٧٦].

واتە : هەر کسێك جلەکانی شۆڕکاتەوە بە مەبەستی فیز زلیەوە ئەوا خوا سەیری ناکات لە ڕۆژی قیامەتدا .

**وعن أبِي ذَر (رضي الله عنه) عن النبِي (ﷺ) قَالَ : ((ثَلاثَةٌ لاَ يكَلمهم الله يوم القيامة ولاَ ينظُر إلَيهم ولاَ يزكيهم ولَهم عذَاب أليم)) ، فَقُلْت : من هم يا رسولَ الله فَقَد خابوا وخسِروا ؟ قَالَ : ((المسبِلُ إزاره ، والمنانُ عطَاءَه ،والمنفق سلعته بِالحلف الكَاذب))**[١٧٧].

واتە : سێ کۆمەڵ لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و سەیریان ناکات و لە تاوان پاکیان ناکاتەوە و سزایەکی بە ئێش و ئازاریان هەیە ، وتم : ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی بێ سەرنجام و خەسارۆمەندن ؟ فەرمووی : ئەو پیاوەی شرواڵەکەی شۆڕکردبێتەوە بۆ خواروی (قاپەڕەقەی) ، وە ئەو کەسەی کە

---

[١٧٥] صحيح البخاري رقم : (٥٧٨٧) .

[١٧٦] صحيح البخاري رقم : (٣٦٦٥) وصحيح مسلم رقم : (٥٤٢٤) .

[١٧٧] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٢٠٧) .

منەت دەکات بە بەخشینەکەیەوە ، وە ئەو کەسەی کە شتومەکەکەی دەفرۆشێت بە سوێندی درۆ .

**وعن ابن عمر (رضي الله عنه) قالَ : ((دخلْت علَى النبِي (ﷺ) وعلَي إزار يتقَعقَع ، فقَالَ : من هذَا ؟ قُلت : عبد الله بن عمر ، قَالَ : "إنْ كُنت عبد الله فَارفَع إزارك" ، فَرفَعت إزارِي إلَى نِصف الساقَين ، فَلَم تزلْ إزرته حتى مات))[178].**

واتە : ڕۆیشتمە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتێکدا کە جلێکم لە بەر بوو لە شۆڕیدا بە سەر زەویدا ئەم دیو ئەو دیوی دەکرد ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەوە کێیە ؟ وتم : (**عبد ا**)ی کوڕی (**عمر**) ، فەرمووی : ئەگەر تۆ عەبدی خوایت ئەوا شەرواڵەکەت بەرز بکەرەوە ، ئەویش دەڵێت : شەرواڵەکەم بەرز کردووە تاوەکو نیوەی پێی (لاقی) ، وە بەردەوام شەرواڵەکەی وابوو تاوەکو مرد .

کەواتە ئەگەر کەسێك بەڕاستی عەبدی خوا بێت ئەوا نابێت جلەکانی شۆڕ بێت ئەگەر مەبەستیشی فیز زلی نەبێت .

شێخ ئەلبانی فەرموویەتی : **(و الـحديث دلالة ظاهرة على أنه ب على ا سلم أن لا يطيل إزاره إ ما دون الكعب بل يرفعه إ فوقهما ولو كان لا يقصد ا يلاء ، ففيه رد على بعض ا شايخ الذين يزعمون أ م لا يفعلون ذلك خيلاء)**[179].

واتە : ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی ڕوونە لە سەر ئەوەی کەوا پێویستە (واجب و فەرزە) لە سەر موسڵمان کەوا دەرقاچەکەی شۆڕ نەکاتەوە بۆ خواروی (قاپەڕەقەی) بەڵکو دەبێت بەرزی بکاتەوە بۆ سەروی هەردوو (قاپەڕەقەی) ئەگەر چی بە مەبەستی فیز زلیشەوە نەبێت ، کەواتە ئەم فەرموودەیە وەڵامدانەوەی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی کەوا بۆچوونی گەندەڵیان وایە کە گوایە ئەوان جلەکانیان شۆڕ ناکەنەوە بە مەبەستی فیز زلیەوە .

---

[178] **مسند الإمام أ د رقم : (٦٤١٠) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٥٦٨) .**

[179] **سلسلة الأحاديث الصحيحة : (٤ / ٩٥) .**

هەروەها ئەم پرسیارە لە شێخ ( مد صا العثیم )نیش کراوە بەم شێوازە :

﴿ ئایا شەرواڵ درێژی بۆ پیاوان حوکمی چی‌یە ؟

وەڵام /

شەرواڵ درێژی بۆ پیاوان ئەگەر مەبەستی پێی خۆبەگەورە زانین و فیز کردن بێت ئەوا سزاکەی ئەوەیە کە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا تەماشای ناکات و قسەی لەگەڵ ناکات و پاکی ناکاتەوە و سزایەکی بە ئێش و ئازاری دەدات .

بەڵام ئەگەر مەبەستی پێی فیزکردن و خۆهەڵکێشان نەبوو ئەوا سزاکەی ئەوەیە سزای خوار گوێزینگی (قاپەڕەقە) بدات بە ئاگر ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((ثَلاثَةٌ لاَ يكَلمهم الله يوم الْقيامة ولاَ ينظُر إِلَيهم ولاَ يزكيهم ولَهم عذَاب أَليم : الْمسبِلُ ، والْمنانُ ، والْمنفق سلْعته بِالْحلف الْكَاذبِ))**[180].

واتە : سێ کۆمەڵ لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و سەیریان ناکات و پاکیان ناکاتەوە لە تاوان و سزایەکی بە ئێش و ئازاریان هەیە: ئەو پیاوەی شەرواڵەکەی شۆڕ کردۆتەوە بۆ خوار (قاپەڕەقەی) ، وە منەت کەر ، و ئەو کەسەی کە شتومەکەکەی دەفرۆشێت بە سوێن خواردنی درۆ .

وە فەرموویەتی : **((من جر ثَوبه خيلاَءَ لَم ينظُر الله إِلَيه يوم الْقيامة))**[181].

واتە : هەر کسێك جلەکانی شۆڕکاتەوە بە مەبەستی فیز زلیەوە ئەوا خوا سەیری ناکات لە ڕۆژی قیامەتدا .

ئەمە سزای کەسێکە کە لە فیزکردن و خۆ هەڵکێشاندا شەرواڵەکەی شۆڕ بکات ، بەڵام ئەو پیاوەی لە شۆڕکردنیدا مەبەستی فیزکردن نەبێت ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((ما أَسفَلَ من الْكَعبينِ من الإِزارِ فَفي النارِ))**[182].

---

[180] صحيح مسلم رقم : (٢٨٩) .

[181] صحيح البخاري رقم : (٣٦٦٥) وصحيح مسلم رقم : (٥٤٢٤) .

[182] صحيح البخاري رقم : (٥٧٨٧) .

واتە : ئەوەی لە خواروی (قاپەڕەقە)وەیە لە جلی خوار ناوکەوە ئەوا لە ئاگردایە .

وە ئەم شتەی نەبەستۆتەوە بە فیز کردن و خۆ بە گەورە زانینەوە ، وە راستیش نی‌یە بیبەستینەوە بە فیزکردن لەسەر فەرمودەکەی پێش تر ، چونکە **(أبو سعيد الخدري** ﵁**)** فەرموویەتی : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **((إزرةُ المؤمنِ إلى نِصف الـساقِ ، ولاَ حرج أو لاَ جناح فيما بينه وبين الكَعبين ، ما كَانَ أسفَلَ من الكَعبين فَهو في النار ، ومن جر إزاره بطَراً لَم ينظُر الله إليه [يوم القيامة]))**[183].

واتە: شەروالی پیاوی باوەڕدار تا نیوەی قاچێتی ، وە تاوان نی‌یە و ئاسایی‌یە ئەگەر تا گوێزینگەکانی (قاپەڕەقە) شۆڕ بێت ، بەڵام لە خوار تر و شۆڕ تر بێت ئەوا لە ئاگردایە، وە هەر کەسێك شەرواڵەکەی شۆڕ بکات لە فیز
و خۆبەگەورە زانیندا ئەوا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا تەماشای ناکات .

وە چونکە دوو کردارەکە لێك جیاوازن (ئەوەی بۆ فیز شۆڕی دەکات ، وئەوەی بەبێ فیز) ، وە دوو سزاکەیشیان لێك جیاوازن : ئەوەی بۆ فیز شۆڕی دەکات سزاکەی ئەوەیە : خوای گەورە نەقسەی لەگەڵ دەکات و نەتەماشای دەکات و نە پاکی دەکاتەوە و سزایەکی بە ئێش و ئازاری بۆ داناوە ، وە ئەوەی کە بە بێ فیز شۆڕی دەکات سزاکەی ئەوەیە : ئەو شوێنەی لە ئاگری دۆزەخدایە) ، وە هەر کاتێك حوکم و هۆکار لێك جیاواز بوون ئەوا ناتوانرێت **(مطلق)**ەکە هەڵگیرێت بۆ سەر(مقید)ەکە، چونکە دژ بەیەکی دروست دەبێت .

بەڵام کەسێك فەرموودەکەی أبوبکر (خوای لێ ڕازی بێت) بکات بە بەڵگە ، ئەوا پێ دەڵێین : نابێتە بەڵگە بۆت لە دوو رووەوە :

---

[183] مسند الإمام أ د رقم : (١١٧٠٧) وصحيح أبـي داود رقم : (٤٠٩٣) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (٢٠٣١) .

یەکەم : أبو بکر (خوای لیّ ڕازی بێت) فەرمووی: لایەکی شەرواڵەکەم دێتە خوارەوە مەگەر بەرزی بکەمەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پیّی فەرموو : **((إنك لست ممن يصنع ذالك خيلاء))**[١٨٤].

واتە: تۆ لەو کەسانە نێت کە بۆ فیز و خۆ هەڵکێشان شۆڕی دەکەنەوە.

أبو بکر (خوای لیّ ڕازی بێت) بۆ فیز شۆڕی نەکردبووەوە ، بەڵکو خۆی شۆڕدەبووەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا بەرزی دەکردەوە، وە ئەوانەی کە شەرواڵەکانیان شۆڕ دەکەنەوە و دەڵێن: بۆ فیز و خۆ هەڵکێشانمان نی‌یە، پێیان دەڵێین: ئەگەر مەبەستتان لە شۆڕکردنی شەرواڵەکانتان بۆ خوار گوێزینگەکانتان (قاپەڕەقە) فیز و خۆ بەگەورە زانین نەبێت ئەوا خوای گەورە سزاتان دەدات تەنها بە ئاگر ، وە ئەگەر بەمەبەستی فیزو خۆ بەگەورە زانین شۆڕتان کردبێتەوە ئەوا سزاتان دەدات بەوە گەورەتر: لەرۆژی قیامەتدا نەقسەتان لەگەڵ دەکات، وەنەتەماشاتان دەکات، وە نەپاکتان دەکاتەوە، وە سزایەکی بە ئێش و ئازارتان بۆ هەیە.

دووەم: پێغەمبەر (ﷺ) أبو بکری (خوای لیّ ڕازی بێت) پاك کردەوە و تەزکی‌یەی کرد و شایەتی بۆدا کە ئەو لەو کەسانە نی‌یە کە بۆ خۆبەگەورە زانین وفیز شۆڕی دەکەنەوە، بەڵام ئایا کەس لەوانەی وا دەڵێن ئەم پاککردنەوەیەو شایەتی‌یەی دەست کەوتووەو بۆدراوە ؟!

بەڵام شەیتان بۆ هەندێك لە خەڵکی دەرگای شوێن کەوتنی **(المتشابە)** دەکاتەوە لە دەقەکانی قورئان وسوننەت ، بۆ ئەوەی بیانویان بۆ بدۆزێتەوە بۆ ئەو کردەوانەی کە دەیکەن ...»[١٨٥].

---

[١٨٤] صحيح أبي داود رقم : (٤٠٨٥) .

[١٨٥] إجابات مفيدة وتوجيهات سديدة ص : (٣٤-٣٦) .

*** چارەسەری درۆ کردن :**

**پ ٨٧ / زۆرسوپاسی جەنابتان ئەکەم کە ئاوا هیلاک دەبن بە دەست وەڵامدانەوەی پرسیارەکانمان هیوادارم خوای گەورە لە ڕەحمی خۆی بێ بەشتان نەکات و پاداشتان بداتەوە ، بەڕێزان من زۆر لە خوای گەورە دەترسم بەڵام ئێستا حاڵەتێکم بەسەر دێت کە خۆشم قین لە خۆم دەکەمەوە بەس خۆم ناتوانم یارمەتی خۆم بدەم جار جار کە قسە دەگێڕمەوە هەندێ بەشی قسەکە بەڕاستی ناگێڕمەوە وە خۆم بۆی زیاد دەکەم واتە بە کوردی‌یەکەی ترش و خوێی پێوە دەکەم و درۆ دەکەم ، وە ئەم درۆیە بە قەستەوە نی‌یە بەڵام قسەکە وا دێتە دەرەوە .. واتە کە قسە دەکەم بەو نیەتەوە قسە ناکەم کە درۆ بکەم و قسەی درۆ دروست بکەم بەس لا شعوریە کە قسەکە تەواو دەکەم ئینجا سڕ دەبم و بیرم دەکەوێتەوە کە ئەو قسەم بە ڕاستی نەگێڕاوەتەوە ، خۆم زۆر بە تاوانبار دەزانم وە زۆر خەفەتی پێوە دەخۆم چونکە من وا نەبووم تازە وام لێ هاتووە ، داواتان لێ دەکەم ئەگەر هیچ دوعایەکتان لایە کە لە درۆ و دەلەسە دوورم بخاتەوە پێم بڵێن وە لە لایەن خۆتانەوە دوعای خێرم بۆ بکەن لای خوای گەورە کە ئەو کارە ناشرینەم پێ تەرک بکات ، زۆر سوپاس ، وە داوای لێ بوردن دەکەم کە نامەکەم درێژەی کێشا .**

وەڵام /

بۆ ئەوەی ڕزگارت ببێت لە ڕەوشتی خراپی درۆ کردن و هاوشێوەکانی لە تاوانەکانی تری زمان ئەوا دەبێت ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدەیت :

١ ـ هەست کردن بەوەی کە لە کاتی قسەکردنتدا خوا ئاگای لێتە و هەرچی وتەیەك بڵێیت ئەوا خوا دەیبیسێت و لە سەریشت تۆمار دەکرێت ، بە بەڵگەی ئەم ئایەتانەی خوارەوە : ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٧)﴾ **[المجادلة] .**

واتە : ئایا نازانیت کەوا بەڕاستی خوا ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەویدایە دەیزانێت ، هیچ چپەیەك نییە لە نێوان سێ کەسدا ئیللا خوا چوارەمیانە ، وە لە نێوان پێنجدا ئیللا خوا شەشەمیانە ، وە لە نێوان کەمتر لەوە و زیاتریش لەوە ئیللا خوا لەگەڵیاندایە لە هەر کوێیەك بن ئەنجا لە ڕۆژی قیامەتدا هەواڵیان دەداتێ بەوەی کە کردوویانە ، بەڕاستی خوا زانایە بە هەموو شتێك .

﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾ ﴾ [التوبة] .

واتە : ئایا نەیانزانیوە کەوا بەڕاستی خوا بە نهێنی و چپەچپیان دەزانێت و بەڕاستی خوا زۆرزانایە بە پەنهانییەکان .

﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾ [سورة ق] .

واتە : هیچ وتەیەك (قسەیەك) نایەت بە سەر زمانیدا ئیللا چاودێر و نووسەرێکی لە لادایە و هەموو وتەکانی لە سەر دەنوسێت .

﴿ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ [الزخرف] .

واتە : ئایا وا حیساب دەکەن (وادەزانن) کەوا ئێمە نهێنی و چپەچپیان نابیسین ؟ بەڵێ دەیبیسین و نێردراوەکانیشمان لە لایاندان و دەینووسن .

کەواتە هەست کردنت بەوەی کە خوا هەموو وتەکانت دەبیسێت و دەیزانێت و فریشتەکانیش دەینووسن لە سەرت دەبێت ببێت بە ڕێگر لەوەی کەوا بە هیچ شێوەیەك درۆ و وتەی بێسوود و قسەی خراپ نەیەت بە زمانتدا .

٢ ـ ئەگەر هەر کاتێك ویستت قسە بکەیت و حەزت لە قسە کردن بوو ئەوا یان قسەی خێر و چاك بکە یان بێ دەنگ بە :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی :

**((من كانَ يؤمن بالله واليومِ الآخر فَلْيقُلْ خيراً أو ليصمت))**[١٨٦] .

---

[١٨٦] صحيح البخاري رقم : (٦٤٧٥) و (٦٠١٩) وصحيح مسلم رقم : (١٧١) .

واته : هەر كەسێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە ئەوا با یان قسەی چاك بكات یان با بێ دەنگ بێت .

هەروەها فەرموویەتی : **((من صمت نـجا))**[187].

واته : هەر كەسێك بێ دەنگ بێت ئەوا ڕزگاری دەبێت .

٣ ـ بزانە درۆ كردن تاوانێكی زۆر ترسناك و گەورەیە و سزاكەشی سەختە و وازهێنـان لێشی دەتباتە بەهەشتەوە :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی :

**((علَيكُم بِالصدق فَإن الصدق يهدي إلَى الْبِر ، وإن الْبِر يهدي إلَى الْجنة ، وما يزالُ الرجلُ يصدق ويتحرى الصدق حتى يكْتب عند الله صديقاً ، وإياكُم والْكَذب فَإن الْكَذب يهدي إلَى الْفُجور ، وإن الْفُجور يهدي إلَى النار ، وما يزالُ الرجلُ يكْذب ويتحرى الْكَذب حتى يكْتب عند الله كَذاباً))**[188].

واته : پەیوەست بن بە ڕاسگۆییەوە ، چونكە بەڕاستی ڕاستگۆیی ڕێنماییت دەكات بۆ چاكە ، وە بەڕاستی چاكە ڕێنماییت دەكات بۆ بەهەشت ، وە پیاو بەردەوام ڕاست دەكات و بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێت تاوەكو لە لای خوا بە زۆر ڕاستگۆ دەنووسرێت ، وە وریا و بە ئاگا بن لە درۆ ، چونكە بەڕاستی درۆ ڕێنماییت دەكات بۆ خراپە ، وە بەڕاستی خراپە ڕێنماییت دەكات بۆ ئاگری دۆزەخ ، وە پیاو بەردەوام درۆ دەكات و بە دوای درۆدا دەگەڕێت تاوەكو لە لای خوا بە زۆر درۆزن دەنووسرێت .

هەروەها فەرموویـەتی : **((ويلٌ للذي يحدثُ بِالْحديث ليضحك بِه الْقَوم فَيكْذب ويلٌ لَه ويلٌ لَه))**[189].

---

[187] صحيح سنن الترمذي رقم : (٦٦٠) .

[188] صحيح البخاري رقم : (٦٠٩٤) وصحيح مسلم رقم : (٦٥٨٢) .

[189] صحيح أبـي دواد رقم : (٤٩٩٠) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٥٥٧) .

واتە : وەیل و تیاچوون و فەوتان بۆ ئەو کەسەی کەوا قسە دەکات و درۆ دەکات بۆ ئەوەی خەڵکی پێی پێبکەنن ، وەیل و تیاچوون و فەوتان بۆ ئەو کەسە ، وەیل و تیاچوون و فەوتان بۆ ئەو کەسە .

هەروەها فەرموویەتی : **((تقبلُوا لي ستاً أتقبَلْ لَكُم بِالْجنة ، قَالُوا : ما هي ؟ قَالَ : إِذَا حدثَ أحدكُم فَلا يكْذب ، وإِذَا وعد فَلا يخلف ، وإِذَا اؤتمن فَلا يخن ، وغُضوا أَبصاركُم ، وكُفوا أَيديكُم ، واحفَظُوا فُروجكُم))[١٩٠].**

واتە : ئێوە شەش شتم لێوەربگرن و منیش بەهەشتان بۆ وەردەگرم : ئەگەر یەکێك لە ئێوە قسەی کرد ئەوا با درۆ نەکات ، وە ئەگەر پەیمانی دا ئەوا با پێچەوانەی نەکات ، وە ئەگەر ئەمانەتێك خرایە لای ئەوا با خیانەتی لێنەکات ، وە چاوتان دابخەن و دەستتان بگرنەوە و عەورەت و دامێنتان بپارێزن .

٤ ـ هاوەڵێتی کەسانێك بکە کەوا قورئان خوێن و دەم بە زیکری خوا بن ئەوانەی کەوا لە مەجلیسەکانیاندا بەردەوام باسی خێر و چاکەکاری دەکرێت و ڕاستگۆن و بە هیچ شێوەیەك درۆیان لێ نابیسیت و لێتیش ڕازی نابن درۆیان بۆ بکەیت .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إنما مثَلُ الْجليسِ الصالحِ والْجليسِ السوءِ : كَحاملِ الْمسك ونافخِ الكيرِ ، فَحاملُ الْمسك إما أَنْ يحذيك ، وإما أَنْ تبتاع منه ، وإما أَنْ تجِد منه ريحاً طَيبةً ، ونافخ الْكيرِ إما أَنْ يحرق ثيابك ، وإما أَنْ تجِد ريحاً خبِيثَةً))[١٩١].**

واتە : نموونەی هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ : وەکو هەڵگری بۆنی میسك (واتە بۆن فرۆش) و فۆکار بە کوورەدا (واتە ئاسنگەر) وایە ، جا هەڵگری بۆنی میسك یان لەو بۆنەت پێدەبەخشێت یان لێی دەکڕیت یان بۆنی خۆشی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت ،

---

[١٩٠] مسند أبي يعلى الموصلي رقم : (٤ / ١٨٨) وصححه الألباني صحيح الجامع الصغ رقم : (٢٩٧٨) .

[١٩١] صحيح البخاري رقم : (٢١٠١) و (٥٥٣٤) وصحيح مسلم رقم : (٢٦٢٨) .

بەڵام فۆکار بە کوورەدا یان جلەکانت دەسوتێنێت یان بۆنی پیسی لێدەبینیت و هەڵیدەمژیت .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ تصاحب إلا مؤمناً ، ولاَ يأكُلْ طَعامك إلا تقي))[192].**

واتە : هاوەڵێتی ئیماندار نەبێت نەیکەیت ، وە با کەس خواردنت نەخوات ئیللا کەسێکی لە خوا ترس و خۆپارێز لە تاوان نەبێت .

٥ ـ دوور کەوتنەوە و بە جێهێشتنی ئەو شوێن و جێگا و مەجلیسانەی کەوا تاوانی درۆ و قسەی بەتاڵ و بێ سوودی تێدا دەکرێت ، بە بەڵگەی فەرموودەی ئەو کەسەی کەوا سەد کەسی کوشت و پاشان تەوبەی کرد : پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : **((اخرج من الْقَرية الْخبِيثَة التي أنت فيها إِلى الْقَرية الصالحة قَرية كَذَا وكَذَا [فَإن بِها أُناساً يعبدونَ الله] فَاعبد ربك [معهْم] فيها ، [ولاَ ترجِع إِلى أرضك فَإنها أرض سوءٍ]))[193].**

واتە : دەرچوو لەو گوندە پیسەی کە تۆ تێیدا دەژیت و بڕۆ بۆ ئەو گوندە چاکەی کەوا خەڵکانێکی تێدایە خوا دەپەرستن و تۆش لەگەڵ ئەواندا خوای پەروەردگارت بپەرستە تێیدا ، وە نەگەڕێیتەوە بۆ زەویەکەی خۆت چونکە خەڵکەکەی خراپە .

٦ ـ ئەگەر ویستت درۆ بکەیت ئەوا لە شوێن و جێگایەکدا بیکە کەوا مۆڵکی خوا نەبێت !

ئایا دەتوانیت ؟! !

یان لە شوێن و جێگایەکدا درۆ بکە کەوا خوا نەیبیسێت !

ئایا دەتوانیت ؟! !

کەواتە شەرم لە خوا بکە و درۆ مەکە .

٧ ـ بەردەوام داوا لە خوای گەورە بکە و لێی بپاڕێرەوە و بڵێ :

---

[192] **صحيح أبـي داود رقم : (٤٨٣٢) .**

[193] **سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٤٠) .**

خوایە پەنات پێ دەگرم لە درۆ کردن و یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی بە یەکجاری واز بێنم لە درۆ کردن بە هەموو شێوەیەك .

بەڵام دوعایەکی تایبەتم بەرچاو نەکەوتووە بۆ ئەوەی کە لە درۆ و دەلەسە دوورت بخاتەوە ، کەواتە ئەو ڕێگایانە بگرە بەر و خۆت داوا لە خوا بکە و لێی بپاڕێرەوە بۆ ئەوەی بتپارێزێت لە درۆ کردن و هەموو تاوانەکان .

### * حوکمی جگەرە کێشان :

**پ ٨٨ / ئایا جگرە کێشان حەرامە ؟ من دایکم جگرە دەکێشێ زۆر هەوڵی لەگەڵ ئەدەم تەرکی ناکات ئایا گوناهبار دەبێت ؟ ئەگەر داوای پارە لە من بکات بۆ جگەرە چی بکەم ؟ ناتوانم نەیدەمێ چونکە دایکمە ، زۆریش لەگەڵی دەڵێم تەرکی ناکات ئایا بۆ پارە دانەکە گوناهبار دەبم یان نا ؟**

وەڵام /

بەڵێ جگرە کێشان حەرامە ، بەڵگە بە هێز و ڕاستەکان کەوا حەرامێتی جگەرەکێشان دەسەلمێنن :

**بەڵگەی یەکەم** : خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ١٥٧﴾ **[الأعراف] .**

واتە: خوای گەورە شتە پاك و بەسودەکانی بۆ حەلاڵ کردوون و شتە پیس و زیان بەخشەکانی لێ قەدەغە و حەرام کردوون .

گومانی تێدا نی یە جگەرەکێشان یەکێکە لە شتە زیان بەخشەکان کەزەرەر و زیانیانی بۆ لاشەی ئادەمیزاد هەیە و لە هەمان کاتدا بۆنێکی ناخۆشی هەیە کە خەڵك ئازار دەدات .

**بەڵگەی دووەم** : خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ١٩٥﴾ **[البقرة]** .

واتە: بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە مەترسییەوە .

وە بەبێ هیچ شك و گومانێك جگەرە كێشان مرۆڤــ دوچاری گەلێك نەخۆشی لەناوبەر دەكات لەوانە : سەرەتان و سیل و نەخۆشی یەكانی دڵ و ئەو نەخۆشیانەی دوچاری گەدە دەبن ، ئەمەش جگە لەوەی كە ڕوو ناشیرن دەكات و ددانەكان زەرد و تێك دەدات .

**بەڵگەی سێیەم** : خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ﴿٢٩﴾﴾ **[النساء]** .

واتە: خۆتان نەفسی خۆتان مەكوژن.

هەروەها **جگەرەكێشان** دەبێتە هۆی وردەوردە كوشتن و لەناو بردنی جگەرە كێش كە ئەمەش لە ئیسلامدا بە {ئینتحار} و خۆكوشتن ناوی هاتووە.

**بەڵگەی چوارەم** : خوای گەورە دەربارەی عەرەق وقومار دەفەرموێت: ﴿وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ﴿٢١٩﴾﴾ **[البقرة]** .

واتە: زیانیان زۆرترە لە سودیان .

گومانی تێدا نی یە كە زەرەر و زیانی **جگەرەش** لە سودەكەی زۆرتر و كاریگەرترە، و بەڵكو كۆی زیانە .

**بەڵگەی پێنجەم** : خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾﴾ **[الإسراء]** .

واتە: ماڵ و سەروەت و سامانتان لە حەرام و سەرپێچی خوای باڵادەستدا خەرج و بەفیڕۆ مەدەن، چونكە بەڕاستی ئەو كەسانەی كەوا ماڵ و سەروەتیان لە حەرامدا خەرج دەكات ئەوانە برا و دۆستی شەیتانەكانن .

وە هەروەها برای گوێڕایەڵم بزانە كەوا **جگەرەكێشان** ماڵ خەرج (سەرف) كردنە لە تاوان ، و سەرپێچی كردنە لە فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەرە ئازیزەكەی (ﷺ) وە جێ بەجێكردنی فەرمانی شەیتانە و لەكردەوەكانی شەیتانە .

**بەڵگەی شەشەم** : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت :

**((لا ضرر ولا ضرار))**[194].

واتە: نە زیان لەخۆت بدە و نەلە خەڵکیش .

برای ئازیزم با بزانین **جگەرەکێشان** هیچ زیانێکی هەیە بۆ خۆت و بۆ خەڵکی و بۆ خێزانت و بۆ منداڵت و بۆ هاوڕێکانت و بۆ ... بۆ .... هتد؟

بێ گومان هەمووومان دەیزانین و ئاشکرایە کە جگەرەکێشان زەرەر و زیان لە جگەرەکێشەکە دەدات و دەبێتە مایەی ئازار و ناڕەحەتی بۆ کەسانی دەور و بەرو هاوڕێ و هاوسێ ، جگە لەم زیانە سەختانە **جگەرەکێشان** دەبێتە هۆی لەناوبردنی ماڵ و پول و سامانی مرۆڤ .

**بەڵگەی حەوتەم** : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: **((إن الله كره لكم ثلاثاً : ... وإضاعةَ الْمال ...))**[195].

واتە: خوای گەورە سێ شتی پێی ناخۆشە بۆتان : ... وە ماڵ و سەروەت و سامانتان لە شتی بێسود و بێنرخ دا بەفیڕۆ بدەن .

برای بەڕێزم با سەیرێکی کرداری جگەرەکێشان بکەین کە بەڕاستی لە ناوبەر و بەفیڕۆدەری ماڵ و کونکەری ڕاستەقینەی گیرفانی مرۆڤە بێ ئەوەی هیچ پێویستیەکی ژیانی مرۆڤ پڕبکاتەوە، کەواتە خوای گەورە **جگەرەکێشانی** قەدەغەی کردووە و بە حەرامی داناوە لەسەر بەندەکانی .

**بەڵگەی هەشتەم** : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

**((مَثَلُ الْجليسِ الصالحِ والْجليسِ السوءِ كَمَثَلِ صاحبِ الْمسك وكيرِ الْحداد ، لا يعدمك من صاحبِ الْمسك : إما تشتريه ، أو تجِد ريحه ، وكير الحداد : يحرق بدنك أو ثوبك أو تجِد منه ريحاً خبيثَةً))**[196].

---

[194] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٣٤١) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٥٠) .

[195] صحيح البخاري رقم : (١٤٧٧) وصحيح مسلم رقم : (٤٤٦١) .

[196] صحيح البخاري رقم : (٢١٠١) .

واتە : نموونەی ئەو کەسەی کە دانیشتن و هەڵس وکەوت لەگەڵ پیاو چاکدا دەکات ، و ئەو کەسەی کە دانیشتن و هەڵس وکەوت لەگەڵ پیاو خراپدا دەکات وەکو میسك فرۆشێك و کورەی ئاسنگەرێك وایە ، چونکە پیاو چاك وەکو میسك فرۆشەکە وایە ، یان لێی دەکڕیت ، وە یان بۆنێکی خۆشت بەسەردا دێت ، وە نموونەی پیاو خراپیش وەکو کورەی ئاسنگەر وایە ، لێی ڕزگار نابیت یان لەشت دەسوتێنێت ، وە یان جلەکانت دەسوتێنێت ، وە یان بۆنێکی ناخۆشت لێیەوە بەسەردادێت .

**جگەرەکێشانیش** بۆنێکی ئێجگار ناخۆش و بێزارکەری هەیە تەنانەت لە سیر و پیازیش بۆنی ناخۆشترە و دەبێتە هۆی ئازاردانی کەسانی هاوڕێ و هاوسێ و خزم و کەس وکارت.

**بەڵگەی نۆیەم** : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت :

**((كُل أُمتي معافًى إلا الْمجاهرين ...))**[197].

واتە : هەموو ئوممەتەکەم عەفو دەکرێن و چاوپۆشیان لێدەکرێت ئیللا ئەوانە نەبێت کە تاوانەکانیان ئاشکرا دەکەن و بە بەرچاوی خەڵکەوە تاوان ئەنجام دەدەن .

لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیە وایە کە هەموو تاوانە نادیار و شاراوەکانی موسڵمان ئومێد دەکرێت کە خوای گەورە لێیان خۆش بێت و سزایان نەدات بەڵام ئەمە ئەو تاوان و سەرپێچیانە ناگرێتەوە کەوا بەئاشکراو بە بەر چاوی خەڵکەوە ئەنجام دەدرێن وەکو **جگەرەکێشەکان** کاتێك کە جگەرە دەکێشن، چونکە جگەرەکێشان بەئاشکرا هانی کەسانی دیکە دەدات بۆ ئەم تاوانە ڕوون و ئاشکرایە .

**بەڵگەی دەیەم** : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت :

**((من كَانَ يؤمن بِالله والْيومِ الآخر فَلاَ يؤذ جاره))**[198].

---

[197] صحيح البخاري رقم : (٦٠٦٩) وصحيح رقم : (٧٤١٠) .

[198] صحيح البخاري رقم : (٦٤٧٥) و (٦٠١٩) والزيادة له برقم : (٦١٣٨) وصحيح مسلم رقم : (١٧١) .

واتە : هەر کەسێك کەوا بڕوای بە خواو ڕۆژی دوای هەیە ئەوا با زەرەر و زیان لە دراوسێکەی نەدات و ئازاریان پێنەگەیەنێت .

وە جگەرەکێش پێویستە ئەوە بزانێت کە **جگەرەکێشان** بە بۆنەکەی ئازاری خێزان و منداڵ و دراوسێکانی پێ دەدرێت ، بە تایبەت برا نوێژخوێنەکان لەڕیزی نوێژی جەماعەتدا .

وە هەروەها مەلائیکە نزیکەکانیش بێزار دەبن بە بۆنی **جگەرەکێش** .. چونکە مەلائیکەکانیش بەو شتانە بێزرا دەبن و ئازار دەبینن کەوا لای موسڵمانانی پێ بێزرا دەبێت وەکو جگەرەی ئەمڕۆ :

**عن جابر بن عبد الله (رضي الله عنهما) عن النبي (ﷺ) قَالَ : ((من أَكَلَ الْبصلَ والثوم والْكُراثَ فَلاَ يقْربن مسجدنا فَإن الْملاَئكَةَ تتأَذى مما يتأَذى منه بنو آدم))[199].**

واتە : هەرکەسێك پیاز و سیر و کەوەری خوارد ئەوا با نزیکی مزگەوتەکەمان نەکەوێتەوە چونکە فریشتەکان بێزرا دەبن و ئازار دەبینن بەوەی کە ئادەمیزاد ئازاری پێ دەبینێت و بێزاری دەکات .

**فەتوای زانایان دەربارەی جگەرەکێشان :**

١ ـ زانای پایە بەرزی ئیسلام (**الشیخ عبدا عبدالعزیز بن باز ر ة ا** ) دەفەرموێت : (**جگەرەکێشان** حەرامە و کڕین و فرۆشتنی حەرامە وە هەروەها دوکان بەکرێ دان بۆ جگەرە فرۆشتن حەرامە، وە هاوڕێیەتی کردنی کەسانی جگەرەکێشیش لەکاتی کێشانی جگەرەدا دروست نییە)[200].

٢ ـ بە هەمان شێوە زانای ناودار و پایە بەرز و شەرع زان ( **مد بن صا العثـيم ر ه ا** ) فەتوای داوە بە حەرام بوونی جگەرەکێشان[201].

---

[199] صحيح مسلم رقم : (١٢٥٤) .

[200] الفتاوى الإسلامية : (٢ / ١٦٢) .

[201] مـجموعة فتوى ورسائل الشيخ ابن العثيم : (١١ / ٢٤٨) .

٣ ـ وە هەروەها زانایانی **(اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتـاء)** فـەتوایان داوە بـە حەرامێتی جگەرەكێشان[٢٠٢].

وە بە نیسبەت وەڵامی پرسیاری دووەمتەوە دەڵێم : بەڵی دایكت بە جگرە كێشان تاوانبار دەبێت چونكە ئارێكی حەرام ئەنجام دەدات ، وە پێویستە بەردەوام ئامۆژگاری بكەیت و ئەم بەڵگە و فەتوایانەی بۆ بخوێنەرەوە تاوەكو خوا هیدایـەتی دەدات و واز لـە جگەرەكێشان دێنێت ، وە ئەگەر وازی نەهێنا ئـەوا تـۆ بـۆ مـاوەی چـەند ڕۆژێـك پـارەی مەدەرێ بۆ ئەوەی بزانیت هەڵوێستی چـیـە ؟ جـا ئەگـەر هـەر بـەردەوام بـوو لـە سـەر داواكردنی پارە بۆ جگەرە كڕین و هەستت كرد عاجز دەبێت لێت ئەو كاتـە لـە بـەر دوور خستنەوەی تاوانی گەورەی پچڕاندنی سیلەی ڕەحمی دایكایـەتی پارەكـەی بـدرێ بـەڵام نەك بە ناوی جگەرە كڕینەوە بەڵكو پێی بڵێ : من ئەم پارەیەت دەدەمێ بۆ خۆت ئەنجا تۆ خۆت چی پێ دەكەیت كەیفی خۆتە ، وە ئەگەر وتی هەر دەبێت تۆ بۆم بكڕیـت ئـەوا كاتە ناچار دەبیت و تاوانەكەی خۆی و تۆیش دەكەوێتە ئەستۆی دایكت ـ **والله أعلم** ـ .

پ٨٩ / حوكمی هەبونی ڕەسم لە ماڵدا چیـیە ؟

وەڵام /

هەبونی وێنەی گیان لەبەر لە ماڵاندا حەرامە و دروست نییە ، چونكە دەبێتە ڕێگر و مەحروم بـوون لـە هاتنـە ژوورەوەی فریـشتەكان بـۆ نـاو ئـەو ماڵانـەی كـە وێنـەی گیـان لەبەریان تێدایە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویـەتی : **((إن الْملائكَةَ لاَ تدخلُ بيتـاً فيـه صورةٌ))**[٢٠٣].

واتە : بەڕاستی فریشتەكان ناچنە ناو ماڵێكەوە وێنەی تێدا هەبێت .

بە هۆی ئەمەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانیشی نەڕۆیـشتوونەتە نـاو ماڵێكـەوە كەوا وێنەی تێدا هەبووە :

---

[٢٠٢] **الفتاوى الإسلامية : (٢ / ١٧٦) .**

[٢٠٣] **صحيح البخاري رقم : (٣٢٢٤) وصحيح مسلم رقم : (٥٤٨٤) .**

شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت چەند فەرموودەیەکی لەم بارەیەوە باس کردووە لە کتێبە زۆر بە نرخەکیدا (**آداف الزفاف / ص : (٧٦ ـ ٨١)**دا و فەرموویەتی :

**الأول : عن علي (رضي الله عنه) قالَ : صنعت طَعاماً فَدعوت رسولَ الله (ﷺ) فَجاءَ فَرأى فـي البيت تصاوير فَرجع ، قالَ : فَقُلْت : يا رسولَ الله ما رجعك بِأبِي أنت وأمي ؟ قالَ : ((إن في البيت ستراً فيه تصاوير ، وإن الْملائكَةَ لا تدخلُ بيتاً فيه تصاوير))**[٢٠٤].

واتە : خواردنێکم دروست کرد و پێغەمبەری خوام (ﷺ) دەعوەت کرد ، ئەویش هات و لە ماڵدا هەندێك وێنەی بینی و گەڕایەوە ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا چی تۆی گەڕاندەوە باوك و دایکم بە قوربانت بێت ؟ فەرمووی : بەڕاستی لە ماڵدا پەردەیەك هەیە هەندێك وێنەی تێدایە ، وە
بەڕاستی فریشتەکان ناچنە ناو ماڵێکەوە وێنەی تێدا هەبێت .

دەبینین پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە و نەڕۆیشتە ژوورەوە بە هۆی هەبوونی هەندێك وینەوە لە ماڵدا ، ماڵەکەش ماڵی کێ بوو ؟ ماڵی **(فاطیمة)**ی کچی و **(علي)** زاوای بوو .

**الثانـي : عن عائشةَ (رضي الله عنها) قالَت : أنها اشترت نمرقَةً فيها تصاوير ، فَلَما رآها رسولُ الله (ﷺ) قام علَى الْبابِ فَلَم يدخلْ ، فَعرفْت في وجهه الْكَراهيةَ ، فَقُلْت : يا رسولَ الله أتوب إلَى الله وإلَى رسوله (ﷺ) ماذَا أَذْنبت ؟**

**فَقَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ما بالُ هذه النمرقَة ؟! قُلْت : اشتريتها لَك لتقْعد علَيها وتوسدها ، فَقَالَ رسولُ الله (ﷺ) : إن أَصحاب هذه الصور [إن الذين يعملُونَ هذه التصاوير] يعذبونَ يوم الْقيامة* ، فَيقَالُ لَهم : أَحيوا ما خلَقْتم .**

---

[٢٠٤] **صحيح سنن ابن ماجه رقم : (١١١٤) وأبو يعلى مسنده : (١ / ٣١) و (١ / ٣٧) و (٢ / ٣٩) والزيادة له بسند صـحيح قاله الألبانـي .**

* شێخ ئەلبانی فەرموویەتی : **[قال الـحافظ ت هذه الـجملة من الـحديث : (وفيه "إن الْملَائكَةَ لَا تدخلُ بيتاً فيه الصور" وهـذه الْجملَةُ هي الْمطَابِقَة لامتناعه من الدخول ، وإنما قَدم الْجملَةَ الْأُولَى ـ يعنـي : "إن أَصحاب هذه الـصور ..." ـ علَيهـا اهتمامـاً**

**وإن البيت الذي فيه [مثْلُ هذه] الصور لاَ تدخلُه الْملائكةُ ، [قَالَت : فَما دخـلَ حتـى أخرجتها]])[٢٠٥] .**

واتە : (**عائشة** رضي الله عنها) ڕاخەرێکی کڕی کە هەندێك وێنەی تێدا بوو ، جا کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینی لە پێش دەرگاکەدا ڕاوەستا و نەهاتە ژوورەوە ، بۆیە لە ڕوومەتیەوە زانیم و هەستمکرد بە بێزاری و پێناخۆشبوون و نەڕەزایی ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا تەوبە دەکەم و پەشیمان دەبمەوە لە لای خوا و پێغەمبەرەکەی ئایا چی تاوانیکم کردووە ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەم ڕاخەرە چییە ؟ وتم : بۆ تۆ کڕیومە بۆ ئەوەی لەسەری دانیشیت و پاڵی لەسەر بدەیتەوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بەڕاستی خاوەنی ئەم وێنانە (بەڕاستی ئەوانەی کەوا ئەم وێنانە دروست دەکەن) سزا دەدرێن لە ڕۆژی قیامەتدا ، وە پێیان دەوترێت : ئەوەی کە دروستتان کردبوو (وێنەیتان کێشابوو یان گرتبوو) زیندووی بکەنەوە و ڕۆحی بەبەردا بکەن و ژیانی پێببەخشن .

وە بەڕاستی ئەو ماڵەی کە هاوشێوەی ئەم وێنانەی تێدا بێت فریشتەکان ناچنە ناویەوە .

(**عائشة**) فەرمووی : جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهاتە ژوورەوە تاوەکو وێنەکەم لە ماڵ دەرهێنا .

---

**بِالزجر عن اتخاذ الصور ، لأن الْوعيد إِذَا حصلَ لصانِعها فَهو حاصلٌ لمستعملها ، لأنها لَا تصنع إِلا لتـستعملَ ، فَالـصانِع متـسبب والْمستعملُ مباشر فَيكُونُ أولَى بِالْوعيد)] .**

واتە : "بەڕاستی فریشتەکان ناچنە ناو ماڵێکەوە وێنەی تێدا بێت" ئەم دێڕە گونجاوە لەگەڵ خۆگرتنەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە چوونەژوورەوە ، وە لەبەر ئەوە دێڕی یەکەمی ـ واتە : "بەڕاستی خاوەنی ئەم وێنانە ..." ـ پێشخستووە لەسەری بە مەبەستی بایەخدان بە سەرزەنشت کردن لە وێنە ڕاگرتن ، چونکە ئەگەر هەڕەشە بەدی هات بۆ دروستکەرەکەی ئەوا بەدیش دێت بۆ بەکارهێنەرەکەی ، چونکە وێنە دروست ناکرێت تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە بەکاردەهێنرێت ، کەواتە وێنەکێش و وێنەگر هۆکارە و بەکارهێنەریش ئەنجامدەرە بۆیە لە پێشترە بە هەڕەشە .

[٢٠٥] **صحيح البخاري رقم : (٢١٠٥) و (٥١٨١) صحيح مسلم رقم : (٥٤٩٩) ، والزيادة الأولـى والثانيـة رواه الطيالـسي مسنده رقم : (١٥١٦) ، والزيادة الثالثة رواه أبو بكر الشافعي "الفوائد" وإسناده صحيح .**

لە پاش ئەم فەرموودانە شیخ ئەلبانی فەرموویەتی :

**(وعلى ما ذكرنا جرى عليه عمل السلف الصالـح (رضي الله عنهم) ، والأمثلة على ذلك كث ة جدا ، فأقتصر على ما ضرنـي الآن منها :**

**أ - عن أسلَم مولَى عمر : أن عمر بن الْخطابِ (رضي الله عنه) حـ قَدم الشام صنع لَه رجلٌ من النصارى طَعاماً فَقَالَ لعمر : إني أحب أنْ تجِيئَنِي وتكْرمنِي أنت وأصحابك وهو رجلٌ مـن عظَماءِ الشامِ ، فَقَالَ لَه عمر (رضي الله عنه) : ((إنا لاَ ندخلُ كَنائسكُم من أجلِ الصورِ التي فيها)) يعنِي التماثيلَ[٢٠٦].**

واتە : کاتێك پێشەوا (**عمر بن الْخطاب** رضي الله عنه) گەیشتە وڵاتی شام ، پیاوێکی گاور لە پیاوە گەورەکانی شام خواردنێکی دروست کرد و وتی بە عومەر : بەڕاستی من پێمخۆشە کەوا بێیت بۆ لام و خۆت و هاوەڵەکانت ڕێزم لێبگرن ، (**عمر** رضي الله عنه) پێی فەرموو : بەڕاستی ئێمە ناچینە ناو کەنیسەکانتانەوە لە بەر ئەوە وێنانەی کە تێیدا هەیە ـ واتە : بت و پەیکەرەکان ـ .

**واعلم أن فول عمر دليلا واضحا على خطأ ما يفعله بعض ا شايخ مـن ا ـضور الكنائس ا متلئة بالصور والتماثيل ، استجابة منهم لرغبة بعض ا سؤول أو غ هم ...**

واتە : بزانە کەوا ئەم وتەیەی عومەر بەڵگەیەکی ڕوونە لە سەر هەڵەیەتی ئەو کردەوەیەی کە هەندێك لە (شێخەکان) دەیکەن لە ئامادە بوونی ئەو کەنیسانەی کەوا پڕە لە وێنە و پەیکەر ، لە بەر بەدەمهاتنەوەی حەزی هەندێك لە بەرپرسان یان جگە لەوان ...

**ب - عن أبِي مسعود عقْبةَ بنِ عمرو (رضي الله عنه) : ((أن رجلاً صنع لَه طَعاما فَدعاه فَقَالَ : أفي الْبيت صورةٌ ؟ قَالَ : نعم ، فَأبى أنْ يدخلَ حتى كَسر الصورةَ ثُم دخلَ))[٢٠٧].**

---

[٢٠٦] رواه البيهقي [ "السنن الك ى" رقم : (١٤٩٥٨)] بسند صحيح .. "آداب الزفاف" ص : (٩٢) .

[٢٠٧] رواه البيهقي [ "السنن الك ى" رقم : (١٤٩٥٩)] وسنده صحيح ، كما قال ا افظ "الفـتح" .. "آداب الزفـاف" ص : (٩٣) .

واتە : پیاوێك خواردنێکی دروست کرد بۆ (ئەبی مەسعود) و دەعوەتی کرد ، ئەویش وتی : ئایا لەماڵدا وێنە هەیە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، ئەویش خۆی گرتەوە لەوەی کە بچێتە ژوورەوە تاوەکو وێنەکەی تێکشکاند ئەنجا ڕۆیشتە ژوورەوە .

کەواتە هەبوونی وێنە لە ماڵدا حەرامە و دەبێتە هۆی مەحروم بوون لە هاتنە ژوورەوەی فریشتە و پێغەمبەر (ﷺ) و صەحابە و زانایان و پیاوچاکان ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودانەی سەرەوە .

**پ ٩٠ / حوکمی وێنەگرتن بە فۆتۆ چی‌یە ؟**

وەڵام /

وێنەگرتنی هەموو گیان لەبەرێك (چ مرۆڤ بێت یاخود حەیوان یان باڵندە بێت) بە هەموو شێوەیەك و بە هەموو ئامێرێك حەرامە و قەدەغەکراوە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) :

١ ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((أن الملائكةَ لا تدخلُ بيتاً فيه صورةٌ ، وأن من صنع الصورةَ يعذب يوم القيامة ، [ويقالُ لهم] : أحيوا ما خلقْتم))**[٢٠٨].

واتە : بەڕاستی فریشتەکان ناچنە ناو ماڵێکەوە وێنەی تێدا هەبێت ، وە بەڕاستی ئەوانەی کە وێنە دروست دەکەن سزا دەدرێن لە ڕۆژی قیامەتدا ، وە پێیان دەوترێت : ئەوەی کە دروستتان کردووە زیندووی کەنەوە و ڕۆحی بەبەردا بکەن و ژیانی پێ‌ببەخشن .

٢ ـ هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إن أصحاب هذه الصور يعـذبونَ يوم القيامة))**[٢٠٩].

واتە : بەڕاستی خاوەنی ئەم وێنانە سزا دەدرێن لە ڕۆژی قیامەتدا .

---

[٢٠٨] **صحيح البخاري رقم : (٣٢٢٤) و (٥١٨١) وصحيح مسلم رقم : (٥٤٩٩) .**

[٢٠٩] **صحيح البخاري رقم : (٢١٠٥) و (٥١٨١) صحيح مسلم رقم : (٥٤٩٩) .**

وە ئەوەش بزانە کەوا هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان وێنەکێشان بە دەست و وێنەگرتن بە کامێرای فۆتۆ یان بە فیدیو یان بە مۆبایل چونکە هەموویان پێیان دەوترێت وێنە **(صورة)** بەڵام لە ڕێگاکانی دروست کردنیان یان دەرخستنیان جیاوازی هەیە ، ئەم جیاوازیەش حوکمی وێنەگرتن ناگۆڕێت لە حەرامەوە بۆ حەڵاڵێتی وەك هەندێك دەیڵێن ! بڕوانە کتێبی **(آداب الزفاف)**ی شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت لاپەڕە : **(٩٧ ـ ١٠٧)** .

**پ٩١ / ئێوە باوەڕتان نیە بە پەرەسەندن و گۆڕانکاری لە ئەحکامە شەرعیەکاندا ، بۆ نموونە وێنەگرتن کێ هەیە لەم سەردەمەدا بتوانیت خۆیی لێ بپارێزێت ؟**

وەڵام /

ئێمە باوەڕمان بە پێشکەوتن و گۆڕانکاری هەیە لە بواری دونیادا و هەر کارێك کە خزمەتی مرۆڤایەتی پێ بکرێت بە کارێکی چاکی دەزانین ..

بەڵام ئایین و ئەحکامە شەرعیەکان ئەوا گۆڕانکاریان بەسەردانایەت و حەرام هەر حەرامە و حەڵاڵیش هەر حەڵاڵە و بۆ کەسیش نیە ڕەخنە بگرێت لەم بوارەدا چونکە ئاینی ئیسلام بۆ هەموو کات و سەردەم و شوێن و جێگایەك هاتووە ..

تۆ باسی وێنە (ڕەسم) گرتنت کردووە و دەڵێیت کێ هەیە بتوانێت خۆیی لێ بپارێزێت ؟

لە وەڵامدا دەڵێم : بەڵێ لەم سەردەمەشدا هەزاران کەسی لە خوا ترس هەیە خۆی پاراستووە لە وێنە گرتن لە بەر ئەوەی کە وێنە گرتن کارێکی حەرامە و پێچەوانەی بەڵگە شەرعیەکانە .. مەگەر تەنها وێنەی بە ڕێکردنی موعامەلات نەبێت کە بۆ زەرورەت دەگیرێت و لە ئاستێکی تەسکدا وەك وێنە بۆ جەوازات و هەویەی باری کەسایەتی و هاوشێوەکانی ئەمانە ...

بەڵام وێنە بۆ یادگاری و !!! گوێ گرتن لە مۆسیقا و ... هتد .. ئەوا ئێمەی ئەهلی سوننە بە کارانێکی حەرام و ناپەسەندی دەزانین و نایکەین **و الـحمد** ، لە

هەمان کاتیشدا خاوەنی کۆمپیتەر و هێڵی ئینتەرنێت و مۆبایل و هاوشێوەکانی ئەمانەین و باوەڕمان هەیە بە سوود بینین لەم ئامێرانە کە بە هۆی پێشکەوتن و گۆڕانکاری لە بواری دونیاوە بە دەست هاتوون ..

بەڵام سەرەنەزان و موفتیەیە حزبیەکان لە بەر نەزانی و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی کەسایەتی و حزبایەتی بە پێی هاواوئارەزووی خۆیان فەتوا دەدەن و حەرام حەڵاڵ دەکەن و ڕاوی خەڵکانێکی سادەی پێدەکەن ..

**پ٩٢ / زۆربەی مەلا و زاناکان دەلێن موسیقا گەر بۆ کاری چاکە بەکار بێت حەرام نیە وە ئەگەر حەرام بێت کەواتە ئەو هەموو ڕاگەیاندنە ئیسلامیانە لە کوفر و خەڵوەتدان (لَهو الْحـديث) خوای گەورە کە فەرموویەتی مەبەست شتێکە کە دین ناشرین بکات و قورئان لە بەرچاو خەڵکی بخات "إمام محمدی غەزالی" ئەفەرموێت ئەگەر قورئانیش بۆ لەبەرچاوخستنی خەڵک لێ بدەیت هەر حە رامە .. وە باسکراوە کە جارێکیان گوێی لە شیعرە وەتەنیەکانی " أم كلثوم" گرتووە ؟**

وەڵام /

وەڵامی ئەم پرسیارە بەم شێوازەی خوارەوە دەبێت :

١ ـ هیچ زانایەکی ڕەسەن و لە خوا ترس فەتوای نەداوە بە حەڵاڵێتی مۆسیقا ، بەڵکو بە پێچەوانەوە مۆسیقا لێدان و گوێ گرتن لێی کارێکی حەرامە و تاوانە ، ئاشکراترین بەڵگەش لە سەر حەرامێتی مۆسیقا ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی : **((لَيكُونن من أُمتي أقْوام يستحلونَ الْحر والْحرير والْخمر والْمعازف))**[٢١٠].

واتە : خەڵکانێك دەبن لە ئوممەتەکەمدا کەوا داوین پیسی و ئاوریشم و ئارەق و ئامێرەکانی مۆسیقا و دەنگ و ئاواز حەڵاڵ دەکەن .

کەواتە ئەم شتانە خۆیان لە بنەوادا حەرامن بەڵام کەسانێکی لە خوا نەترس دێن حەڵاڵیان دەکەن .

---

[٢١٠] **صحيح البخاري رقم : (٥٥٩٠) .**

٢ ـ ئەگەر شتێك یان کردارێك حەرام و قەدەغە کراو بێت ئەوا بۆ کاری چاکە بە کار ناهێنرێت چونکە خۆی لە خۆیدا خراپە و تاوانە باشە ئیتر چۆن بۆ چاکە بە کار دەهێنرێت مەگەر مەبەست ڕازی کردنی خەڵك بێت بۆ ئامانجێکی تایبەت وەك ئیسلامیە حزبیەکان دەیکەن !!

٣ ـ ئێمە ناڵێین : (ئەو هەموو ڕاگەیاندنە ئیسلامیانە لە کوفر و خەڵوەتدان) چونکە ئەمە زیادەڕەویەکی زۆی تێدایە ، بەڵکو دەڵێین : مۆسیقا لێدان و گوێ گرتن لێی کارێکی حەرامە و بەو شێوازە خەڵکی بانگ ناکرێت بۆ ئیسلام !

٤ ـ ببورە (محمد غەزالی) ئیمام نیە ! بەڵکو کەسێکی شوێنکەوتەی هەواوئارەزووەکانی خۆی بوو .. مەگەر ئیمامی گومڕایەتی و سەرلێشیوان بێت ئەگینا ئەو بە عەقڵی گەندەڵی خۆی ئایەت و فەرموودەکانی لێك داوەتەوە و هەمیشە شەیدای بیستنی گۆرانیەکانی (**أم کلثوم**) بووە ، بۆیە کۆتایی ژیانی و مردنی بەوە بوو کەوا لە کاتی ئامادە بوونیدا لە ئاهەنگێکی (**أم کلثوم**)دا مرد !

٥ ـ (محمد غەزالی) کە دەڵێت : (ئەگەر قورئانیش بۆ لە بەرچاوخستنی خەڵك لێبدرێت هەر حەرامە) !!!

ئایا تو خوا شێتیش قسەی وا دەکات و کاری وا دەکات ؟!!!

یان ئەمە شوبهەیەکی شەیتانیە بۆ لە خشتە بردنی خۆپارێزەران لە گوێ گرتن لە حەرام !

بۆ زانینی (حوکمی گۆرانی و مۆسیقا لە قورئان و سوننەت و وتەی زانایان)دا ئەم بابەتە بخوێنەرەوە لە ژمارە نۆ (٩)ی گۆڤاری (**ڕێگای ڕاست**)دا .

***ڕێگرتن و مەنع کردنی منداڵبوون :**

**پ ٩٣ / ئەگەر نەهێلیت منداڵت ببێ بە خواردنی حەبی مەنع ئەوا حەرامە ؟**

**وەڵام /**

لێرەدا ووتەیەکی ئیمامی **(ابن العثیم )** ڕەحمەتی خوای لێبێت باس دەکەین بۆ ئەو ئافرەتانەی کەوا (حەپی مەنع) بەکاردێنن ، پێشەوا فەرموویەتی : **(إن استعمال هذه الحبوب ضار على المرأة ، على رحمها ، وعلى عادتها ، وعلى دمها ، بل وعلى جنينها المستقبل ، وقد يحصل من هذه الحبوب تشويه للأجنة فيخرج الجنين مشوهاً ، ولهذا كثر الآن التشويه ، ما أكثر ما نسأل عن جنين في بطن أمه ليس على رأسه عظم ، ونسأل عن جنين مشوه ، كل هذا من أجل هذه الحبوب التي ضرت المسلمين من جهة ، ومنعت كثرة الإنجاب من جهة أخرى)**[٢١١].

واتە : بەکارهێنانی ئەم حەپانە زەرەر و زیانی هەیە بۆ ئافرەتان ، زەرەری هەیە بۆ منالْدانی ، بۆ عادەکەی ، بۆ سەر خوێنەکەی ، بەڵکو بۆ کورپەڵەکەی لە داهاتوودا ، وە هەندێك جار بە هۆی ئەم حەپەوە ناتەواوی و تێکچوون دێت بە سەر کۆرپەڵەکەدا و بۆیە کۆرپەڵەیەکی ناتەواو دەردەچێت ، لە بەر ئەمە ئێستا تێکچوونی منداڵ زۆر بووە ، وە زۆر جارێك پرسیارمان لێدەکرێت سەبارەت بە کۆرپەڵەیەك کە لە سکی دایکیدایە و سەری ئێسکی تێدا نیە ، وە پرسیارمان لێدەکرێت سەبارەت بە کۆرپەڵەیەکی تێکچوو و ناتەواو ، هەموو ئەمانە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم حەپانە کەوا زیانی گەیاند بە موسڵمانان لە ڕوویەکەوە ، وە بەرگیری کرد لە زۆر بوونی منداڵ بوون لە ڕوویەکی ترەوە .

*** ئایا مەنعی طەبیعی دروستە :**

**پ٩٤ / بەڕێزان لەبەر بارودۆخی ژیان مەنعی طەبیعی دەکەم ، ئایا حەڵاڵە یان حەرامە ؟**

---

[٢١١] مجموع فتاوى الشيخ ابن العثيم : المجلد السابع عشر / الفتوى رقم : (٧٢٢) .

وەڵام /

سەرەتا ئەوە بزانە ئەگەر مەنع كردنی منداڵ بوون لەبەر هۆكاری ئابووری بێت ئەوا حەرامە و شەرعی نىيە بە هەر شێوەيەك بێت چونكە رزقی خۆت و منداڵیش لە سەر خوايە وەك خوای گەورە فەرموويەتی : ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ ﴾ [الإسراء] .

واتە : منداڵەكانتان مەكوژن لە ترسی هەژاری و نەداريدا چونكە ئێمە رزقی ئەو منداڵانەی و ئێوەش دەدەين بەڕاستی كوشتنی منداڵ هەڵەيەكی گەورەيە .

مەنع كردنيش بەهەمان شێوە ئەگەر لەبەر كەمدەرامەتی و بارگرانی ژيان هەڵەيەكی گەورەيە چونكە رزقی منداڵ لە سەر خوايە (ئەگەر خوا سەر بدات رزقيش دەدات) وەك پێشينان فەرموويانە .

بەڵام ئەگەر لەبەر هۆكاری تر بێت وەك رێكخستنی منداڵ بوون بۆ ماوەيەكی كاتی تاوەكو دايك هەندێك پشوو بدات و زۆر ئازار و ناڕەحەتی نەبينيت بە هۆی زوو منداڵ بوون و بەخيوكردنی لە دوای يەكی منداڵەكانەوە ئەوا دروستە بە مەرجێك ئەگەر پياوەكە و ژنەكەش ڕازی بن و بۆ ماوەيەكی كاتی بێت نەك درێژخايەن .

وە مەنعی تەبيعی دوو جۆری هەيە :

أ / ڕشاندنی ئاوەكە بۆ دەرەوەی منالْدان ، ئەمەيان بۆ زياتر لە يەك ساڵ زيانی تەندروستی هەيە و نابێت بەردەوام بن لە سەری .

ب / خۆگرتنەوە لە جووت بوون لە كاتی يەكگرتن و پێتاندنی نێوان تۆوی پياو و هێلكەی ئافرەت كە دەكەوێتە دوای ڕۆژی پێنجەمی پاك بوونەوە لە عادەی مانگانە و تاوەكو ڕۆژی دوانزەيەم .

ئەم جۆرەی دووەميان هيچ زيانێكی تەندروسی تێدا نىيە ، لە سەدا حەفتا سەركەتو دەبێت .

بەڵام مەنعی صناعی بە خواردنی حەپ و دەرزی کۆتان و مناڵدان بەستن ... ئەمانە هەموویان زیانی تەندروستیان لێدەکەوێتەوە بۆیە بە ناشەرعیان دەزانم و فەتوای هەندێك لە گەورە زانایانیشی لە سەر هاتووە وەك لەم سایتەدا پێشتر بڵاوکراوەتەوە .

*** تاوانی کوشتنی منداڵ بەر لە ٤٠ ڕۆژ :**

**پ٩٥ / ئایا کوشتنی منداڵ لە سکی دایکیدا پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە (٤٠) چل ڕۆژ دروستە ؟**

وەڵام /

منداڵ لە بار برن دروست نیە ئیللا بە سێ مەرج نەبێت :

١ ـ لە کاتێکدا کە مانەوەی ئەو کورپەیە لە سکی دایکیدا ببێتە هۆی ترسناکی بۆ لە ناو چوونی دایەکەکە بە شایەتی دوو دکتۆری متمانەپێکراو (**ثقة**) و پسپۆر (**اخصائي**) لەم بوارەدا .

٢ ـ دەبێت تەمنی کۆرپەڵەکە لە (٤٠) ڕۆژ تێپەڕی نەکردبێت واتە ڕۆحی بە بەردا نەکرابێت .

٣ ـ دەبێت باوکی کۆرپەڵەکە بەو لە بار بردنە ڕازی بێت .

جا ئەگەر هەموو ئەم سێ مەرجەی تێدا کۆنەبێتەوە ئەوا دروست نیە کۆرپەڵەکە لە بار ببرێت .

بەڵام ئەگەر منداڵەکە ڕۆحی بە بەردا کرابوو ئەوا کوشتنی و لە بار بردنی بە (قتل عمد) واتە کوشتنی بەئەنقەست حیساب دەکرێت و یەکێکە لە تاوانە گەورەکان خوا پەنامان بدات .

*** لەبار بردنی منداڵ :**

**پ٩٦ / من لە دەرەوەی وڵات دەژیم و ساڵ و نیوێکە شووم کردووە دوای ئەوەی کە حەملم بوو لەگەڵ مێردەکەم چووین بۆ لای دکتۆر و بەڕەزامەندی هەردووکمان لە**

**ناویان برد دوو مانگ و شتێک بوو بەڵام نەمدەزانی بووە بە منداڵ دوای بینیم زۆر پێم ناخۆش بوو ، بەهەرحاڵ دوای حەزمان لە منداڵ کرد سوپاس بۆ خوای گەورە بوو هەتا سێ مانگ دوای لە خۆیەوە لەناو چوو ، ئێستا زۆر حەزمان لە منداڵە هەموو ساتێک ئەوەی یەکەممان لە بیرە خەریکە شێت ئەبم هەردووکمان زۆر پەشیمانین ئایا خوای گەورە لێمان خۆش دەبێت ؟**

وەڵام /

لەبار بردنی منداڵ تاوانە و دروست نی‌یە ، وە ئەگەر ڕۆحی بە بەردا کرابێت ئەوا دەبێتە کوشتن (قەتل) کە یەکێکە لە تاوانە گەورەکان ، وە زانایانی ئیسلام جیاوازییان تێدا سەبارەت بە کاتی (ڕۆح بە بەراکردنی منداڵ) ئایا لە (٤٠) چل ڕۆژەی پەیدا بوونی‌یەوە دەبێت یان لە (١٢٠) چوار مانگانەوە دەبێت ، جا ئەو حاڵەتەی ئێوە پێی تاوانبار دەبن بەڵام بە کوشتن (قەتل) حیساب ناکرێت **(إن شاء ا )** چونکە نەتانزانیوە ، بۆیە پێویستە لە سەرتان تەوبە بکەن و داوای لێبووردن لە خوا بکەن و پەیشمان ببنەوە لەو کارەتان و بڕیاریش بدەن کەوا جارێکی تر کاری نابەجێی ئاوا نەکەن ، وە ئەوەش بزانن کەوا لەبار بردنی منداڵ دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی مناڵدانی ئافرەت و ڕاگیر نەکردنی حەمل لە داهاتوودا ، وە هەندێك جاریش دەبێتە هۆی نەزۆکی بچوك **(العقم الصغری)** کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك ئەو ئافرەتە توشی نەزۆکی کاتی دەبێت بە هۆی تێك چوونی باری ئاسایی و خاوبوونەوەی مناڵدانی ئافرەتەکەوە ، ئەمەش یەکێکە لە گەورەترین زەرەر و زیانەکانی لەبار بردنی منداڵ **(الإسقاط أو الاجهاض)** .

جا خوشکی بەڕێز : لەوانەیە لەبار چوونی منداڵی دووەمتان هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ تێك چوونی باری ئاسایی و خاوبوونەوەی مناڵدانت بە هۆی لەبار بردنی منداڵی یەکەمتانەوە .

وە بۆ زانیاری زیاتر دەڵێم :

هۆی ئەم تاوانەتان دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێك لەوانە :

١ ـ نیشتەجێبوونتان لە دەرەوەی وڵات لە نێوەندی کافر و بێباوەڕەکاندا کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە تاوانە گەورەکان ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((أنا بريءٌ من كُل مسلمٍ يقيم بين أظْهر الْمشرك ، قَالُوا يا رسولَ الله لم ؟ قَالَ : لاَ تراءَى ناراهما))**[٢١٢].

واتە : من بەریم لەو موسڵمانەی کەوا نیشتەجێدەبێت (إقامە دەکات) لە نێوەنی بێباوەڕ و موشریکەکاندا ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا بۆ چی ؟ فەرمووی : نابێت ئاگری یەکتر ببینن .

٢ ـ ڕۆیشتنتان بۆ لای دکتۆرێکی کافر و بێباوەڕ کەوا خۆی لە تاوان ناپارێزێت کە لە خوا نەترساوە و بێ ڕەحمانە بەو منداڵە و بە تۆیش ئەو کارە ناپەسندەی ئەنجامداوە !

ئەمەش یەکێکی ترە لە زیانەکانی دووری لە وڵاتی ئیسلام و موسڵمانان !

٣ ـ نەزانین و جەهل و کەمتەرخەمی کردن لە پرسیار کردن پێش ئەنجامدانی کاری لەباربردنی منداڵەکە ، چونکە کاتێك نەتانزانی دەبوایە لە پێشدا پرسیارتان بکردایە ، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((ألا سألُوا إذْ لَم يعلَموا ، فَإنما شفَاءُ الْعي السؤالُ))**[٢١٣].

واتە : ئایا بۆ پرسیاریان نەکرد کاتێك نەیانزانی ، چونکە بەڕاستی شیفا و چارەسەری نەزانین پرسیار کردنە .

وە باشی دەزانم چەند ئامۆژگاریەکتان بکەم :

١ ـ پێویستە لە سەرتان تەوبە بکەن و داوای لێبووردن لە خوا بکەن و پەیشمان ببنەوە لەو کارەتان و بڕیاریش بدەن کەوا جارێکی تر کاری نابەجێی ئاوا نەکەن ، وە خۆتان لە هەموو تاوانێك بپارێزن .

---

[٢١٢] صحيح أبي داود رقم : (٢٦٤٥) .

[٢١٣] صحيح أبي داود رقم : (٣٦٦) .

٢ ـ بە زووترین کات بگەڕێنەوە بۆ نێو وڵاتی ئیسلام و موسڵمانان لەبەر ئەو فەرموودەیە و چەندین ئایەت و فەرموودەی تر کە دەرفەتمان نیە لێرەدا باسیان بکەین .

٣ ـ لە کاتی نەزانیدا پێش ئەوەی هەر کارێك ئەنجامبدەن سەرتا پرسیار بکەن بۆ ئەوەی تێنەکون .

٤ ـ داوا لە خوای پەروەردگار بکەن کەوا منداڵی صاڵحتان پێببەخشێت و ڕەحمتان پێ بکات و بە تاوانی خۆتان مامەڵەتان لەگەڵدا نەکات .

**پ ٩٧ / ئایا دەست گرتنی خێزانی خۆت لە بازاڕدا دروستە ؟**

**وەڵام /**

دەست گرتنی خێزانی خۆت لە ئەسڵ و بنەوادا دروستە چ لەماڵدا بێت یان لە بازاڕدا بێت ، بەڵام هەندێك کردار و ڕەفتار هەیە ئەگەر چی لە بنەڕەتیشدا حەڵاڵ و دروست بن ئەوا لایەق نیە لە شوێنە گشتیەکاندا ئەنجام بدرێن لە بەر پاراستنی کەسایەتی و شەهامەت و قورسی و سەنگینی موسڵمانان ، بۆ نموونە بنێشت جاوین یان گوڵەبەڕۆژە توکاندن ئەمانە حەڵاڵن بەڵام لە بازاڕدا لایەق نیە و جوان نیە بۆ موسڵمانی سەنگین ئەم کارانە ئەنجام بدات ، بە هەمان شێوە دەست گرتنی خێزانی خۆت لە بازاڕدا ، هەروەها ئەمە لە فەرهەنگی ڕەوشت و ئاکار و ئەدەبی موسڵماناندا بە دی ناکرێت ، بەڵکو دیاردەیەکی دەرەکی و خوازراوە لە کافر و بێباوەڕەکانەوە !

**پ ٩٨ / ئایا دروستە پیاو تەوقە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا بکات ؟**

**وەڵام /**

تەوقەکردنی پیاو لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا حەرامە و بە هیچ شێوەیەك دروست نیە ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودانەی خوارەوە :

**١ ـ عن أُميمةَ بِنت رقَيقةَ (رضي الله عنها) أنها قَالَت : قَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((إني لاَ أُصافح النساءَ))[٢١٤].**

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموويەتی : من تەوقە ناكەم لەگەڵ ئافرەتدا .

**٢ ـ عن عمرو بن شعيبٍ عن أبِيه عن عبد الله بنِ عمرو : ((أن رسولَ الله (ﷺ) كَانَ لاَ يصافح النساءَ في الْبِيعة))[٢١٥].**

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەوقەی نەدەكرد لەگەڵ ئافرەتدا لە كاتی پەيمان وەرگرتنندا .

**٣ ـ عن عائشةَ (رضي الله عنها) قَالَت : ((لاَ والله ما مست يد رسولِ الله (ﷺ) يد امرأة قَط))[٢١٦].**

واتە : سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە هيچ شێوەيەك دەستی بەر دەستی هيچ ئافرەتێك نەكەوتووە .

**٤ ـ عن معقلِ بنِ يسارٍ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((لأَنْ يطْعن في رأْسِ رجلٍ بِمخيط من حديد خير لَه من أَنْ يمس امرأَةً لا تحل لَه))[٢١٧].**

واتە : ئەگەر سوژنێك لە ئاسن بكرێت بە سەری يەكێكتاندا باشترە بۆی لەوەی كە دەستی بەر دەستی ئافرەتێك بكەوێت حەڵاڵ نەبێت بۆی .

**٥** ـ وە لە هەندێك لە ريوايەتەكانی فەرموودەكەی **(أبو هريرةَ)**دا كە سەبارەت بە پێشەكيەكانی زينا هاتووە تێيدا هاتووە : **((... والْيد زناها اللمس ...))[٢١٨].**

واتە : زينای دەست بريتیيە لە دەست پێوەدان .

---

[٢١٤] صحيح سنن النسائي رقم: (٤١٨١) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم: (٥٢٩) .

[٢١٥] مسند الإمام أ د رقم : (٧١٨٦) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم: (٥٣٠) .

[٢١٦] صحيح البخاري رقم : (٥٢٨٨) وصحيح مسلم رقم : (١٨٦٦) .

[٢١٧] صحيح ا امع الصغ رقم: (٥٠٤٥) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٢٦) .

[٢١٨] مسند الإمام أ د رقم : (٨٣٩٢) والسنن الك ى للبيهقي : (١ / ١٢٣) .

کەواتە بە هیچ شێوەیەك دروست نىیە بۆ پیاو کەوا دەست بدات بە دەست یان بە هەر جێگایەك لە لاشەی ئافرەتەوە ئەگەر نامەحرەمی بێت .

*** بە تەنها بوونەوەی ئافرەتێك لەگەڵ سایەقی سەیارەدا :**

**پ٩٩ / ئەگەر سەیارەت پێ بێت ئافرەتێک بە تەنها داوای یارمەتیت لێ بکات دروستە یارمەتی بدەی ؟**

وەڵام /

نەخێر نابێت ، چونکە بە تەنها مانەوە لەگەڵ ئافرەتێکدا لە ناو سەیارەدا حەرامە و بە خەڵوەت لە قەڵەم دەدرێت .

وە پرسیار کراوە لە شێخ **(ابن العثيم )** ڕەحمەتی خوای لێبێت :

**ما حكم ركوب ا رأة مع السائق الأجن ؟**

واتە : ئایا حوکمی سەرکەوتنی ئافرەت لەگەڵ شۆفێرێکی بێگانەدا چیە ؟

ئەویش لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا فەرمووی : **(إنه لا يـجوز للرجل أن ينفرد بـا رأة الأجنبية السيارة إلا أن يكون رماً ا لأن الن (ﷺ) قال : ((لا يخلُون رجلٌ بِامرأة إلا مع ذى محرمٍ))[٢١٩] ، أما إذا كان معه امرأتان فأكثر فلا بأس لأنه لا خلوة حينئذ بشرط أن يكون مأموناً وأن يكون غ سفر وا ا وفق)[٢٢٠].**

بەڕاستی دروست بۆ پیاو بە تەنها بمێنێتەوە لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا لە سەیارەدا ئیللا مەگەر ئەو پیاوە مەحرەمی ئافرەتەکە بێت چونکە پێغەمبەردا **(ﷺ)** فەرموویەتی : با پیاوێك بە تەنها نەمێنێتەوە لەگەڵ ئافرەتێکدا ئیللا مەگەر لەگەڵ مەحرەمی خۆیدا نەبێت ، بەڵام ئەگەر دوو ئافرەتی لەگەڵدا بوو یان زیاتر ئەوا هیچی تێدا

**[٢١٩] صحيح البخاري رقم : (٥٢٣٣) وصحيح مسلم رقم : (٣٢٥٩) .**

**[٢٢٠] فتاوى المـرأة ص : (٨٩) .**

نیە چونکە لەو کاتەدا خەڵوەت و بە تەنها مانەوە نامێنێت بە مەرجێك ئەو پیاوە ئەمین بێت و لە حاڵەتی سەفەردا نەبێت .

*** بانگ دان بە گوێی منداڵدا :**

**پ١٠٠ / من لە دەرەوەی وڵات ژیان بەسەر دەبەم خوای تاک و تەنها دوو کوڕی پێ بەخشیوم یەک دانەیان بانگمان داوە بەگوێیدا بەڵام دووەمیان نەمانداوە دەمەوێت بانگ بدەم بەگوێیدا ، بەڵام بە ئیزنی خوای گەورە ئەگەر ئیوە بتوانن ئەو کارەم بۆ بکەن ، سوپاس بۆ خوای گەورە و خێری ئێوەش بنووسرێ .**

وەڵام /

بـرای بـەڕێز : داواکـارین خـوای گـەورە خـۆت و خێزانـەکت بپارێزێـت و هـەردوو کوڕەکیشتان ساڵح کات ، ئەوەی کە سوننەت بێت بۆ منداڵ ئـەنجام بـدرێت لـە دوای لـە دایك بوونی لە حەوتەمین ڕۆژی لە دایك بوونیدا بریتییە لەم کارانەی خوارەوە :

١ ـ ناو نانی منداڵەکە بە ناوێکی شەرعی و مانادار و خۆش .

٢ ـ گوێزاوانە بۆ کردنی کە بـریتـیـیە لـە سـەربڕینی (شـەکێك یـان کاوڕیـك) ئـەنجام بکرێت بە چێشت و موسڵمانانی بۆ دەعوەت بکرێت لە خزامـان و بـرادەران و دراوسـێیان ... یان بەخشینەوەی بە سەر ئەوانەدا ، ئەگەر نەتوانرا لە حەوتەمین ڕۆژدا بکرێـت ئـەوا دروستە ئەمەیان بخرێتە (١٤)یەمین یان (٢١)مین ڕۆژی لە دایك بوونی .

٣ ـ سەر تاشینی منداڵەکە .

٤ ـ بە ئەندازەی کێشی تووکی سەری منداڵەکە زیو ببەخشیتەوە بە هەژارێك .

٥ ـ خەتەنەکردنی ئەگەر کوڕ بوو .

بەڵام بە نیسبەت بانگ دانەوە بە گوێی منداڵەکـەدا : ئـەوا هـیچ فەرموودەیـەکی ڕاسـت و صەحیح لەم بارەیەوە نەهاتووە ، بۆیە ئەم بانگدانە سوننەت نیە .

*** جەژنی ئافرەتان !**

**پ١٠١ / تکایە جەژنی ئافرەتان لە ئیسلامدا هەیە ؟ بۆمان ڕوون بکەنەوە ئەگەر هەبێت بە بەڵگەوە ؟**

وەڵام /

لە ئیسلامدا تەنها دوو جەژن هەیە کە بریتین لە هەردوو جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان .

یەکەمیان لە دوای تەواو بوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز دێت ، بە هۆی زاڵ بوونی موسڵمانانەوە بە سەر نەفس و شەیتانەوە کە توانیویانە لەو مانگەدا بە ڕۆژوو بن کە پایەیەکە لە پایەکانی ئاینی ئیسلام .

وە دووەمیان لە دوای تەواو بوونی حەجیماڵی خوا دێت لە ڕۆژی دەیەمی مانگی حاجییاندا ، هەروەها موسڵمانان لە هەموو جیهاندا لەو ڕۆژەدا یادەوەری قوربانییەکەی پێغەمبەر ئیبراهیم ـ **علیه السلام** ـ دەکەنەوە بە ئەنجامدانی دروشمی قوربانی کردن .

بۆیە لەو دوو ڕۆژەدا موسڵمانان خۆشی و شادی دەردەبڕن و لە پێش جەژنی یەکەمیانەوە زەکاتی سەر فترە دەبەخشنەوە و لە ڕۆژی جەژنی قوربانیشەوە گۆشتی ئەو حەیوانانەی کە کراون بە قوربانی دەبەخشنەوە هەموو موسڵمانان بە بێ جیاوازی لە نێوان دەوڵەمەند و هەژاردا وەك یەك دڵ خۆش و شادن .

بەڵام ئەوەی کە لە بۆچوونی کافر و بێباوەڕەکاندا بە جەژن دەزانرێت وەك (جەژنی سەریساڵ .. و جەژنی دایك .. و جەژنی منداڵ .. و جەژنی ئافرەتان .. جەژنی کرێکاران .. جەژنی لە دایك بوونی فلان .. و جەژنی سەروەری وڵات .. و جەژنی دامەزراندنی سوپا .. و جەژنی دار .. و جەژنی ئاگر .. و جەژنی دڵداری .. و ... هتد) ئەمانە هەمووی لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا ڕێپێنەدراون و نابێت ئێمەی موسڵمان لاسایی

بێباوەڕەکان بکەینەوە و چاو لەوان بکەین و شوێنی ئەوان بکەوین چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((من تشبه بِقَومٍ فَهو منهم))**[٢٢١].

واتە : هەر کەسێك خۆی بشوبهێنێت بە هەر قەومێکەوە ئەوا ئەویش لە ئەوانە .

وە ئیمامی (عومەر)یش خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی : **(اجتنِبوا أعداءَ الله في عيدهم)**[٢٢٢].

واتە : خۆتان بە دوور بگرن لە دوژمنانی خوا لە جەژنەکانیاندا .

بەڵام بە داخەوە لەم ڕۆژگارەدا دەبینین موسڵمانان لە هەموو شتێکدا لاسایی کافر و بێباوەڕکان دەکەنەوە و بە تایبەتیش لە جەژنەکانیاندا ، ئەمەش ئەو فەرموودەیەمان بیردەخاتەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لَتتبِعن سنن الذين من قَبلكُم شبراً بِشبرٍ وذراعاً بِذراعٍ حتى لَو دخلُوا جحر ضب لَتبِعتموهم ، قُلْنا : يا رسولَ الله الْيهود والنصارى ؟ قَالَ : فَمن ؟!))**[٢٢٣].

واتە : ئێوە شوێنی ڕێچکە و ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون بیست بە بیست و باڵ بە باڵ تا ئەو ئەندازەیەی کەوا ئەگەر ئەوان بچنە ناو کونە بزمژەکێکیشەوە ئێوەش شوێنیان دەکەون و دەچنە ناویەوەوە ، وتمان : ئەی پێغەمبەری : مەبەستت جولەکە و گاورەکانە ؟ فەرمووی : ئەی کێ ؟!

*** ئیشکردنی ئافرەتان :**

**پ ١٠٢ / سەلامی خوتان لێ بێ ، من هەفتەی سێ ڕۆژ ئیش دەکەم ڕۆژی شەش سەعات فریای ئیشی ماڵەوەش دەکەوم بۆ خزمەتی خێزانەکەم ئایا ئەوە حەرامە ؟**

وەڵام /

---

[٢٢١] **صحيح أبـي داود رقم : (٤٠٣١) .**

[٢٢٢] **السنن الكـ ى للبيهقي رقم : (١٩٣٣٤) ،** وە بڕوانە کتێبی : **(اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم) لـشيخ الإسلام ابن تيمية ص : (٢٠٠) .**

[٢٢٣] **مسند الإمام أ د رقم : (١٢١٦٥) وصحيح البخاري رقم : (٧٣٢٠) وصحيح مسلم رقم : () .**

سەرەتا ئەوە بزانە کەوا لە ئیسلامدا پارە دەرکردن و بژێوی پەیدا کردن ئەرکی سەرشانی پیاو نەك ئافرەت ، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ ﴿٣٤﴾﴾ [النساء] .

واتە : پیاوان سەرپەرشتیارن بە سەر ئافرەتانەوە بەوەی کە خوا فەزڵی هەندێکیانی داوە بە سەر هەندێکی تریانەوە .. وە بەوەی کە خەرجی دەکەن بۆیان لە پارە و ماڵەکانیان .

وە پیاوان پرسیاریان کردووە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا مافی خێزانی یەکێك لە ئێمە چیە بە سەریەوە ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی : **((تطْعمهـا إذَا طَعمـت ، وتكْسوها إذَا اكْتسيت))**[٢٢٤].

واتە : خواردنی بۆ دابین بکات ئەگەر پێویستی پێی بوو ، وە جلوبەرگی بۆ دابین بکات ئەگەر داوای کرد .

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿أَسۡكِنُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ سَكَنتُم مِّن وُجۡدِكُمۡ ﴿٦﴾﴾ [الطلاق] .

جێگای نیشتەجێبوونیان بۆ دابین بکەن بەو شێوەیەی کە خۆتان نیشتەجێبوون بە پێی تواناتان .

کەواتە : دابین کردنی خواردن و جلوبەرگ و خانوی نیشتەجێبوون ئەرکی سەر شانی پیاوە نەك ئافرەت .

واتە : ئەگەر ئافرەت مێردی کردبوو ئەوا دەبێت مێردەکەی ئەو پێداویستیەکانی ژیانی بۆ دابین بکات ، وە ئەگەر کچ بوو ئەوا لە سەر باوکێتی ... هتد .

بەڵام ئەگەر ئافرەتێك کەسی نەبوو بژێوی بۆ خۆی و منداڵەکانی پەیدا بکات ئەوا ئەو کاتە پێویستە ئیش بکات بەم مەرجانە :

---

[٢٢٤] مسند الإمام أحمد رقم : (٢٠٥٥٧) وصحيح أبـي داود رقم : (٢١٤٢) .

١ ـ دەبێت ئەو ئیشە نەبێتە ڕێگر لە ئاستی خزمەت کردنی ماڵ و پەروەردەکرنی منداڵەکانیدا .

٢ ـ دەبێت ئیشەکە لە خودی خۆیدا حەڵاڵ بێت .

٣ ـ دەبێت تێکڵاوی پیاوان نەکات لە شوێنی ئیشەکەیدا .

٤ ـ دەبێت بە ئیزن و ڕەزامەندی سەرپەرستیارەکەی بچێتە دەرەوە .

٥ ـ دەبێت بە داپۆشراوی و پۆشتەیەوە بچێتە دەرەوە .

بەڵام بۆ بە دەست خستنی پارەیەکی زیاتر لە پێویست یان بۆ دابین کردنی ژیانی ڕەفاهیەت و کەمالیات ئەوا نابێت ئافرەت بچێتە دەرەوە بۆ ئیش کردن چونکە ئەمە ئەرکی سەر شانی ئافرەتان نیە ، بەڵکو خزمەت کردنی ماڵ و منداڵ لە ئەستۆی ئافرەت دایە و بژێوی پەیدا کردنیش لە ئەستۆی پیاواندایە .

**پ١٠٣ / ئایا سفوری چیە؟**

وەڵام /

سفوری بریتیە لە دەرخستنی جەستەی ئافرەت بە شێوەیەك كەوا رووت بێت و پۆشتە و داپۆشراو نەبێت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((المرأةُ عورةٌ))**[٢٢٥].

واتە : جەستەی ئافرەت عەورەتە .

عەورەتیش دەبێت پۆشتە و داپۆشراو بێت بە پۆشاك و حیجابی شەرعی بەڵام ئەگەر ئافرەتێك هەندێك لە جەستە و لاشەی خۆی نەپۆشی بێت ئەوا بەو ئافرەتە دەگوترێت ئافرەتێکی سفورە واتە رووتە و پۆشتە نیە .

سفوریش ئافرەت مەحروم و قەدەغە دەکات لە چونە ناو بەهەشتەوە و ئەوەندەش دووری دەخاتەوە لە بەهەشت کەوا هەست بە بۆنی بەهەشت نەکات وەك لە فەرموودەیەدا باس کراوە :

---

[٢٢٥] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٨٨) .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((صنفَان من أهلِ النار لَم أرهما : قَــوم معهــم سياطٌ كَأَذْنابِ الْبقَرِ يضربونَ بِها الناس ، ونِساءٌ كَاسيات عارِيــات ، ممــيلاَت مــائلاَت ، رؤُوسهن كَأَسنِمة الْبخت الْمائلة ، لاَ يدخلْن الْجنةَ ولاَ يجِدنَ رِ ها ، وإِن رِ ها لَتوجد مــن مسِ ة كَذَا وكَذَا))**[226].

واتە : دوو چین لە خەڵکی دۆزەخ نەمبینیون : چینێکیان قامچیان پێ یەو وەك کلکی مانگا وایە پێی ئەدەن لە خەڵکی ، وە چینەکەی تریان ئافرەتانێکن جلیان لەبەردایە و ڕوتیشن ، وە لە ڕێگە بە لەنجەو لار دەڕۆن تا سەرنجی پیاوان بۆلای خۆیان ڕابکێشن ، قـژیان ئەبەسـتن و کـۆی دەکەنـەوە لـە سـەر تـەوقی سـەریان وەك کۆپـارەی ووشـتر (البخت)ی لێ دەکەن ، ئا ئەم ئافرەتانـە ناچـنە بەهەشـتەوە و بۆنیـشی ناکـەن ، لەگـەڵ ئـەوەی بـۆنی چـەندەها سـاڵ بـۆنی دەڕوات ، ئـەم فەرموودەیـە هەڕەشـەیەکی ڕوون و ئاشکرای تیایە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە حیجابی شـەرعی ناپۆشـن یـان جلیـان لـە بەردایـە بەڵام ڕووتن واتە یان جلەکانیان کورتە و بەشێك لە ئەندامەکانی لەشی بـەدەر دەکـەوێت یان تەنکە و لاشەی دیارە یان تەسکە ، بێ گومان دیارە تاوانەکە زۆر گەورەیە ئەگەر نا چۆن بە هۆی ئەم تاوانەوە ناچنە بەهەشت بـەڵکو (سـبحان الله) هـەر بـۆنی بەهەشـتیش ناکەن جا لەو هەڕەشە گەورە تر هەیە ؟! پەنا بە خوای گەورە .

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((ثَلاَثَةٌ لاَ تسأَلْ عنهم ـ يع لأنهم من الـهالكـ ـ : رجلٌ فَارق الْجماعةَ وعصى إِمامه ومات عاصياً ، وأَمةٌ أَو عبد أَبق فَمات ، وامرأَةٌ غَاب عنها زوجها قَد كَفَاها مؤنةَ الدنيا فَتبرجت بعده فَلاَ تسأَلْ عنهم))**[227].

واتە : سێ جۆرە کەس هەن سەبارەتیان هیچ پرسیار مەکـەن ـ واتـە : تیاچـوون ـ پیاوێك لە کۆمەڵی موسڵمان دوور بکەوێتەوە سەرپێچی سەرکردەی موسڵمانانی کردبێـت و لە سەر ئەم سەرپێچی یە بمرێت ، وە کۆیلەیەك ڕابکـات لـەژێر دەسـتی خاوەنەکـەی و

---

[226] صحيح مسلم رقم : (٥٥٤٧) .

[227] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٥٤٢) .

نەگەڕێتەوە تا دەمرێت ، و ئافرەتێك پیاوەکەی بڕوات و سەفەر بکات و هەموو پێویستی یەکانی بۆ دابین کردبێ لەگەڵ ئەمەدا بچێت خۆی دەربخات وجوانی خۆی بۆ پیـاوانی نـا مەحرەم بەدەربخات .

هەروەها لەو شتانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بەیعەتی لە ئافرەتان وەردەگرت لەسەری دوورکەوتنەوە بوو لە سفوری و جوانی دەرخستن وەك لە فەرموودەکـەی **(أميمة بِنت رقَيقَة)** هاتووە :

**عن عمرو بن شعيبٍ عن أبِيه عن جده قَالَ جاءَت أُميمةُ بِنت رقَيقَةَ إِلَى رسولِ الله (ﷺ) تبايعه علَى الإِسلاَمِ فَقَالَ : ((أُبايِعك علَى أَنْ لاَ تشركي بِالله شيئاً ، ولاَ تسرقي ، ولاَ تزنِي ، ولاَ تقْتلي ولَدك ، ولاَ تأْتي بِبهتان تفْترِينه بين يديك ورِجلَيك ، ولاَ تنوحي ، ولاَ تبرجِي تبرج الْجاهلية الأُولَى))[٢٢٨].**

واتە : (**أميمة**)ی کچی **(رقَيقَة)** هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئەوەی پەیمان و بەیعـەتی پێبـدات لەسـەر ئیـسلام ، پێغەمبـەریش (ﷺ) فـەرمووی : پـەیمان و بەیعـەتت پێدەدەم لەسەر ئەوەی کە : بە هیچ شتێك هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نەدەی ، وە دزی نەکەی ، وە زینا نەکەی ، وە منداڵەکانی خۆت نەکوژی ، وە بوختیان بۆ کەس هەڵنەبەستی ، وە هـاوار و شـیوەن و ڕۆڕۆ نەکـەی ، وە جـوانی لەشـت بـەدەر نەخـەی بـۆ بێگانـە وەکـو خۆدەرخستنی سەردەمی نەفامی .

---

[٢٢٨] مسند الإمام أ د رقم : (٢٠٥٥٧) وحسنه الإمام الألبانـي " جلباب ا رأة ا سلمة " ص : (١٢١) .

*** خەتەنە کردنی کچان :**

**پ١٠٤ / ئایا خەتەنە کردنی کچان لە شەرعدا رێپێدراوە ؟**

**وەڵام /**

بەڵێ خەتەنە کردنی کچان لە شەرعدا رێپێدراوە ، بەڵکو ئەگەر فەرزیش نەبێت ئەوا سوننەتە ، ئەوەش بە بەڵگەی ئەم دوو فەرموودەیە :

**١ ـ عن أم عطيةَ الأنصارية (رضي الله عنها) أن امرأةً كانت تختن بِالْمدينة فَقَالَ لَها النبي (ﷺ) : ((لاَ تنهكي فَإِن ذَلك أحظَى للْمرأة وأحب إِلَى الْبعل))[٢٢٩] .**

واتە : ئافرتێك هەبوو لە شاری مەدینەدا خەتەنەی دەکرد ، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : لە بنا مەیبڕە و هەمووی لا مەبە چونکە ئەوە بەشی ئافرەتەکەی تێدا دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی کە چێژ و لەزەت وەربگرێت و خۆشەویستتریشە بۆ پیاو .

ئەم فەرموودەیە چەند سوودێکی تێدایە :

١ ـ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) خەتەنەکردنی کچان هەبووە .

٢ ـ پێغەمبەر (ﷺ) بەمەی زانیوە و ڕێگری لێنەکردووە ، کەواتە خەتەنە کردنی کچان شتێکی بە سوودە ئەگینا ڕێگری لێدەکرد .

٣ ـ پێغەمبەر (ﷺ) بەو ئافرەتەی وتوە : **(لاَ تنهكي** : لە بنا مەیبڕە و هەمووی لا مەبە) واتە : زۆر دەستت دامەگرە و مامناوەند کارەکە ئەنجام بدە ، واتە نە با هەمووی بمێنێتەوە وە نە با هەموویشی لابرێت !

ئەمەش لە بەر دوو هۆکار :

---

[٢٢٩] **صحيح أبـي داود رقم : (٥٢٧١) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٢) .**

**تێبینی** : هەرکەسێك شارەزایی زیاتری دەوێت لەم بوارەدا ئەوا با بگەڕێتەوە بۆ ئەم دوو سەرچاوەیە :

**١ ـ سلسلة الأحاديث الصحيحة : ( ٢ / ٣٥٣ ـ ٣٥٨ ) .**

**٢ ـ تمام المـنة التعليق على فقه السنة ص : (٦٧ ـ ٦٩) .**

أ / چونکە مانەوەی بەشێك لەوە مافی ئافرەتەکەی تێدا دەبێت لە تاموچێژ و لەزەت بینین و هەست کردن بە خۆشی (کۆبوونەوەی هەردوولا) لە لایەن ئافرەتەکەوە ، کە ئەمەش حەقێکی ڕەوای خۆیەتی ، بۆیە فەرموویەتی : **(فَإن ذَلك أحظَى للْمرأة)** .

ب / هەروەها مانەوەی بەشێك لەوە مافی پیاوەکەی تێدا دەبێت لە تاموچێژ و لەزەت بینین و هەست کردن بە خۆشی (کۆبوونەوەی هەردوولا) لە لایەن پیاوەکەوە ، کە ئەمەش حەقێکی ڕەوای خۆیەتی ، بۆیە فەرموویەتی : **(وأحب إلَى الْبعل)** .

**٢ ـ عن عائشةَ زوجِ النبي (ﷺ) قالَت : ((إذَا الْتقَى الْختانان فَقَد وجب الْغسلُ))[٢٣٠].**

واتە : ئەگەر هەردوو شوێنی خەتەنەی پیاو و ژن گەیشتن بە یەکتر ئەوا خۆشۆردن (غوسل کردن) واجب دەبێت لەسەر هەردووکیان .

هەروها ئەم فەرموودەیەش چەند سوودێکی تێدایە :

١ ـ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کچانیش خەتەنەکراون هەروەکو چۆن کوڕان خەتەنەکراون .

٢ ـ پێغەمبەر (ﷺ) بەمەی زانیوە و ڕێگری لێنەکردووە ، کەواتە خەتەنە کردنی کچان شتێکی بە سوودە ئەگینا ڕێگری لێدەکرد .

٣ ـ خۆشۆردن (غوسل کردن) لەسەر پیاو و ژن هەردووکیان واجب دەبێت تەنها بەوەی کە شوێنی خەتەنەی هەردووکیان بگەن بە یەکتر ئەگەر چی ئەوایشیان دانەبەزێت .

**پ١٠٥ / من نزیکەی دە ساڵە مێردم کردووە بە هۆی ئەوەی کە سوننەت کراوم تا ئێستا هیچ زەوقێکم لەگەڵ نەبووە نازانم چی بکەم ؟**

وەڵام /

---

[٢٣٠] **صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٦٠٨) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٢٦١) .**

سـەرەتا ئامۆژگاریـت دەکـەین بـە خوێندنـەوەی کتـێبی (ژن و مێـردی ئیـسلامی بەختەوەر ، بە تایبەت بەشی پرسیار و وەڵامەکانی کە دەکەوێتە کۆتایی کتێبەکەوە) .

وە ئامۆژگاری مێردەکەتیش دەکەین بەوەی کە لە پێش جووت بوون یاریت لەگەڵدا بکات و ئارەزووت ببزیونێت تاوەکو دەگەیتـە ئاسـتی چـێژبینین و بـەردەوامیش لەگـەڵتا بمێنێتەوە لە باش دەرچوونی ئاوەکەی خۆی تاوەکو تـۆش هەست بـە چـێژ بکـەیت کـە مافێکی سروشتی خۆتە .

وە ئـەوەش بزانـە کـەوا خـوودی سـوننەت کردنـی ئـافرەت نابێتـە هـۆی لاواز بـوونی ئاسـتی جنـسی ئـافرەت و زیـانی پێناگەیـەنێت ئـەگینا خـوای زانـا و دانـا و دروسـکاری ئافرەت ئەوەی نەدەکرد بە سوننەت بۆیـان ، بـەڵام هۆکارەکـە دەگەڕێتـەوە بۆ ئـەوەی کـەوا هەنـدێك کـچ زۆری لێـدەبڕن و بەشـی لـەزەت و چـێژ وەرگـرتنی بـۆ ناهێڵنـەوە کـە مـافێکی سروشـتی خۆیـەتی ، لـە سـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) ئافرەتێـك هـەبوو خەتەنەی کچانی دەکرد پێغەمبەر (ﷺ) ڕێنمایی کرد و پێی فەرموو : **((لا تنهكي فإن ذلك أحظى للمرأة وأحب إلى البعل))**[231].

واتە : لە بـنا مەیبڕە و هەمووی لا مەبـە [بـە شـێوەیەك کـە هیـچی لـێ نەهێڵێتـەوە] چونکە ئەوە بەشی ئافرەتەکەی تێدا دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی کە چێژ و لەزەت وەربگرێت و خۆشەویستتریشە بۆ مێرد .

لە ریوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إذا خفضت فأشمي ولا تنهكي فإنه أسرى للوجه وأحظى عند الزوج))**[232].

واتە : ئەگەر لێیت بڕی ئەوا ئەوەندەی لێ ببڕە کەوا بەشی ئافرەتەکە و مێردەکەشی تێدا بمێنێتەوە کـە چـێژی لـێوەربگرن و لـە بنـدا مـەیبڕە بـە شـێوەیەك کـە هیـچی لـێ

---

[231] **صحيح أبي داود رقم : (5271) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (22) .**

[232] **السنن الكبرى للبيهقي رقم : (18017) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (722) .**

نەهێڵیتەوە چونکە هێشتنەوەی بەشێك لەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕوومەتی ئافرەتەکە گەشاوە و درەوشاوە بێت و بەشی مێردەکەشی تێدا بمێنێتەوە .

لە فەرموودەیەوە بە هەردوو ڕیوایەتەکەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە دەبێت لە کاتی سوننەتکردنی کچدا زۆری لێنەبڕێت بەڵکو دەبێت هەندێکی لاببرێت و هەندێکی بهێڵرێتەوە بۆ ئەوەی هەم ئافرەتەکە و هەم مێردەکەشی چێژ و لەزەتی لێوەربگرن : **((أحظى للمرأة))** ((**وأحظى عند الزوج**)) .

وە بە مێردەکەتیش بڵێ با ئەم فەرموودەیە پەیڕەو بکات لە کاتی ئەنجامدانی کاری جووتبووندا : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە یەکێك لە هاوەڵانی فەرموو : **((تلاعبها وتلاعبك ، وتضاحكها وتضاحكك))**[٢٣٣].

واتە : یاری بکە لەگەڵ خێزانەکەتدا و با ئەویش یاریت لەگەڵدا بکات و لەگەڵیدا پێبکەنە و ئەویش تۆ پێبکەنێنێت .

## * سوودێك :

لە پاش وەڵامی ئەم دوو پرسیارە سەبارەت بە (**خەتەنە کردن یان سوننەت کردنی کچان**) بە پێویستی دەزانم کەوا لێرەدا هەندێك زانیاری زیاتر باس بکەم لەم بارەیەوە ، چونکە بەڕاستی ئەم باسە هەندە ڕەخنەی لێدەگیرێت لە لایەن نەیار و ناحەز و دوژمن و ناحاڵی بووان لە ئاینی ئیسلام و هەندە گەورەش کراوەتەوە تا ئەو ئاستەی کە بووەتە یەکێك لە باسەکانی ناو هۆڵەکانی پەرلەمان و قسەی سەرزاری هەندێك لە وەزیرەکان و ... هتد !!!

هەموو ئەو هەرا و هۆسیەش کە لەسەر ئەم بابەتە نراوتەوە دوو هۆکاری لە پشتەوەیە :

---

[٢٣٣] **صحيح البخاري رقم : (٥٣٦٧) وصحيح مسلم رقم : (٣٦٢١) .**

١ ـ یان ئەوەیە کە ئەو جۆرە کەسانە نەیار و ناحەز و دوژمنی ئیسلام و ڕێنماییە پیرۆزەکانین ، وە لە هەمان کاتیشدا دەیانەوێت ئافرەتان و گەنجان و کۆمەڵگا بەرەو بەدڕەوشتی و بڵاوبوونەوەی بەدکاری و داوێن پیسی بەرن .

٢ ـ وە یان کەسانێکی نەزانن و نەحاڵین بە ڕێنماییە پیرۆزەکانی ئیسلام لە بارەی (**خەتەنە کردن یان سوننەت کردنی کچان**)ـەوە !

جا بۆ وەڵامی چینی یەکەم ـ کە کەسانی نەیار و ناحەز و دوژمنی ئیسلام و ڕێنماییە پیرۆزەکانین ـ ئێمە گفتوگۆ و قسەمان لەگەڵ ئەواندا نییە چونکە ئەوان بێباوەڕن بە ئیسلام ..

وە بۆ وەڵامی چینی دووەم ـ کە کەسانێکی نەزانن و نەحاڵین بە ڕێنماییە پیرۆزەکانی ئیسلام لەم بارەیەوە ـ ئەوا ئەم زانیارییانە دەخەینە ڕوو بۆیان بەڵکو بەرچاویان ڕووناك و ڕۆشن ببێتەوە و چی تر تفەگ بە تاریکییەوە نەنێن و بێئاگایانە قسە نەکەن لەسەر ئەم بابەتە !

بۆ ئەم مەبەستەش لە پێشدا هەموو ریوایەتەکانی ئەو فەرموودەیە باس دەکەم کە لەم بارەیەوە هاتووە .. ئەنجا ڕاڤە و شیکردنەوە و لێکدانەوە و تێبینی زانایانی ئیسلام لەسەر فەرموودەکە باس دەکەم :

* **ریوایەتەکانی ئەو فەرموودەیەی کە سەبارەت بە** (خەتەنە کردن یان سوننەت کردنی کچان)**ـەوە هاتووە :**

**عن أم عطيةَ الأنصارية (رضي الله عنها) أن امرأةً كانت تختن بِالْمدينة فَقَالَ لَها النبِي (ﷺ) : ((لاَ تنهكي فَإِن ذَلك أحظَى للْمرأة وأَحب إِلَى الْبعل))[٢٣٤].**

واتە : ئافرتێك هەبوو لە شاری مەدینەدا خەتەنەی دەکرد ، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : لە بنا مەیبڕە و هەمووی لا مەبە چونکە ئەوە بەشی ئافرەتەکەی تێدا دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی کە چێژ و لەزەت وەربگرێت و خۆشەویستتریشە بۆ مێرد .

[٢٣٤] صحيح أبـي داود رقم : (٥٢٧١) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٢) .

**و رواية : ((إِذَا حفَضت فَأَشمي ولاَ تنهكي فَإِنــه أَســرى للْوجــه وأَحظَــى عنــد الزوج))[٢٣٥].**

واتە : ئەگەر لێیت بڕی ئەوا ئەوەندەی لێ ببڕە کەوا بەشی ئافرەتەکە و مێردەکەشی تێدا بمێنێتەوە کە چێژی لــێوەربگرن و لـە بنـدا مـەیبڕە بـە شـێوەیەك کـە هیـچی لـێ نەهێڵیتەوە چونکە هێشتنەوەی بەشێك لەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕوومەتی ئافرەتەکە گەشاوەتر و درەوشاوەتر بێت و بەشی مێردەکەشی تێدا بمێنێتەوە .

**و رواية : ((إِذَا حفَضت فَأَشمي ولاَ تنهكي فَإِنه أَحسن للْوجه ، وأَرضى للزوج))[٢٣٦].**

واتــە : ئەگــەر لێیــت بــڕی ئــەوا تــۆزێکی زۆر کــەمی لــێ بــبڕە و لــە بنــدا مــەیبڕە بــە شێوەیەك کە هیچی لێ نەهێڵیتەوە چونکە هێشتنەوەی بەشێك لەوە چاکتر و جوانترە بۆ ڕوومەتی ئافرەتەکە و مێردەکەش زیاتر ڕازی دەکات .

**و رواية : ((اخفضي ولا تنهكي ، فَإِنه أَنضر للْوجه ، وأَحظَى عند الزوج))[٢٣٧].**

**و رواية : ((فَإِنه أَضوأُ للْوجه ، وأَحظَى عند الزوج))**

**و رواية : ((فَإِنه أَنور للْوجه ، وأَحظَى عند الرجل))**

واتــە : لــێی بــبڕە و هــەمووی لا مەبــە و لــە بنــا مــەیبڕە ، چــونکە ئــەوە - واتــە : هێشتنەوەی بەشێك لــەوە - ڕوومــەتی ئافرەتەکــە گەشــاوەتر و درەوشــاوەتر و ڕوونــاکتر دەکاتەوە و بەشی مێردەکەشی تێدا بمێنێتەوە .

**لە هەموو ئەم ڕیواتانەی فەرموودەکە چەند خاڵێکی تێدا بەدی دەکرێت :**

١ - ((**إِذَا حفَضت**)) واتە : ((ئەگەر لێیت بڕی)) .. ((**اخفضي**)) واتە : ((لــێی ببڕە)) . ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە دەبێت بەشێك لە (قیتکە)ی کچ ببڕێت .

---

**[٢٣٥] السنن الكـ ى للبيهقي رقم : (١٨٠١٧) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٧٢٢) .**

**[٢٣٦] صحيح الـجامع الصغـ رقم : (٥٠٨) .**

**[٢٣٧] الـمعجم الكبـ للطـ انـي رقم : (٨٠٦٢) ومستدرك الـحاكم رقم : (٦٢٩٧) وصححه الألبانـي صـحيح الـجامع الصغـ رقم : (٢٣٦) .**

بەڵام ئایا ئەو بەشەی کە لێی دەبڕێت چەندێکە ؟ کەمێك یان تۆزێکی زۆر کەم یان هەمووی ؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش لە خاڵی دووەم و سێیەمدا ئاشکرایە :

٢ ـ ((**فأشمي**)) واتە : ((تۆزێکی زۆر کەمی لێ ببڕە وەك ئەوەی کە بۆنی عەترێك بکەیت)) .

ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە دەبێت تۆزێکی زۆر کەمی لێ ببڕێت ، بە مەبەستی ئەوەی کە ئەو کچە تووشی لادانی جنسی (**الشذوذ الجنسي**) و بەدڕەوشتی (**الانحراف الأخلاقي**) نەیەت .

٣ ـ ((**ولا تنهكي**)) واتە : ((بنە بڕی مەکە و هەمووی لە بندا مەبڕە)) .

ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هەرچەندە پێویستە لە (قیتکە)ی کچ ببڕێت بەڵام نابێت بنەبڕ بکرێت و هەمووی لە بندا ببڕێت و هیچی لێ نەمێنێتەوە بەڵکو دەبێت تۆزێکی زۆر کەمی لێ ببڕێت ، ئەمەش لەبەر چەند سوود و مەبەست و حیکمەتێك کە لە خاڵی چوارەم و پێنجەمدا ئاشکرایە :

٤ ـ ((**فإن ذلك أحظى للمرأة**)) واتە : ((هێشتنەوەی بەشێك لەوە بەشی ئافرەتەکەی تێدا دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی کە چێژ و لەزەت وەربگرێت)) .. ((**فإنه أسرى للوجه**)) واتە : ((هێشتنەوەی بەشێك لەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە روومەتی ئافرەتەکە کراوەتر و گەشاوەتر و درەوشاوەتر بێت)) .. ((**فإنه أحسن للوجه**)) واتە : ((هێشتنەوەی بەشێك لەوە چاکتر و جوانترە بۆ روومەتی ئافرەتەکە)) .. ((**فإنه أنضر للوجه**)) واتە : ((هێشتنەوەی بەشێك لەوە روومەتی ئافرەتەکە گەشاوەتر دەکاتەوە)) .. ((**فإنه أضوأ للوجه**)) واتە : ((هێشتنەوەی بەشێك لەوە روومەتی ئافرەتەکە درەوشاوەتر دەکاتەوە)) .. ((**فإنه أنور للوجه**)) واتە : ((هێشتنەوەی بەشێك لەوە روومەتی ئافرەتەکە ڕووناك تر دەکاتەوە)) .

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خەتەنەکردی کچان [بە مەرجێك تۆزێکی زۆر کەمی لێ ببڕن و لە بندا نەیبڕن] دەبێتە هۆی ئەوەی کەوا کچانی خەتەنەکراو دووی سوودی زۆر ئاشکرای لێببینن :

أ / بەشی ئافرەتەکەی تێدا دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی کە چێژ و لەزەت وەربگرێت لە کاتی جووتبووندا لەگەڵ مێردەکەی .

ب / روومەتیان کراوەتر و گەشاوەتر و درەوشاوەتر و چاکتر و جوانتر و ڕوونـاکتر دەکاتەوە .

بەڕاستی ئەمەیە مکیاجی طەبیعی بۆ ئافرەتان !

٥ ـ ((**وأحـب إلـى البعـل**)) واتـە : ((هێشتنەوەی بەشێك لـە (قیتکـەی ئـافرەت) خۆشەویسترە بـۆ مێـرد)) .. ((**وأحظى عند الـزوج**)) واتـە : ((بەشـی مێردەکەشـی تێـدا دەمێنێتەوە بۆ چێژ و لەزەت لێوەرگرتن ـ لـە کـاتی جووتبوونـدا ـ)) .. ((**وأرضى للزوج**)) واتە : ((مێردەکەش زیاتر ڕازی دەکات)) .

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خەتەنەکردی ئافرەت بە بڕینی تۆزێکی زۆر کەمی و لە بندا نـەبڕینی بە لای مێردەوە خۆشترە و لە کاتی جووتبووندا زیاتر هەست بە چێژ و لەزەت بینین دەکات و زیاتر ڕازی دەکات .

*** ڕاڤە و شیکردنەوە و لێکدانەوە و تێبینی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەو فەرموودەیە :**

**قال السيوطي : ("فأشمي" : لا تأخذي من البظر كثـ اً ، شـبه القطـع اليـسـ بإ ـام الرائحة[٢٣٨] ، "ولا تنهكي" : لا تبالغي استقصاء ـل ا ـتان بالقطع ، "فإنه أسرى للوجه" : ، أصفى للونه وأبقى لنضارته[٢٣٩] .. "فإنه أنضر للوجه" : أي أكثر لـمائه ودمه وأبهج لـ يقه و ـعته ، "وأحظى عند الزوج" : يعنـي أحسن لـجماعها عنده وأحب إليه وأشهى له[٢٤٠]) .**

[٢٣٨] الـجامع الكبـ للسيوطي تـحت الـحديث رقم : (١٨٧٢) .

[٢٣٩] الـجامع الكبـ تـحت الـحديث رقم : (١٨٧٣) .

[٢٤٠] الـجامع الكبـ تـحت الـحديث رقم : (٨٧١) .

واتە : (**أشـمي**) : زۆر لە قیتکەی مـەبڕە ، ئەو لـێبڕینە کەمەی شـوبهاندووە بـە بۆنکردنی بۆنێك* ، (**ولاَ تنهكي**) : زیادەڕەوی مـەکە بـە بـڕینی شـوێنی خەتەنـەکردن لـە بنـدا ، (**فَإنه أسرى للْوجه**) : [چـونکە ئـەوە ـ بـەو شـێوەیە ـ دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـە] ڕوومەتی ئـەو ئافرەتـە ڕەنگەکـەی پـاك و ڕۆشـن بێـت و گەشانەوەکەشـی بـەردەوامتر و درێژخایەنتر بێـت ، .. (**فَإنه أنضر للْوجه**) : [چـونکە ئـەوە ـ بـەو شـێوەیە ـ دەبێتـە هـۆی ئەوەی کە] ڕوومەتی ئەو ئافرەتە ئاو و خوێنی زۆرتر بێت ـ واتە : ڕوومەتی تـەڕ و بەگـڕ دەبێت ـ و درەوشانەوە و شەوق و بریسکەدارتر بێت ، (**وأحظَى عند الزوج**) : واتە بـە لای مێردەکەیـەوە باشـترە و خۆشەویـسترە و خۆشـتر و بـە تـام و چـێژترە بـۆ جووتبـوون لەگەڵیدا .

**وقال ابن منظور : (أشم الـخافضةُ البظْر أخذت منه قليلاً ، و  حديث النـ (ﷺ) أنـه قال لأم عطية : "إذا خفَضت فأ  ي ولا تنهكي ..." ، قوله : "ولا تنهكي" : أي لا تأخذي من البظْر كثـ اً شبه القطع اليسـ  بإ  ام الرائحة ،  والنهك با بالغة فيه أي : اقطعي بعض النواة ولا تستأصليها)[٢٤١] .**

واتـە : ئافرەتـە خەتەنەکارەکـە تـۆزێکی کـەمی لـە قیتکـە لابـرد و بـڕی ، وە لـە فەرموودەکەدا پێغەمبەر (ﷺ) بە (**أم عطية**)ی فەرموو : "ئەگەر لێیـت بـڕی ئـەوا تـۆزێکی کەمی لێ ببڕە و لە بندا مەیبڕە ..." ، فەرمایشتی : "**ولا تنهكي**" : واتە : زۆر لـە قیتکـە مەبڕە ، ئەو لـێبڕینە کەمەی شوبهاندووە بە بۆنکردنی بۆنێك ، وە (**النهك**) بـریتـیـە لـە زیادەڕەوی کردن تێیدا واتە : هەندێك لە قیتکە ببڕە و بنەبڕی مەکە .

**وقال صاحب "عون الـمعبود"   شرح هذا الـحديث : (وفي الْمجمـع : الْختـان : موضع الْقَطْع من ذَكَرِ الْغلَام وفَرج الْجارِية ، وأَما في الْغلَام فَقَطْع جميع الْجِلْد التـي تغطـي الْحشفَة ، وفي الْجارِية قَطْع أَدنى جزء من جِلْدة أَعلَى الْفَرج ...**

---

* مەبەست ئەوەیە : هەندە زۆر کەمی لـێببـڕە کە وەك ئەوەی بۆنێك بدات بە لووتدا .. جا لەو بۆنکردنەدا چەندێکی زۆر کەم لەو بۆنە دەچێت بە لووتدا تۆیش لە کاتی خەتەنەکردنی کچاندا هەندە زۆر کەمی لـێببـڕە .

(٢٤١) **لسان العرب : (١٢ / ٣٢٥) .**

واتە : خەتەنەکردن : بریتی‌یە لەو شوێنەی کە دەبڕێت لە زەکەری کوڕ و دامێنی کچ ، بەڵام لە کوڕدا بریتی‌یە لە بڕینی هەموو ئەو پێستەی کە سەرزەکەر دەپۆشێت ، وە لە کچیشدا بریتی‌یە لە بڕینی نزیکترین بەش لەو پێستەی کە دەکەوێتە سەرەوەی دامێنی ـ کە قیتکەیە ـ .

**"لَا تنهكي" : يقَال : نهكْت الشيء نهكاً بالَغت فيه ... ، وفي النهاية : معنى "لَا تنهكي" : أي لَا تبالغي في استقْصاء الْختان .**

واتە : "لە بنا مەیبڕە" : دەوترێت : شتەکەم گەیاندە بنەکەی واتە : گەیاندمە ئەو پەڕەکەی ... ، وە لە کتێبی (**النهاية**)دا هاتووە : واتای **"لَا تنهكي" :** واتە زیادەڕەوی مەکە لە خەتەنەکردنیدا بەوەی کە بندا بیبڕی .

**وفي النهاية في مادة شمم : وفي حديث أم عطية : "أشمي ولَا تنهكي" شبه الْقَطْع الْيسِير بإشمامِ الرائحة ، والنهك الْمبالَغة فيه ، أي اقْطَعي بعض النواة ولَا تستأصليها ، وفي الْمجمع : الْإشمام أخذ الْيسِير في ختان الْمرأة ، والنهك الْمبالَغة في الْقَطْع ...**

واتە : وە لە کتێبی (**النهاية**)دا هاتووە : وە لە فەرموودەکەی (**أم عطيـة**) هاتووە : **"أشمي ولَا تنهكي"** ئەو لێبڕینە کەمەی شوبهاندووە بە بۆنکردنی بۆنێك ، وە (**النهـك**) بریتی‌یە لە زیادەڕەوی کردن تێیدا ، واتە : هەندێك لە قیتکەی ببڕە و لە بندا مەیبڕە ، وە لە کتێبی (**الْمجمع**)دا هاتووە : (**الْإشـمام**) : لێگرتن و لێبڕینی تۆزێکی کەمە لە خەتەنەکردنی کچاندا ، وە (**النهك**) بریتی‌یە لە زیادەڕەوی کردن لە بڕینیدا ...

**قَالَ الْماوردي : ختا ًا قَطْع جِلْدة تكُون في أعلَى فَرجها فَوق مدخل الذكَر كَـالنواة أو كَعرف الديك ، والْواجِب قَطْع الْجِلْدة الْمستعلية منه دون استئْصاله)[٢٤٢] .**

واتە : خەتەنەکردنی کچان : بریتی‌یە لە بڕینی پێستێك کە دەکەوێتە سەرەوەی دامێنی لە سەرووی شوێنی ڕۆیشتنەژوورەوەی زەکەری پیاوەوەیە وەکو ناووکە خورمایە یان وەکو پۆپەی کڵەشێرە * ، وە ئەوەی کە واجبە

[٢٤٢] عون الـمعبود شرح سنن أبـي داود : () .

بریتـیـیە لە بڕینی ئەو پێستەی سەرەوە لـێ‌ی نەك بنەبڕكردنی .

**وقال ملا علي القاري : ("لا تنهكي" : أي لا تبالغي فطع موضع ا تان بل اتركي بعض ذلك ا وضع ، و "شرح السنة" ويروى : "أشمي ولا تنهكي" فقوله : "ولا تنهكـي" تفـسـ لقوله : "أشمي" : أي لا تستقصي فإن ذلك أي عدم ا بالغة والاستقصاء "أحظى" : أي أنفـع للمرأة "وأحب" : أي ألذ "إ البعل" أي الزوج ، فإنه إذا بولغ ختانـها لا تلتذ هـي ولا هو)[٢٤٣].**

واتـە : **"ولا تنهكي"** : واتـە : زیـادەڕەوی مەکـە لـە بـڕینی شـوێنی خەتەنـەدا بـەڵکو هەندێك لەو شوێنە وازلـێ‌بێنە ، وە لە کتێبی (**شرح السنة**)دا هاتووە : وە بـەم شـێوازەش دەیگێڕنەوە : **"أشمي ولا تنهكي"** جا فەرمایـشتی **"ولا تنهكي"** شـیکردنەوە و لێکدانـەوە و تەفسیرە بۆ فەرمایشتی **"أشمي"** واتە : لە بنـدا مـەیبڕە چـونکە ئـەوە ـ واتـە زیـادەڕەوی نەکردن و لە بندا نەبڕینی ـ **"أحظى"** واتە : بەسوددترە بۆ ئافرەتەکە و **"وأحب"** واتە : بە لەزەت و بەچـێژترە **"إ البعل"** واتـە : بـۆ مێـرد ، چـونکە ئەگـەر زیـادەڕەوی بکرێـت لـە خەتەنەکردیـدا ئـەوا نـــە ئافرەتەکـە و نـــە مێردەکـەش هەسـت بـە لـەزەت و چـێژی جووتبوون ناکەن .

**وقال الـمناوي : ("ولا تنهكي" : لا تبالغي استقصاء ل ا تان بالقطع بل أبقي ذلك بعض ا وضع ... "وأحظى عند الزوج" : ... يعنـي أحسن لـجماعها عنده وأحـب إليـه وأشهى له ، لأن ا افضة إذا استأصلت جلدة ا تان ضعفت شهوة ا رأة فكرهـت ا مـاع فقلت حظوتـها عند حليلها ، كما أنها إذا تركتها الـها فلم تأخذ منـها شـيئا بقيـت غُلمتها* فقد لا تكتفي ماع زوجها فتقع الزنـا ، فأخـذ بعـضها تعـديل للـشهوة والـخلقة)[٢٤٤].**

---

* (**عرف الديك**) : (پۆپەی کەڵەشێر) : گۆشتێکی سووری بڕگەبڕگەیە بەسەری کەڵەشێرەوەیە بڕوانە "فەرهەنگی دەریا" بەرگیە یەکـەم / لاپەڕە : (٧٠٨) .

[٢٤٣] **مرقاة الـمفاتيح شرح مشكاة الـمصابيح : (١٣ / ٢٠٠ ـ ٢٠١) .**

[٢٤٤] **فيض القدير شرح ا امع الصغ : (١ / ٢٧٩) .**

واتە : **"ولا تنهكي"** : واتە : زیادەڕەوی مەکە لە بڕینی شوێنی خەتەنەدا بە لەبندا بڕینی بەڵکو هەندێك لەو شوێنە وازلێبێنە و بیهێڵەرەوە ... **"وأحظى عند الـزوج"** : ... واتە : ئەوە باشترە بۆ جووتبوون لەگەڵیدا بە لای مێردەکەیەوە و خۆشەویستر و خۆشتر و بە تام و چێژتریشە بەلایەوە ، چونکە ئەگەر ئافرەتە خەتەنەکارەکە پێستەی خەتەنەکردن لە بندا ببڕێت و هیچی لێنەهێڵێتەوە ئەوا زەوق و ئارەزووی ئافرەتەکە لاواز دەبێت و بە هۆی ئەوەشەوە حەزی بە جووتبوون نامێنێت و بە هۆی ئەوەشەوە بایەخ و بەهای کەم دەبێتەوە بەلای مێردەکەیەوە ، هەروەها ئەگەر وازیلێبێنێت و وەکو خۆشی بیهێڵێتەوە و هیچی لێ لانەبات ئەوا زەوق و ئارەزووی جووتبوونی دەمێنێتەوە* و لەوانەیە بە جووتبوونی مێردەکەی تەواو نەبێت و بەو هۆیەشەوە بکەوێتە ناو زینا و داوێنپیسیەوە ، لەبەر ئەوە لێگرتن و لێبڕینی هەندێکی ڕێککردنەوەیە بۆ زەوق و ئارەزووی جووتبوون و دیمەن و روخساریش .

**لە پاش ئەو هەموو ڕوونکردنەوەیانەوە :**

بۆمان ئاشکرا دەبێت کە (**خەتەنە کردن یان سوننەت کردنی کچان**) بەو شێوازەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێنمایی پێکردووە نەك هیچ زیان و زەرەری تێدا نییە بەڵکو چەندین سوود و بەرژەوەندیشی تێدایە ، ئەمەش لە چەند ڕوویەکەوە :

١ ـ ڕێککردەنەوەی (**الشهوة** / زەوق و ئارەزووی) کچ و ئافرەت ، چونکە ئەگەر هیچی لێنەبڕن و خەتەنەکرێت ئەوا زوو بە زوو تووشی وروژاندنی ئارەزووی جووتبوون (**الإثارة الـجنسية**) دەبێتەوە ـ چ کچ بێت یاخود ئافرەت ـ ، ئەمەش روبەرووی چەندین تاوانی دەکاتەوە وەك تاوانەکانی (سەیرکردنی کوڕان و پیاوانی نامەحرم ، پەیوەندی کردنی ناشەرعی بە کوڕان و پیاوانی نامەحرم و تووشبوون بە عیشق ، دامرکاندنەوەی ئارەزوو بە دەست ، تووشبوون بە زینا و داوێنپیسی) !

---

* **(غُلْمةُ النساءِ : أي شهوتهن) تاج العروس : (١ / ١٣٤٢) ، وقال ابن دريد : (الغلْمة: شهوة النكاح من الرجـال والنـساء) (٢ / ٤٠) ، وقال ابن منظور : (الغلْمةُ : هيجان شهوة النكاح من ا رأة) لسان العرب : (١٢ / ٤٣٩) والنهاية غريب الـحديث : (٣ / ٧١٨) .**

بە هۆی ئەمەیشەوە بەدڕوشتی و پەیوەندی ناشەرعی و خیانەتی زەوجی و زینا و داوێنپیسی لە ناو کۆمەڵگادا سەرهەڵدەدات و نەوەیەکی داڕوخاو و داماڵیو لە شەرم و ئەخلاق و پاکی پەیدا دەبێت !

ئەمەیش ئامانجی سەرکی ئەو کەسانەیە کە بانگەشە دەکەن بۆ ڕێگرتن لە (**خەتەنە کردن یان سوننەت کردنی کچان**) بە بیانوی ئەوەی کە ئەم کارە پێشێلکردنی مافی ئافرەتانی تێدایە لە رووی جنسیەوە و لە رووی ئازار پێگەیاندنیشیەوە لە کاتی لێبڕینیدا !

تۆ بڵێی ئەو جۆرە کەسانە زیاتر لە خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) داکۆکی لە (مافی ئافرەتان) بکەن و دەستبەرداری بکەن بۆیان !!!

تۆ بڵێی ئەو جۆرە کەسانە زیاتر لە خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) میهرەبانتر و بەزەیی‌تر بن بە ئافرەتان !!!

خوای دروستکار و بەدیهێنەری ئافرەتان کە ناوی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾ە و میهرەبانی و بەزییپێهاتنەوەکەی و زانستی هەموو شتێکی گرتووەتەوە ﴿رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا﴾ خوایەك کە هەموو وردەکارییەکانی دروستکراوەکانی دەزانێت ﴿أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ لە ڕێگەی پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) فەرمانی کردووە بە (**خەتەنە کردن یان سوننەت کردنی کچان**) پێغەمبەرێکیش (ﷺ) کە خوای گەورە لەبارەیەوە فەرموویەتی : ﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨﴾ **[التوبة]** واتە : بەڕاستی پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە لە خوودی خۆتان گرانە لەسەری ئەوەی کە ئێوە ناڕەحەت بکات ، سورە لەسەر هیدایەتدان و ڕزگارکردنتان لە ئاگری دۆزەخ ، نەرمونیانە و بە بەزەییە بەرامبەر بە باوەڕداران ، هەروەها لەبارەیەوە فەرموویەتی : ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾

**الأنبياء]** واتە : تۆمان نەناردووە ئیللا بەوە نەبێت کە بەزەیی و میهرەبانی بێت بۆ هەموو جیهانیان .

هەر ئەم پێغەمبەرە نەرمونیان و بە بەزەیی و میهرەبانە (ﷺ) کە فەرمانی کردووە بە (**خەتەنە کردن یان سوننەت کردنی کچان**) ڕێنمایی دەکات بەوەی کەوا تۆزێکی زۆر کەمی لێ ببڕن و لە بندا نەیبڕن چونکە ئەگەر هەمووی لە بندا ببڕێت و هیچی لێ نەهێڵێتەوە ئەوا زەوق و ئارەزووی ئافرەتەکە لاواز دەبێت و بە هۆی ئەوەشەوە حەزی بە جووتبوون نامێنێت و بە هۆی ئەوەشەوە بایەخ و بەهای کەم دەبێتەوە بەلای مێردەکەیەوە و هەم ئافرەتەکە و هەم مێردەکەش وەکو پێویست چێژ و لەزەت لەیەکتر وەرناگرن کە مافێکی سروشتی هەردووکیانە .

ئەم لێکدانەوە میانڕەوش زۆر بە جوانی بەدی دەکرێت لە شەرح و شیکردنەوەی ئیمامی (**المناوي**) بۆ ئەو فەرموودەیەی کە سەبارەت بە (**خەتەنە کردن یان سوننەت کردنی کچان**) هاتووە : **(أن الخافضة إذا استأصلت جلدة الختان ضعفت شهوةُ المرأة فكرهت الجماع فقلت حظوتها عند حليلها ، كما أنها إذا تركتها بحالها فلم تأخذ منها شيئا بقيت غُلمتها فقد لا تكتفي بجماع زوجها فتقع في الزنا ، فأخذ بعضها تعديل للشهوة والخلقة)** .

٢ ـ هەروەها دیمەن و روخسار و روومەتی کچان و ئافرەتانی خەتەنەکراو جوان و کراوە و ئاودار و تەڕ و گەرم و گوڕ و روناك و گەشاوە و درەوشاوەترە .

٣ ـ ئافرەتی خەتەنەکراو بەو شێوازەی کە ئیسلام ڕێگەی پێداوە بایەخ و بەهای زیاترە بە لای مێردەکەیەوە چونکە ئەوە بۆ جووتبوون لەگەڵیدا باشترە و خۆشەویسترە و خۆشتر و بە تام و چێژترە بە لایەوە .

کەواتە : ئەگەر کچان خەتەنە نەکرێن و هیچیان لێ نەبڕن زیانی تێدایە .. وە ئەگەر هەمووی لە بندا ببڕێت و هیچی لێ نەهێڵێتەوە هەر زیانی تێدایە .. لەبەر ئەمە لێرەیشدا بنەمای (**وخير الأمور أوسطها**) پەیڕەو دەکرێت بەوەی کەوا (کچان خەتەنە بکرێن و

لـێیببڕن بەڵام تۆزێکی زۆر کەمی لـێببڕن و لە بنـدا نـەیبڕن) .. ((**اخْفِـضِي وَلا تُنْهِكِـي**)) واتە : مامناوەندییەت و میانڕەوی تێدا بکرێت نــە نـەکردن و نـــە لـە بنـدا دەرکـردن (**لا تفريط ولا إفراط**) .

وە بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە ئەوا دەتوانیت ئەم دوو کتێبە بخوێنیتەوە :

**١ / القول الـمبـ إثبات مشروعية الـختان للبنات والبنـ والرد على من أنكـر ذلك .. لأبـي الأشبال الزهـ ي .**

**٢ / ختان الإناث بـ علماء الشريعة والأطباء .. للدكتورة مر إبراهيم هندي ، مدرسة الشريعة الإسلامية بكلية دار العلوم امعة القاهرة .**

بەڕاسـتی ئـەم دوو کتێبــە باشــترین و تێروتەسـەلـترین کتـێبن کـە لـەم سـەردەمەدا سەبارەت بە (**خەتەنە کردن یان سوننەت کردنی کچان**) نوسراون .

**پ ١٠٦ / ئـەم پرسـیارە چـەند پرسـیارێکی تایبــەت بــوو . بــە کێـشە و گــرفتی خێزانێکـەوە کـە پرسیارکار نەیویـستوە ئاشکرا بکرێـت . بۆیە ئێمـە تـەنها وەڵامـەکان دەخەینە ڕوو ...**

وەڵام /

وەڵامی نامەکەت بەم شێوەیەی خوارەوەیە :

١ ـ ئەو ژیانە سەختەی کە دایکت لەگەڵ باوکتدا بردویەتە سەر لە ماوەی (٢٧) ساڵدا (**إنْ شاء ا** ) هەمووی دەبێت بە مایەی کـەفارەتی تاوانـەکانی و پلـە بـەرز بونـەوەی لای خوای گەورە .

٢ ـ هاتوچۆ کردنی باوکت بۆ مـاڵی براژنەکـەی بـە بیـانوی ئاگـابوون لـە یەتیمـەکانی برازای بە (شەو و بە ڕۆژ) کارێکی خراپ و تاوان و حەرام بووە ، چونکە پێغەمبەری خـوا

(ﷺ) فەرموویـەتی : **((إياكُم والدخولَ علَى النساءِ ، فَقَالَ رجلٌ من الأنصار : يا رسولَ اللـه أفَرأيت الْحمو ؟ قَالَ : الْحمو الْموت))[٢٤٥].**

واتە : ئامان سەد ئامان نەڕۆنە ژوورەوە بۆ لای ئافرەت ، پیاوێکی ئەنـصاری وتـی : ئەی پێغەمبەری خوا ئـەی ئەگـەر بـرای مێدەکەشـی بێـت ؟ فـەرمووی : مـردن لـە بـرای مێردەکەی باشترە .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : مردن لە برای مێردەکەی باشترە چونکە لـە بـەر ئەوەی کەسوکاری خۆیـەتی کـەم جـار گومانیـان پێـدەبرێت ، وە زۆر جـارێکیش بـەرەو تاوان دەیان بات .

٣ ـ ئەو هاتووچۆ کردنە زۆرەی باوکت وای کردووە بـەینی نێـوان خـۆی و براژنەکـەی بکاتەوە و ووردە ووردە سەر لەوەوە دەربکات کە کردوویەتی !

٤ ـ نانخـواردنی باوکت لە ماڵ براژنـەکـەی و بەجێهێـشتـنی خێزان و ماڵ و منداڵەکەی خۆی پێشێلکردنێکی ئاشکرای مافـی دایکت و ئێوەیە ، ئەمەش دەگەڕێتـەوە بۆ ئەوەی کە باوکت ئێوەی کردووەتە قوربانی حەز و ئارەزووەکانی خۆی لەگەڵ براژنـە بێوەژنەکەیدا کە باوکتی خستبووە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە ، ئەمـەش تاوانـە دەرحـەق بـە دایکتان و ئێوەش !

٥ ـ ڕۆیـشتنی باوکـت لەگـەڵ براژنەکەیـدا بـۆ راتـب وەرگـرتن ، ئـەوەش تـاوانێکی ئاشکرایە چونکە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی : **((ألاَ لاَ يخلُون رجلٌ بِامرأة إلا كَانَ ثَالثَهما الشيطَانُ))[٢٤٦].**

واتـە : وریـت بـن هـیچ پیاوێـك نـیـە بـە تـەنها لەگـەڵ ئافرەتێکدا بمێنێتـەوە ئـیللا سێیەمیان شەیتانە .

---

[٢٤٥] صحيح البخاري رقم : (٥٢٣٢) وصحيح مسلم رقم : () .

[٢٤٦] صحيح سنن الترمذي رقم : (٢١٦٥) .

چۆن دەبێت پیاو و ژنێك كە بۆ یەكتر حەڵاڵ بن بە یەكەوە بڕۆن بۆ جێگایەك ؟!!
كەی خوا ئەمە قەبوڵ دەكات ؟!!!

٦ ـ ڕۆیشتنی باوكت لەگەڵ براژنەكەیدا بۆ سەیران و گەشت و گوزار و ڕابواردن ! ئەمەش تاوانێك و خراپەیەكی تری ئەو بەسەرهاتەیە ! چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ تسافر المرأةُ إلا مع ذي محرمٍ ، ولاَ يدخلُ عليها رجلٌ إلا ومعها محرم))**[٢٤٧].

واتە : با ئافرەت بە تەنها سەفەرە نەكات ئیللا لەگەڵ مەحرەمێكدا نەبێت ، وە با هیچ پیاوێك نەچێتە ژوورەوە بۆ لای ئیللا لەگەڵ مەحرەمێكدا نەبێت .

مەحرەم بەو كەسە دەوترێت كە حرام بێت شووی پێبكات وەك برای خۆی یان برازای یان باوكی ! بەڵام ئایا باوكت بە مەحرەمەوە سەفرەی كردووە بە براژنەكەی یان بە تەنها ؟!!

٧ ـ مانەوەی باوكت لە لای تازە بووكی بێوەژن بۆ ماوەی (٧) حەوت ڕۆژ ! تاوانە و مافی دایكتی پێشێل كردووە و پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) كردووە : **((من السنة إذَا تزوج الرجلُ الْبِكْر على الثيبِ أقَام عندها سبعا وقَسم ، وإذَا تزوج الثيب على الْبِكْرِ أقَام عندها ثَلاثًا ثُم قَسم))**[٢٤٨].

واتە : لە سونەتی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەگەر پیاو كچە عازەو بهێنێت بە سەر ژنەكەیدا ئەوا (٧) حەوت ڕۆژ لە لای دەمێنێتەوە و ئەنجا مانەوەی دابەش دەكات لە نێوانیاندا ، وە ئەگەر بێوەژن بهێنێت بە سەر ژنەكەیدا ئەوا سێ ڕۆژ لە لای دەمێنێتەوە و ئەنجا مانەوەی دابەش دەكات لە نێوانیاندا .

كەواتە سەردان نەكردنی ئێوە لە ماوەی ئەو (٧) حەوت ڕۆژدا تاوانە و مافی ئێوەی پێشێل كردووە ، چونكە لە شەرعدا حەقی سێ ڕۆژی پێدراوە .

---

[٢٤٧] صحيح البخاري رقم : (١٨٦٢) .
[٢٤٨] صحيح البخاري رقم : (٥٢١٤) وصحيح مسلم رقم : () .

٨ ـ جیاوازی کردنی لە نێوان برازاکانی و ئێوەدا کە منداڵی ئەون تاوانە و مافی ئێوەی پێشێل کردووە ! بەڵام ئەمەش هەر لە بەر خاتری تازە بووك بووە !!!

٩ ـ کاتێك باوکتان وتویەتی : (منداڵەکانی براکەم لە ئێوە خۆشتر دەوێ) ! ئەوە تازە بووکی دایکی ئەوانی لە دایکی ئێوە زیاتر خۆشویستووە ! بۆیە ئێوەی دوا خستوە و ئەوانی پێش خستوە !!!

ئایا کەس هەیە منداڵی کەسێکی تری زیاتر خۆشبویت لە جگرگۆشەی خۆی ؟!!

بەڕاستی سەیرە !!!

١٠ ـ ئەو ڕزقەی کە دەری ئەکرد ڕزقی خوا بووە نەك هی ناوچاوی یەتیمەکان !!!

١١ ـ کە دایکت داوای کردووە لە باوکت کەوا سێ ڕۆژ لای دایکت بێت و سێ ڕۆژیش لە لای ژنەکەی تری ، ئەمە داواکاریەکی شەرعی بووە و دایکت داوای ماف و حەقی ڕەوای خۆیی کردووە .

بەڵام کە ژنەکەی تری ڕازی نەبووە بەوە ، ئەو تاوانێکی زۆر گەورە و ترسناکی کردووە !

چۆن دەبێت لە حەفتەیەکدا ڕۆژێك بۆ دایکت و هەموو ڕۆژەکانی تر بۆ ئەو !!! ئایا ئەمە لە چی شەرعێکدا هاتووە ؟!! ئایا ئەو کچی کێیە وا ئەم داواکاریە ناحەق و پڕ لە زوڵم و ستەمەی کردووە ؟!!

١٢ ـ ئایا بۆ چی باوکت ئەو هەموو زوڵمەی لە ئێوە و دایکتان کردووە ؟ ئایا ناترسێت لە ڕۆژی قیامەتدا شانی لار ببێتەوە لە بەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی : **((من كانَ لَه امرأتان يميلُ لإحداهما على الأخرى جاءَ يوم القيامة أحد شـقيه مائلٌ))**[٢٤٩] .

واتە : هەر کەسێك دوو ژنی هەبێت بە لای یەکێکیاندا لابداتەوە لەسەر حیسابی ئەوەکەی تر ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دێت لایەکی کەوتووە بە لادا .

---

[٢٤٩] صحيح سنن النسائي رقم : (٣٩٤٢) .

واتە : شانێکی لار و شۆڕ دەبێتەوە خوا پەنامان بدات لە زوڵم و ستەم .

١٣ ـ ئەگەر باوکتان ئەوەندە پارە نەدات بە دەست دایکتانەوە کە بەشتان بکات بۆ خواردن و جلوبەرگ و چارەسەری نەخۆشی و دابین کردنی پێداویستیەکانی ترتان ئەوا تاوانبار دەبێت .

ئەمە بوو وەڵامی نامەکەت ، کە بە کورتی دەردەکەوێت باوکتان چەندین تاوانی دەرحەق بە خۆی و دایکت و ئێوەش کردووە .

چونکە :

ـ دایکت حەقی هەیە لە سەر باوکت کە لە لای بمێنێتەوە و ڕۆژەکانی مانەوەی دابەش بکات بە سەر هەردوو ژنەکەیدا .

ـ دایکت و ئێوەش حەقتان هەیە کە باوکتان مەسرەف و خەرجی پێویستان بۆ دابین بکات و نابێت کەمتەرخەمی بکات .

ـ دەبێت باوکت تەوبە بکات و هەڵەکانی خۆی ڕاست بکاتەوە و چی تر بەردەوام نەبێت لە سەر زوڵم و ستەم کردن .

وە لە کۆتایدا ئامۆژگاری دایکتان و ئێوەش دەکەم کەوا صەبر و ئارامتان هەبێت و داوا بکەن لە خوا کە هیدایەتی باوکتان بدات و ئیصلاحی بکات .

**وبارك ا فيك ، وجزاك ا خ أ ...**

**وعليكم السلام ور ة ا وبركاته ...**

**پ١٠٧ / لە کاتی چونە سەر جێگا لەگەڵ خێزانم چی بکەم کە هەر خەیاڵم لای خێزانی خۆم بێت نەک کەسانی تر ؟**

وەڵام /

ئەم کارانەی خوارەوە بکە :

١ ـ کاتێك جلەکانت دادەکەنیت بڵێ : **(بسم ا )** ، بۆ ئەوەی جنۆکە سەیری لاشەت نەکات و لێت نزیك نەبنەوە و ئەو جۆرە خەیاڵانەت بۆ دروست نەکەن ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((ستر ما بين أعين الجن وعورات بني آدم إذا وضع أحـدهم ثوبـه أنْ يقُولَ : بِسم الله))**[٢٥٠].

واتە : پەردەی نێوان چاوی جنۆکە و عەورەتی ئادەمیزاد ئەوەیە لە کاتێکدا جلەکانی دادەکەنیت بڵێت : **(بِسم الله)** .

٢ ـ ئەگەر ویستت لەگەڵ خێزانەکەتدا جووت ببیت ئەوا پێش ئەوە بڵێ : **(بِسم الله ، اللهم جنبنا الشيطانَ وجنبِ الشيطانَ ما رزقْتنا) .**

چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لو أن أحدكُم إذا أراد أنْ يأتي أهلَـه فَقَالَ : بِاسم الله ، اللهم جنبنا الشيطانَ وجنبِ الشيطانَ ما رزقْتنا ، فَإِنه إنْ يقَدر بينهما ولَد في ذَلك لَم يضره شيطَانٌ أبداً))**[٢٥١].

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێتە لای خێزانەکەی و بڵێت : (بە ناوی خواوە ، خوایە بە دوورمان گرە لە شەیتان و شەیتان دوور بخەرەوە لەوەی کە پێمان دەبەخشیت) ئەنجا ئەگەر خوا داینابێ کەوا لەو جووت بوونەوە منداڵیان ببێت ئەوا هەرگیز هیچ شەیتانێك زەرەر و زیانی پێناگەیەنێت .

٣ ـ لە خوا بترسە و گوێ بە وەسوەسەی شەیتان مەدە و داوا بکە لە خوا

---

[٢٥٠] الـمعجم الأوسط للط انـي رقم : (٧٠٦٦) وصحيح الـجامع الصغ رقم : (٣٦١٠) .

[٢٥١] صحيح البخاري رقم : (٧٣٩٦) وصحيح مسلم رقم : (٣٦٠٦) .

کە لەو خەیاڵاتە خراپانە پەنات بدات .

٤ ـ سەیری ئافرەتانی تر مەکە (واتە : نەزەر مەکە) بۆ ئەوەی خەیاڵت نەڕوات بۆ لای ئەوان چونکە ئەمە کارێکی حەرامە و تاوانە .

٥ ـ بڵێ بە خێزانت با لە کاتی چونە سەر جێگەدا خۆی بۆت برازێنێتەوە و یاری و قسەی خۆشت بۆ بکات بۆ ئەوەی سەرجی تۆ ڕابکێشێت بۆ لای خۆی و بیروخەیاڵت بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی ئەوەوە بە تەنها .

٦ ـ ئایا پێت چونە ئەگەر لە کاتی چونە سەر جێگەدا خەیاڵی خێزانت بڕوات لای پیاوێکی تر جگە لە تۆ ؟!! ئایا تۆ خۆت بەمە ڕازی دەبی ؟ بێ گومان نەخێر کەواتە با ئیمان و غیرەتت ببنە ڕێگر لەوەی کە تۆش لەو کردارە نابەجێیە ڕزگارت ببێت .

**پ١٠٨ / ئێمە وەک خوێندوومانەتەوە دەستپەڕ حەرامە ، بەڵام ئەگەر ژن و پیاو بە یەکەوە بن ژنەکە نەگاتە حاڵەتی چێژبینین (ئۆرگازم) پیاوەکە بە دەست ژنەکە بگەیەنێتە ئەو حاڵەتە حەرامە یان نا ؟ لەگەڵ ڕێزدا هیوادارم خوای گەورە پاداشتتان بداتەوە .**

وەڵام /

ئەو کارە لە نێوان ژن و مێرد دا دروستە و حەرام نییە چونکە حەڵاڵە بۆ هەر یەك لە ژن و مێرد بە بەکارهێنانی دەستی ئەوی تریان خۆی بگەیەنێتە حاڵەتی چێژبینین بە مەرجێك ئەم کارە زۆر دووبارە نەکرێتەوە چونکە لە ڕووی تەندرووستیەوە زیانی هەیە بۆ ئەندامی جووتبوون .

وە بەم حاڵەتە ناوترێت (دەستپەڕ) چونکە دەستی خۆی بەکار ناهێنێت کە حەرامە ، بەڵام ژن بۆ پیاوەکەی خۆی یان پیاو بۆ ژنەکەی خۆی دروستە و هیچی تێدا نییە ــ بە مەرجێك زۆر ئەنجام نەدرێت چونکە زیانی تێدادەبێت ـ .

**پ١٠٩ / ئایا دروستە لە کاتی عادەدا بە دەستی مێردەکەم خۆم ڕەحەت بکەم و بە هەمان شێوەش بۆ مێردەکەم ؟**

وەڵام /

بـەڵێ ئـەو کـارە بـۆ هـەردووکتان دروسـتـە و هیـچی تێـدا نیـیـە ، بـە بەڵگـەی ئـەم فەرموویە :

**عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قالَ : ((أن اليهود كانوا لا يجلسونَ مع الحائض في بيت ولا يأكُلُونَ ولا يشربونَ ، فَذُكر ذَلك للنبي (ﷺ) فأنزلَ الله : ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ ﴾ [البقرة] ، فَقالَ رسولُ الله (ﷺ) : اصنعوا كُل شيءٍ إلا الجِماع))**[٢٥٢].

واتـە : جولەکـە لەگـەڵ ئـافرەتی بـێ نوێـژدا دانەدەنیـشتن لـە ماڵـدا و خـواردن و خواردنەوەیان لەگەڵیدا نەدەخواردن ، جا ئەمەیان بـاس کـرد بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) خـوای گەورەش ئەم ئایەتی دابەزاند و فەرمووی : ﴿پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بـە ئـافرەت لە کاتی حەیزدا ؟ بڵێ : ئازاری تێدایە بۆیە لە کاتی حەیزدا نزیکی ئـافرەت مەبنـەوە﴾ ، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فـەرمووی : هـەموو شـتێکیان لەگەڵـدا بکـەن تـەنها جووتبـوون نەبێت .

کەواتە دروستە بـە یەکتر ـ بە هەر شێوەیەك بێت ـ خۆیـان ڕەحـەت بکـەن تـەنها بـە جووتبوون نەبێت .

**پ١١٠ / زۆر لـە هاوسـەرەکەم تـووڕە دەبم ، چ بکـەم باشـە ؟ چ لـە ئـەو بکـەم کـە بیگۆڕم ؟ تەبیعەتمان زۆر دوورە لە یەکـ .**

**زۆر جـار لـە خۆمـەوە دڵتـەنگ دەبم و بێـزار دەبم و هەنـدێ جـار دەگاتـە ڕادەی بێزاربوون لە ژیانم ، چ بکەم لەو کاتانەدا ؟**

وەڵامی پرسیاری یەکەم :

---

[٢٥٢] **صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٦٤٤) .**

١ ـ دەستنیشانی ئەو هۆکارانە بکە کە تووڕەت دەکات چ لە خۆتدا بێت یان لە خێزانەکەتدا بێت ، پاش دەستنیشان کردنیان ئەنجا بە پێی توانا خۆتانی لێبپارێزن .

٢ ـ تاوەکو پێت دەکرێت تووڕە مەبە چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لا تغضب))**[٢٥٣] ، واتە : تووڕە مەبە .

٣ ـ وە ئەگەر تووڕە بوویت ئەوا ئەم کارانە ئەنجام بدە بۆ ئەوەی بەرەو هەڵە نەتبات :

ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إذَا غَضب أحدكُم فَقَالَ : أعوذُ بِاللّـه سـكَن غَضبه))**[٢٥٤].

واتە : ئەگەر پیاوێك لە کاتی تووڕەبووندا بڵێت : (**أعـوذ بـا** ) ئەوا تووڕەیەکەی دادەمرکێتەوە .

چونکە تووڕەیی لە شەیتانەوەیە .

ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إذَا غَضب أحدكُم وهو قَائم فَلْيجلس فَإنْ ذَهب عنه الْغضب وإلا فَلْيضطَجِع))**[٢٥٥].

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە تووڕە بوو وە لەو کاتەدا لە سەر پێ ڕاوەستا بوو ئەوا با دابنیشێت ، جا ئەگەر تووڕەیەکەی ڕۆیشت و نەما ئەوا باشە ، ئەگینا بە هەڵابژێت و ڕاکشێت .

ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إذَا غَضب أحدكُم فَلْيسكُت))**[٢٥٦].

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە تووڕە بوو ئەوا با بێدەنگ ببێت .

---

[٢٥٣] **صحيح البخاري رقم : (٦١١٦) .**

[٢٥٤] **صحيح الـجامع الصغ رقم : (٦٩٥) .**

[٢٥٥] **صحيح أ داود رقم : (٤٧٨٢) .**

[٢٥٦] **مسند الإمام أ د رقم : (٢١٧١) وصحيح الـجامع الصغ رقم : (٦٩٣) .**

٤ ـ وە ئەگەر تووڕە بوویت لە هەندێك ڕەفتاری هاوسەرەکەت و هەندێك تەبیعەتیت بە دڵ نەبوو ئەوا ڕقی لیَ هەڵمەگرە بەڵکو چاوپۆشی لیَ بکە ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ يفْرِكْ مؤمن مؤمنةً إنْ كَرِه منها خُلُقاً رضي منها آخر))**[٢٥٧].

واتە : با پیاوی ئیماندار ڕق هەڵنەگرێت لە ئافرەتی ئیماندار ئەگەر ڕەوشتێکی ئەو ئافرەتەی پیَ ناخۆش بوو وە لە هەمان کاتدا ڕازی بوو لە ڕەوشتێکی تری .

٥ ـ وە با لە کاتی تووڕە بوونتدا هاوسەرەکەت هەوڵ بدات هێمنت کاتەوە و ڕازیت بکات ، چونکە ئەمە سیفەتی ئافرەتە بەهشەتیەکانە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((نِساؤكُم من أهلِ الجنة الودود الوَلُود العؤود على زوجِها التي إذَا غَضب جاءَت حتى تضع يدها في يد زوجِها وتقَولَ لاَ أذُوق غَمضاً حتى ترضى))**[٢٥٨].

واتە : ئافرەتە بەهشەتیەکان لە ئێوە ئەوانەن کە : زۆر ڕووخۆش و ڕوومەت کراوەن و زۆر منداڵیان دەبێت و زۆر زوو دەگەڕێنەوە بۆ لای مێردەکانیان ئەوانە کەوا ئەگەر مێردەکەیان تووڕە ببێت دێت بۆ ئەوەی دەستی بخاتە ناو دەستی مێردەکەی و دەڵێت : چاوەکانم خەویان لێناکەوێت

تاوەکو تۆ ڕازی نەبیت .

ئەمانەیە سیفاتی ئافرەتی چاك و صالح .

* وە بە نیسبەت گۆڕینی تەبیعەتی هاوسەرەکەتەوە دەڵێم :

دەبێت هاوسەرەکەت بە پێی توانا هەوڵ بدات بۆ ئەوەی مافە شەرعیەکانی تۆ بدات و گۆڕانکاری بە سەر خۆیدا بێنێت بە مەبەست ڕازی کردنی تۆ ، لە بەر ئەم فەرموودەیە :

---

[٢٥٧] صحيح مسلم رقم : () .

[٢٥٨] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٨٧) .

**عن حصين بن محصن (رضي الله عنه) : ((أن عمةً له أتت النبي (ﷺ) في حاجة فَفَرغَت من حاجتها فَقَالَ لَها : أذَات زوجٍ أنت ؟ قَالَت : نعم ، قَالَ : فَأين أنت منه ؟ قَالَت : ما آلوه إلا ما عجزت عنه ، قَالَ : انظُري أين أنت منه فَإنه جنتك ونارك ؟!))[٢٥٩].**

واته : ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئـەویش پێـی فـەرموو : ئایا تـۆ مێـردت هەیە ؟ ئافرەتەکەش وتی : بەڵێ ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئایا تۆ چۆنیت لەگەڵیدا ؟ وتی : هیچ کەمتەرخەمیەك ناکەن ئیللا ئەوە نەبێت کە لە توانامدا نی‌یە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بڕوانە تۆ چۆنیت لەگەڵیدا چونکە مێردەکەت بەهەشت و دۆزەخی تۆیە .

* وە دەبێت تۆیش بە پێی توانا گۆڕانکاری بە سـەر خۆتـدا بهێنیـت چـونکە ئـەویش مافی بە سەر تۆوە هەیە هەر وەك چۆن تۆ مافت بە سەر ئەوەوە هەیە ، وە ئیصلاحیش بە هەردوو لا دەکرێت .

وە ئـەم ئامۆژگاریـە دەخەمـە بـەر دەسـتی هاوسـەرەکەت بـۆ ئـەوەی سـوودی لێـوە وەربگرێت :

عەمری کوڕی حجر پاشـای کینـدە داخـوازی (**أم أياس بنت عوف بن مسلم الشيبانـي**) کرد ، کاتێ وەختی گواستنەوەی هات دایکی کچەکە بە تەنیا لەگەڵ کەچەکەیدا دانیـشت و چـەند ئامۆژگاری‌یـەکی کـرد ، ئامۆژگاری‌یـەکان بنـەماکانی بەختـەوەری ژیـانی ژن و مێردایەتی و چ پێویستە لەسەر ئافرەت بەرامبەر بە مێردەکەی بیکات بە دیار خست بۆی :

ئامۆژگاری‌یەکان بریتی بوون لـە :

یەکەم و دووەم : بە قەناعەت بە و بە باشی گوێڕایەڵ و فەرمانڕەوای بە .

سـێیەم و چـوارەم : نەکـەی بهێڵـی شـتێکی ناشـیرینت پێـوە ببینێـت ، یـان بـۆنی ناخۆشت لێوە بکات ، بەڵکو با خۆشترین بۆنت هەڵمژێ .

---

[٢٥٩] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٩٣٣) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٣٦١٢) .

پێنجەم و شەشەم : ئاگاداری کاتەکانی خواردن و نوستنی بە ، چونکە برسێتی گڕ لە پیاو بەردەدات ، و تێر خەو نەبوونیش مایەی تورە بوونە .

حەوتەم و هەشتەم : ماڵ و سامانی بپارێزە و چاودێری منداڵەکانی بکە .

نۆیەم و دەیەم : سەرپێچی فەرمانی مەکە ، نهێنی ئاشکرا مەکە ، چونکە ئەگەر سەرپێچی فەرمانی بکەیت یان دڵیت شکاند ، و نهێنییت ئاشکرا کرد : ئەوا غەدر و توڕیی ئەو پارێزراو نابێ .

ئەگەر مێردەکەت غەمبار بوو نەکەی خۆت دڵخۆش و شادمان پیشان بدەیت ، وە ئەگەر دڵخۆش بوو نەکەی خۆت بە غەمبار پیشان بدەیت[٢٦٠].

وەڵامی پرسیاری دووەم :

**ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدە بۆ ئەوەی لە بێزاری و دڵ تەنگی ڕزگارت ببێت :**

١ ـ بەرزکردنەوەی ئاستی ئیمان و کردەوەی چاکە ئەنجام دان ، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ [النحل] .

واتە : هەر کەسێك کردەوەی چاکە بکات لە نێر و مێ و ئیماندار بێت ئەوا ژیانێکی خۆش و بەختەوەری پێ دەدەین لە دونیادا و لە قیامەتیشدا بە باشترین شێوە پاداشتی کردەوەکانیان دەدەینەوە .

٢ ـ پەیوەست بوون و دەست گرتن بە بەرنامەکەی خواوە کە بریتییە لە ئاینی ئیسلامی پیرۆز وەك خۆی ، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ

---

[٢٦٠] بڕوانە کتێبی (ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر) لاپەڕە : (٨٥) .

ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦۚ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ ﴾ [سورة طـه] .

واته : هەر کەسێك شوێنی بەرنامەی خوا بکەوێت ئەوا لە دونیادا سەرگەردان و گومڕا نابێت و لە قیامەتیشدا بەدبەخت و دۆڕاو نابێت ﴿١٢٣﴾ وە هەر کەسێك پشت هەڵبکات لە بەرنامەکەی خوا ئەوا بەڕاستی ژیانێکی پڕ لە بێزاری و ناسۆری هەیە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشری دەکەین ﴿١٢٤﴾ دەڵێت : پەروەردگارم ئەوە بۆ بە کوێری حەشری دەکەیت خۆ من لە دونیادا بینا و چاو ساغ بووم ؟ ﴿١٢٥﴾ خوا دەفەرموێت : ئاوەها ئایەتەکانی ئێمەت بۆ دەهات و تۆیش پشت گوێت دەخست بۆیە تۆیش ئەمڕۆ بێ بایەخ دەکرێیت ﴿١٢٦﴾ وە بەو شێوەیە پاداشتی ئەو کەسە دەدەینەوە لە خراپەکاریدا ڕۆچووە و باوەڕناهێنێت بە ئایەتەکای پەروەردگاری ، وە بەڕاستی سزای دواڕۆژ سەخت تر و بەردەوام ترە .

٣ ـ بەردەوام بوون لە سەر قورئان خوێندن و زیکری خوای گەورە ، چونکە زیکری خوا دەبێتە مایەی ئارامی دڵ وەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ [الرعد] .

واته : ئەوانەی کەوا ئیمانیان هێناوە و دڵین بە زیکری خوا ئارام دەگرێت ، وریا بە تەنها بە زیکری خوا دڵەکان ئارام دەگرێت و بەختەوەر دەبێت .

٤ ـ وە زۆربەی جار ئەم زیکر و دوعایە بخوێنە : **(اللهم إني أعوذُ بِك من الهم والحزن والعجز والكسل والبخل وضلع الدين وغَلَبة الرجال).**

**عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قَالَ : كنْتُ أسمع النبي (ﷺ) يدعو بِهؤلاءِ الكلمات : ((اللهم إني أعوذُ بِك من الهم والحزن والعجز والكسل والبخل وضلع الدين وغَلَبة الرجال))**[٢٦١].

---

[٢٦١] صحيح أبي داود رقم : (١٥٤١) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٣٤٨٤) .

واتە : زۆر جارێك لە پێغەمبەرم (ﷺ) دەبیست کە بەم وتانە دەپاڕایەوە : خوایە پەنات پێدەگرم لە غەم و پەژارە و بێ تاقەتی و بێدەسەڵاتی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و زاڵ بوونی قەرز و زاڵ بوونی ستەمی پیاوان بە سەرمدا .

٥ ـ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((ما أصاب أحداً هم ولا حزنٌ فقال : اللهم إني عبدك ، وابن عبدك ، وابن أمتك ، ناصيتي بيدك ، ماضٍ في حكْمك ، عدلٌ فـي قضاؤك ، أسألك بكُل اسمٍ هو لك ، سميت به نفْسك ، أو علمته أحداً من خلْقك ، أو أنزلتـه في كتابك ، أو استأثرت فـي علْم الغيبِ عندك ، أنْ تجعلَ القُرآنَ ربيع قلْبي ونور صـدري وجلاءَ حزني وذَهاب همي ، إلا أذْهب الله همه وحزنه وأبدلَه مكانه فَرجاً))**[٢٦٢] .

واتە : هەرکەسێك غەم و پەژارە و ناڕەحەتی‌یەکی تووش ببێت و بڵێت :

خوایە من بەندەی تۆم ، و کوڕی پیاوێکم کە بەندەی تۆیە ، و کوڕی ئافرەتێکم کە بەندەی تۆیە ، پێشەسەرم لە دەستی تۆدایە ، حوکمی تۆ بەسەرمدا پەیڕەوکراوە ، بڕیاری تۆ بەسەرمدا ڕاست و دادپەروەرانەیە ، داوات لێدەکەم بە هەموو ناوێك کە ناوی خۆتت پێناوە ، یان فێری کەسێکت کردووە لە دروستکراوەکانت ، یان داتبەزاندووە لە کتێبەکەتدا ، یان تایبەتت کردووە بە خۆتەوە لە زانستی غەیبدا لای خۆت ، کەوا قورئان بکەیت بە بەهاری دڵم و ڕووناکی سێنگم و هەڵگری پەژارەم و لابەری غەمم .

ئیللا خوا غەم و پەژارەی لادەبات و لە جێی ئەوەدا دەیگۆڕێتەوە بە دڵ فراوانی .

٦ ـ پرسیار کراوە لە ئیمامی (**الحسن البصري**) و وتویانە : **(ما لنا نراك مطمئناً)** ؟

واتە : ئەوە چی بەردەوام دەتبینین بەختەوەریت و بێ تاقەت و بێزار نیت ؟

ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی : **(علمت أن رزقي لا يأخذه غيري فاطمئن له قلبي ، وعلمت أن الله مطلع علي فاستحييت أنْ يراني على ذنبٍ ، وعلمت أن عملي لا يقوم به غيري فاشتغلت به وحدي ، وعلمت أن الموت ينتظرني فاستعددت لما بعده)** .

---

[٢٦٢] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٩٩) .

واتە : بەڕاستی دەزانم کەوا رزق و ڕۆزیم کەسێکی تر نایبات جگە لە من بۆیە دڵم بۆی ئارامی گرتووە ، وە بەڕاستی دەزانم کەوا خوا ئاگای لێمە بۆیە شەرمی لێدەکەم بە سەر تاوانەوە بمبینێت ، وە بەڕاستی دەزانم کەوا کردەوەکانم کەسێکی تر نایانکات بۆم منیش خۆم پێیەوە سەرقاڵ و مەشغوڵ کردووە ، ، وە بەڕاستی دەزانم کەوا مردن چاوەڕوانمە منیش خۆم ئامادە دەکەم بۆ دوای مردن .

بەڕاستی ئەوەیە ڕێگاکانی بەختەوەری و ئاسوودەیی .

**پ ١١١ / من لە دوای چەند مانگێک لە شووکردنم لە مێردەکەم جیابوومەوە چونکە زانیم کە لەگەڵ ئافرەتی تردایە و ئەچێت بۆ شوێنی تر و زۆر شتی خراپ و نابەجێ و ناشەرعی ، بۆیە کە دڵنیا بووم لەگەڵی بمێنمەوە ئەوا خۆم و دینەکەم و شەرەفم لە دەست ئەدەم بۆیە جیابوومەوە پێش چەند مانگێک ، ئەو کاتە سکم نەگەشتوە چل ڕۆژ بێ پرسی ئەو منداڵەکەم لەبار برد ، هەندێک جار زۆر هەست بە تاوان دەکەم ، ئایا تاوانم کردووە بێ پرسی ئەو ئەو کارەم کردوە ؟**

وەڵام /

لەبار بردنی منداڵ تاوانە و دروست نیيە ، وە ئەگەر ڕۆحی بە بەردا کرابێت ئەوا دەبێتە کوشتن (قەتل) کە یەکێکە لە تاوانە گەورەکان ، وە زانایانی ئیسلام جیاوازییان تێدایە سەبارەت بە کاتی (ڕۆح بە بەراکردنی منداڵ) ئایا لە (٤٠) چل ڕۆژەی پەیدابوونیيەوە دەبێت یان لە (١٢٠) ڕۆژەوە واتە لە چوار مانگانەوە دەبێت ، جا ئەو حاڵەتەی تۆ پێی تاوانبار دەبی بەڵام بە کوشتن (قەتل) حیساب ناکرێت **(إن شـاء ا )** چونکە پێش چل ڕۆژ بووە ، بۆیە پێویستە لە سەرت تەوبە بکەیت و داوای لێبووردن لە خوا بکەیت و پەیشمان ببیتەوە لەو کارەت .

ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە تۆ بە بێ پرسی (مێردەکەت) منداڵەکەت لە بار بردووە ئەمەش تاوانە چونکە ئەو منداڵە حەقی ئەویشی تێدا هەبووە لە بەر ئەوەی

بەشێکی هی ئەویش بووە ، بەڵام ئەم تاوانەش بە تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوە و بەخۆداچوونەوە خوا لێت خۆش دەبێت **(إن شاء ا )** .

بەڵام بە پێویستی دەزانم کەوا هەندێك شتت بۆ ڕوون بکەمەوە :

١ ـ پێویستە لە سەر ئافرەت و (هەروەها لە سەر سەرپەرشتیارەکەشی بە تایبەت لە باوك و برا و کەسوکاری) کەوا پێش ئەوەی شووبکات و بە شووبدرێت بیربکاتەوە و پرسیار بکات و بکەن : ئایا ئەو کوڕەکەی کە هاتووەتە خوازبێنی ئەو کچە کێیە ؟ وە ئایا دین و ئەخلاق و ڕەوشتی چۆنە ؟

بەڕاستی نابێت نە کچەکە خۆی و نە سەرپەرشتیارەکەشی زوو بە زوو بڕیارێکی سەرپێیانە بدەن و پێش تێڕوانین و پرسیار کردن و هەڵسەنگاندنی کوڕی خوازبێنیکار ئەو بڕیارە ترسناکە بدەن ، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی : **((إذَا خطَب إلَيكُم من ترضونَ دينه وخلُقَه فَزوجوه إلا تفْعلُوا تكُـن فتنـةٌ فـي الأرض وفَـساد عريض))**[٢٦٣].

واتە : ئەگەر کەسێك خوازبێنی کچی لێتان کرد کە ئێوە لە دین و ئەخلاق و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا ژنی بدەنێ ، وە ئەگەر ئەمەتان نەکرد ئەوا لە سەر زەویدا فیتنە و گەندەڵکاری‌یەکی بەرفراوان ڕوودەدات .

لە ڕوانگەی ئەم فەرموودەیەوە ئاشکرا دەبێت تۆ هەر لە سەرەتاوە هەڵەت کردووە لە شووکردنت بەو کوڕەی کە خۆت دەڵێیت : (چونکە زانیم کە لەگەڵ ئافرەتی تردایە و ئەچێت بۆ شوێنی تر و زۆر شتی خراپ و نابەجێ و ناشەرعی ، بۆیە کە دڵنیا بووم لەگەڵی بمێنمەوە ئەوا خۆم و دینەکەم و شەرەفم لە دەست ئەدەم) !!!

٢ ـ بەڕاستی زۆر چاکت کردووە کەوا زوو فریای خۆت کەوتوویت و لێی جیابوویتەتەوە بە مەبەستی ئەوەی (خۆت و دینەکەت و شەرەفت لە دەست نەدەیت) ،

---

[٢٦٣] **صحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٨٤) .**

ئەمەش بەڵگەیە لە سەر لە خوا ترسان و خۆپارێزیت لەوەی کە زیان بە دین و شەرەفت دەگەیەنێت .. جا ئەمە نیشانەی ئیمان و ڕەوشـــت بەرزی و ئەدەب و شەرم و حەیا و حیشمەتە ..

چونکە بەڕاستی هاوەڵێتی کردن و هاوسەرێتی و خێزانداریێتی لەگەڵ کەسێکی بێ دین و ڕەوشت خراپدا ووردە ووردە دین و ئەخلاقت پێناهێڵێت و ژیانی دونیا و دینت دەسوتێنێت ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی : **((المرءُ علی دینِ خلیله فَلْینظُر أحدکُم من یخاللُ ؟))**[٢٦٤].

واتە : مرۆڤ لە سەر دینی برادەرەکەیەتی ، جا با یەکێك لە ئێوە بڕوانێت بۆ ئەوەی بزانێت برادەرێتی و تێکەڵی کێ دەکات ؟

ئەمە بە نیسبەت برادەرەوە ، کەواتە هاوسەر لە پێش ترە !

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی : **((لاَ تصاحب إلا مؤمناً ، ولاَ یأکُلْ طَعامك إلا تقي))**[٢٦٥].

واتە : هاوەڵێتی ئیماندار نەبێت نەیکەیت ، وە با کەس خواردنت نەخوات ئیللا کەسێکی لە خوا ترس و خۆپارێز لە تاوان نەبێت .

٣ ـ لە ئسلوبی نووسینی پرسیارەکەتەوە وا تێدەگەم کەوا تۆ لەوڵاتی کافر و بێباوەڕەکاندا دەژیت ! بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم بە گەڕانەوە بۆ وڵاتی موسڵمانان و بە جێهێشتنی وڵاتی بێباوەڕان ، چونکە مانەوە و نیشتەجێبوون (**إقامة**) لە وڵاتی کافران حەرامە و یەکێکە لە تاوانە گەورەکان (**الکبائر**) بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەموویەتی : **((أنا بريءٌ من کُل مسلمٍ یقیم بین أظْهر المشرک ، قَالُوا : یا رسولَ الله لم ؟ قَالَ : لا تراءَی ناراهما))**[٢٦٦].

---

[٢٦٤] مسند الإمام أ د رقم : (٨٦٤١) واللفظ له وصحیح سنن الترمذي رقم : (٢٣٧٨) وصحیح سنن أبـي داود رقم : (٤٨٣٣) .

[٢٦٥] صحیح أ داود رقم : (٤٨٣٢) .

[٢٦٦] صحیح أبـي داود رقم : (٢٦٤٥) .

واتە : من بەریم لەو موسڵمانەی کەوا نیشتەجێدەبێت (إقامە دەکات) لە نێوەنی بێباوەڕ و موشریکەکاندا ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا بۆ چی ؟ فەرمووی : نابێت ئاگری یەکتر ببینن .

داواکارم خوای گەورە لە هەموو خراپەیەك بتپارێزێت لە دونیا و قیامەتدا .. وە داواکارم خوا لە هەموو تاوانەکانت خۆش ببێت و دامەزراوت کات لە سەر دین داری و ڕەوشت بەرزی و شەرەف پارێزی .. وە داواکارم خوای گەورە مێردێکی صاڵح و لە خوا ترس و چاکەکار و ڕەوشت بەرز و بە خەلاق بکات بە قیسمەتت کەوا پارێزگاری بکات لە (خۆی و خۆت و دینەکەی و دینەکەت) وە شەرەفی هەردوولاتان بپارێزێت .. **اللهم آمـ** .

**پ ١١٢ / ئایا لابردنی مووی ڕوومەت بۆ پیاو و بۆ ژن دروستە ؟**

وەڵام /

لابردنـی مـووی رومـەت بـۆ پیـاو و بـۆ ژن قەدەغـەکراو و حەرامـە چـونکە ئەمـەش بەشێکە لە **(النمص)** کەوا لەعنەتی لە سەر هاتووە :

**عن عبد الله بن مسعود (رضي الله عنه) قالَ : قالَ رسولُ الله (ﷺ) : ((لعـن اللـه الواشـمات والمستوشمات ، [والواصلات] والنامصات والمتنمصات ، والمتفلجات للحسن المغيـرات خلق الله))[٢٦٧].**

واتە : لەعنەی خوا لەوانەی کە خاڵ دەکوتن و ئەوانەش کە بۆیـان دەکوترێـت ، وە ئەوانەش کەوا شت دەدەنە دەم پرچیانەوە (چ پرچی ڕاستی بێت یان دروست کراو بێت ـ صناعی ـ یان خوری و پەڕۆ بێت) ، وە ئەوانـەش کـەوا مـووی ڕوومـەت (بـرۆش بەشـێکە لێـی) لادەبـەن و ئەوانـەش کـە بۆیـان لادەبرێـت ، وە ئەوانـەش کـەوا دانـەکانیان شـاش دەکەن بۆ جوانی و شێوەی دروسکراوەکانی خوا دەگۆڕن .

شێخ **(ابن العثیم )** ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویـەتی : **(نتف الشيب إما من اللحية أو شعر الوجه فإنه حرام لأن هذا من النمص، فإن النمص نتف شعر الوجه واللحية منه ، وقد ثبت عن النبي (ﷺ) أنه لعن النامصة وا تنمصة)[٢٦٨].**

واتە : لابردنی مـووی سـپی لـە ڕیش یـان مـووی ڕوومـەت حەرامـە چـونکە ئەمـەش بەشێکە لـە (**النمص**) ، چـونکە (**النمص**) بریتیـیـە لـە لابردنـی مـووی ڕوومـەت و ڕیـشیش بەشێکە لە مووی ڕوومـەت ، وە ئـەوەش سـەلمێنراوە لـە پێغەمبـەرەوە کـەوا لەعنـەتی کردووە لەوانەی کەوا مووی ڕوومەتیان لادەبەن و ئەوانەش کە بۆیان لادەبەن .

وە شێخ **(الألبانـي)**ش ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی :

---

[٢٦٧] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٧٩٢) .

[٢٦٨] موع فتاوى الشيخ ابن العثيم : (١١ / ) .

**(لعن رسول ا (ﷺ) النامصة ـ وهي ال تنتف شعر حاجبيها أو غ ها بقصد التجميل ـ وعلل ذلك بأنه تغي لـخلق ا تعا ، والذي لق لـحيته إنما يفعل ذلك للحـسن - زعم - وهو ذلك يغ خلقة ا تعا فهو حكم النامـصة تـماما ولا فـرق إلا اللفظ)[٢٦٩].**

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعنەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کەوا مووی ڕوومەتیان لادەبەن ـ کە بریتی‌یە لەو ئافرەتەی کەوا مووی هەردوو بڕۆی یان جگە لە بڕۆشی لادەبات بە مەبەستی خۆ ڕازاندنەوە و خۆ جوان کردنەوە ـ وە هۆکاری ئەمەشی گەڕاندووەتەوە بۆ ئەوەی کەوا ئەمە گۆڕینی دروستکراوەکانی خوای گەورەیە ، وە ئەو پیاوەی کەوا ڕیشی دەتاشێت بۆیە ئەمە دەکات بۆ ئەوەی جوان بێتەوە ـ بە بۆچوونی هەڵەی خۆی ـ ئەویش لەم کارەیدا دروسکراوی خوای گەورە دەگۆڕێت ، وە ئەوەش دەچێتە ژێر حوکمی ئەو کەسەوە کەوا مووی ڕوومەتی لادەبات (**النامصة**) بە تەواوی و هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یە لە نێوانیاندا ئیللا لە لەفزەکەدا نەبێت .

**پ١١٣ / قرتاندن بە مەقەست نەک بڕۆکردن حەرامە ؟ لابردنی مووی دەموچاو ڕوومەت حەرامە ؟**

**وەڵام /**

دەستکاری کردنی برۆ بە هەموو شێوەیەك قەدەغە کراو و حەرامە ، چ بە لابردنی بێت یان بە هەڵکەندنی بێت بە مووکێش یان بە باریککردنەوەی بێت یان بە قرتاندنی بێت بە مەقەص یان بە هەر کەرەستەیەکی تر بێت هەر حەرامە ، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لعن الله الواشمات والمستوشمات ، [والواصلات] والنامصات والمتنمصات ، والمتفلجات للحسن المغيرات خلق الله))[٢٧٠].**

---

[٢٦٩] **تـمام المـنة ص : (٨٢) .**

[٢٧٠] **سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٧٩٢) .**

واتە : لەعنەی خوا لەوانەی کە خاڵ دەکوتن و ئەوانەش کـە بۆیـان دەکوترێـت ، وە ئەوانەش کەوا شت دەدەنە دەم پرچیانەوە (چ پرچی ڕاستی بێت یان دروست کراو بێت - صناعی - یان خوری و پەڕۆ بێت) ، وە ئەوانـەش کـەوا مـووی ڕوومـەت (بـرۆش بەشـێکە لێـی) لادەبـەن و ئەوانـەش کـە بۆیـان لادەبرێـت ، وە ئەوانـەش کـەوا دانـەکانیان شـاش دەکەن بۆ جوانی و شێوەی دروسکراوەکانی خوا دەگۆڕن .

کەواتە دەستکاری کردنی برۆ بە هەموو شێوەیەك قەدەغـە کـراو و حەرامـە ، بـەڵکو یەکێکە لە تاوانە گەورەکان (الکبائر) چونکە لەعنەتی لە سەر هاتووە .

**پ١١٤ / ئەگـەر کەسێ لەبـەر سک پڕی توانـای نوێـژکردنی نـەبێ ئـەوە تاچـەند گوناهە؟ بۆ نموونە من پێشتر نوێژم کردووە بەڵام ئێستا سکم حەوت مانگانە توانام نی‌یە وەک پێویست نوێژەکانم بکەم و بەڕێک وپێکی بەڕێوەیان بەرم ئەمە تا چەند گوناحە وە من دەبێ چی بکەم لەمحاڵەتەدا ؟ زۆرسوپاس بۆ وەڵام دانەوەتان .**

وەڵام /

سـکپڕی یـان بـوونی حـەمل بـە هـیچ شـێوەیەك نابێتـە ڕێگـر لـە ئەنجامـدانی نوێـژە فەرزەکان ، بەڵام بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە ئایا بۆ سکپڕی وای لێتکردووە کە نەتوانی نوێژەکانت وەك پێویست بکەیت ؟! ئایا هەزاران بەڵکو ملیونــەها ئافرەتی موسڵمان بـە درێــژای سەدها ساڵە بۆ سکــپڕی ڕێی نوێژی
لێنەگرتوون ؟!

وە ئەگەر مەبەست ئەوە بێ کـە لـە کـاتی نوێـژدا ناتوانیـت بـە پێـوە بوەسـتی ئـەوا دەتوانیت بە دانیشتەوە نوێژەکەت بکەیت وە ئەگـەر بـە دانیـشتنەوە نـەتتوانی ئـەوا بـە هەڵاژیانەوە بیکە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((صل قَائماً ، فَإنْ لَم تستطع فَقَاعداً ، فَإنْ لَم تستطع فَعلَى جنبٍ))**[٢٧١].

---

[٢٧١] **صحيح البخاري رقم : (١١١٧) .**

واتە : بە پێوە نوێژ بکە ئەگەر نتتوانی ئەوا بە دانیشتنەوە وە ئەگەر نەتتوانی ئەوا بە سەر لادا بیکە .

وە ئەگەر لە کاتی رکوع و سوجدەدا ناتوانیت زۆر بوەستیت ئەوا تەنها یەك جار (**سبحان ربـي العظيم**) و (**سبحان ربـي الأعلى**) بڵێ .

**پ ١١٥ / من تەنها لە کاتی نوێژدا لەچک دەکەم بەڵام کاتێک دەچم بۆ بازاڕ و شوێنانی تر لەچک ناکەم ئایا نوێژەکەم قەبوڵە ؟**

وەڵام /

خوشکی موسڵمانم :

لەچك نەکردنت لە کاتی دەرچوونتدا بۆ بازاڕ و پێش چاوی نامەحرەم کارێکی حەرامە و تاوانێکی گەورەیە و پێچەوانەکردنی ئەم بەڵگانەیە :

- خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ... وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ **[النـــور]** .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێ بە ئافرەتانی ئیماندار چاویان بنوقێنن لە نامەحرەم و دامێنیان بپارێزن و جوانی خوایان دەرنەخەن تەنها روومەت و هەردوو لەپیان نەبێت و با سەرپۆشەکانیان (لەچکەکانیان) ڕاخەن بە سەر گەردنیاندا و جوانی خوایان دەرنەخەن ... وە با پێیان نەدەن بە زەویدا بۆ ئاشکراکردنی جوانیـیە شاراوەکانیان ، وە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا هەمووتان ئەی باوەڕداران بۆ ئەوەی سەرفراز و بەختەوەر بن .

- پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((**صنفَان من أهلِ النارِ لَم أرهما : قَـوم معهـم سياطٌ كأذْنابِ الْبقَر يضربونَ بِها الناس ، ونِساءٌ كاسيات عاريـات ، ممـيلات مـائلات ،**

**رؤوسهن كأسنِمة البخت المائلة ، لا يدخلن الجنةَ ولا يجِدنَ ر ها ، وإن ر ها لتوجد م ـن مسِ ة كذَا وكذَا))[٢٧٢].**

واتــه : دوو بــەش لــە ئــەهلی دۆزەخ هــەن مــن نایــانبینم : ... ئافرەتانێـك جليـان لەبەردایە و ڕوتیشن بەلارولەنجەوە ڕێدەکەن و سەرەنجی پیاوان ڕادەکێشن بۆ خۆیـان و سەریان وەك سەر پشتی ووشـتر وایـە (قـژیانی لـە سـەر کۆدەکەنـەوە) ، ئـەو ئافرەتانـە ناشنە ناو بەهەشتەوە و بۆنیشی ناکەن ...

مەبەست بە (کاسیات عاریـات) ئەوەیـە کـە ئافرەتێـك جلـی لەبەردایـە بـەڵام هـەموو لاشەی نەپۆشیوە بۆ نموونە جلێکی تەنك لەبەر بکات کە لەشی لێیەوە دیارە یان جلێکی کورت بێت کە بەشـێك لـە لاشـەی بـەدەر دەکـەوێت وەك سـەر و مـل و گـەردن و قـۆڵ و قاچەکانی ، ئەمانەش لەو کەسانەن کـە ناچـنە بەهـشتەوە و بـۆنی بەهەشـتیش ناکـەن ، مەگەر دوای تۆبە کردن .

کەواتە دەبێت تەوبە بکەیت و پەشیمان ببیتەوە لەو تاوانە و هەموو تاوانەکانت .

وە بە نیسبەت نویژەکەتەوە ؟ بـەڵێ نوێژەکـەت (**إن شـاء ا** ) قەبوڵـە ، بـەڵام ئـەو چاکانەی کە بە هـۆی نوێژەکەتـەوە دەسـتت دەکـەوێت و لـە بەرامبەریـدا تـاوانی لەچـك نەکردنت بایەخەکەی ناهێڵێت ، وە دەبێت نوێژ کردنەکـەت تـەنها جووڵـەی لاشـە نـەبێت بەڵکو دەبێت نوێژێکی زیندوو و کاریگەر بێت و ڕێگـری تاوانـت لـیَ بکـات چـونکە خـوای گەورە فەرموویـەتی : ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ ۝٤٥﴾ **[العنكبوت] .**

واتە : نوێژ بە ڕێکوپێکی ئەنجام بدە ، وە بەڕاستی نوێژ ڕێگری دەکـات لـە خراپـە و تـاوان .

---

[٢٧٢] **صحيح مسلم رقم : (٧١٢٣) .**

**پ ١١٦ / سڵاوی خوای گەورەتان لێ بێ بەڕێزان خوای گەورە عیلم و زانیاریتان پێ ببەخشێت بۆ خزمەتکردنی دینی ئیسلام ، برا گیان من هاوسەرێکم بۆ خۆم هەڵبژاردووە لە خوا بە زیاد بێت نوێژ دەکات و قورئان دەخوێنێ بەڵام لەچک ناکات وە جل و بەرگی کورتیش لەبەر ناکات منیش ڕازی بووم بەوەی کەی قەناعەتت بۆ دروست بوو بیکەیت ئەویش وەعدی داوە ، ئایا من غەڵتم نەکردووە لە ڕازی بوونم لەسەر ئەو مەرجە چونکە من لەم ئاراستەیە سەیرم کرد کە نوێژ بکات إن شاء الله خوای گەورە هیدایەتی ئەدات بۆ لەچکەکەش ، برایان ئایا لای خوا گوناهبارم یان نا بۆ ئەم کارە کە کردوومە ؟**

وەڵام /

لەچك نەکردن لە کاتی دەرچووندا بۆ بازاڕ و پێش چاوی نامەحرەم کارێکی حەرامە و تاوانێکی گەورەیە و پێچەوانەکردنی ئەم بەڵگانەیە :

ـ خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ... وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ [النـور] .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێ بە ئافرەتانی ئیماندار چاویان بنوقێنن لە نامەحرەم و دامێنیان بپارێزن و جوانی خوایان دەرنەخەن تەنها روومەت و هەردوو لەپیان نەبێت و با سەرپۆشەکانیان (لەچکەکانیان) ڕاخەن بە سەر گەردنیاندا و جوانی خوایان دەرنەخەن ... وە با پێیان نەدەن بە زەویدا بۆ ئاشکراکردنی جوانییە شاراوەکانیان ، وە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا هەمووتان ئەی باوەڕداران بۆ ئەوەی سەرفراز و بەختەوەر بن .

ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((صنفَان من أهلِ النار لَم أرهما : قَوم معهم سياطٌ كَأذْنابِ الْبقَر يضربونَ بِها الناس ، ونِساءٌ كَاسيات عارِيات ، مميلات مائلات ،**

**رءُوسهن كأَسنِمة الْبخت الْمائلَة ، لا يدخلْن الْجنةَ ولا يجِدنَ رِ ها ، وإِن رِ ها لَتوجد مـِن مسِ ةِ كَذَا وكَذَا))[273].**

واتە : دوو چین لە خەڵكی دۆزەخ نەمبینیون : چینێكیان قامچیان پێ یەو وەك كلكی مانگا وایە پێی ئەدەن لە خەڵكی ، وە چینەكەی تریان ئافرەتانێكن جلیان لەبەردایە و ڕوتیشن ، وە لە ڕێگە بە لەنجەو لار دەڕۆن تا سەرنجی پیاوان بۆلای خۆیان ڕابكێشن ، قـژیان ئەبەسـتن و كـۆی دەكەنـەوە لـە سـەر تـەوقی سـەریان وەك كۆپـارەی ووشـتر (**البخت**)ی لێ دەكەن ، ئا ئەم ئافرەتانە ناچـنە بەهەشـتەوە و بۆنیـشی ناكـەن ، لەگـەڵ ئەوەی بۆنی چەندەها ساڵ بۆنی دەڕوات .

مەبەست بە (كاسيات عاريـات) ئەوەیە كە ئافرەتێك جلی لەبەردایە بەڵام هەموو لاشەی نەپۆشیوە بۆ نموونە جلێكی تەنك لەبەر بكات كە لەشی لێیەوە دیارە یان جلێكی كورت بێت كە بەشێك لە لاشەی بەدەر دەكەوێت وەك سەر و مل و گەردن و قۆڵ و قاچەكانی ، ئەمانەش لەو كەسانەن كە ناچنە بەهشتەوە و بـۆنی بەهەشـتیش ناكـەن ، مەگەر دوای تۆبە كردن .

كەواتــە دەبێــت خێزانــت تەوبــە بكـات و پەشـیمان ببیتــەوە لــەو تاوانــە و هــەموو تاوانەكانی .

وە بە نیسبەت ئەوەوە كە دەڵێـت نوێـژ دەكـات و قورئـان دەخوێنێـت بـەڵام لەچـك ناكات ! ! !

بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە كەوا ئافرەتێكی نوێژگەر و قورئان خوێنن لەچـك نـەكات ! بۆ ؟! چونكە خوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ ﴿٤٥﴾﴾ **[العنكبوت] .**

واتە : نوێژ بە ڕێكوپێكی ئەنجام بدە ، وە بەڕاستی نوێژ ڕێگری دەكات لە خراپـە و تـاوان .

---

**[273] صحيح مسلم رقم : (7123) .**

نەکردنی لەچکیش خراپە و تاوانە و دەبێت نوێژەکەی ڕێگری ئەو تاوانەی لێبکات .

هەروەها خوا لە قورئاندا فەرمانی کردووە بە لەچك کردن وەك لە ئایەتەکەی پێشەوەدا هاتووە ، کەواتە با ڕەفتار بکات بەو قورئانەی کە دەیخوێنێت .

کەواتە لەچك نەکردنی خێزانت هەڵەیە و ڕازی بوونی تۆش بەو کارە هەر هەڵەیە و تاوانبارتان دەکات و دەبێت هەردووکتان تەوبە بکەن .

**پ١١٧ / ئایا ڕاستە دەڵێن نابێت ئافرەت بە لەشگرانیەوە شیر بداتە منداڵەکەی ؟**

وەڵام /

هیچ بەڵگەیەك نەهاتووە لە سەر نادروستێتی و ڕێنەدان بە شیردانی ئافرەت لە کاتی لەش گرانیدا .

**پ١١٨ / ئەگەر پیاوێک شەهید ببێ خوای گەورە لە بەهەیشتدا ٧٢ حۆری ئەداتێ بەڵام ئەگەر ئافرەتێک شەهید ببێ چی دەدەنێ بە مەرجێک لە دنیادا شووی نەکردبێت ؟**

وەڵام /

بە پێی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوی شەهیدی جەنگی نێوان موسڵمانان و بێباوەڕان لە بەهەشتدا (٧٢) حۆری دەدرێتێ ، بەڵام ئافرەتی شەهید ئەگەر بە بێ مێرد شەهید ببێت ئەوا دەدرێت بە یەك پیاو لە پیاوانی بەهەشت ، **والله أعلم** .

**پ ١١٩ / ئایا کەنیزەک چیە لە ئیسلامدا ؟ ئایا دەتوانیت مەنی لە کەنیزەک یان لە خێزانی خۆت بێنیتەوە ؟**

وەڵام /

کەنیزەك بەو ئافرەتانە دەوترێت کەوا کۆیلە و خزمەتکارن و ئازاد نین ، بەڵام بۆ پیاو حەڵاڵە بچێتە لای و لەگەڵیدا ڕابوێرێت بە چەند مەرجێك :

١ ـ دەبێت هی خۆی بێت واتە خۆی خاوەنی بێت .

٢ ـ دەبێت دوای ئەوەی کە دەستی دەکەوێت بزانێت ئایا ئەو کەنیزەکە :

ـ کچە ؟ ئەوا بۆی حەڵاڵە .

ـ وە ئەگەر ژن بوو ئەوا یان حەملی هەیە یان نا ؟

جا ئەگەر حەملی هەبوو ئەوا نابێت بچێتە لای تاوەکو حەملەکەی لێدەبێتەوە و منداڵەکەی دەبێت .

وە ئەگەر حەملی نەبوو ئەوا نابێت بچێتە لای تاوەکو دەکەوێتە (عادەوە / سوڕی مانگانە) ئەنجا لە پاش پاکبوونەوەی بۆی حەڵاڵ دەبێت .

وە سەبارەت بە پرسیاری دووەمتەوە : بەڵێ دروستە بە دەست و ئەندامەکانی لەشی کەنیزەکی خۆت یان خێزانی خۆت مەنی بێنیتەوە چونکە هەردووکیان بۆت حەڵاڵن .

**پ١٢٠ / ئایا ئەو ئافرەتە بیانیانە نابنە کەنیزەک کە لە ماڵەکاندا کار دەکەن وەک خزمەتکار دەچنە بابی (کەنیزەک)ەوە ؟ ئایا بە کێ دەوترێت کەنیزەک و حوکمی چۆنە ؟**

وەڵام /

نەخێر ئەو ئافرەتانە نابنە کەنیزەك چونکە ئەوانە کەسانێکی ئازادن بەڵام ئەوەندە هەیە کرێکاری دەکەن وەکو خزمەتکار لە جێشتخانە و وتێل و ماڵەکاندا ، کەنیزەك بەو ئافرەتانە دەوترێت کەوا لە کاتی جەنگی نێوان کافر و موسڵماناندا دەستی موسڵمانان دەکەون و دابەش دەکرێن بە سەر بەشداربووانی جەنگەکەدا یاخود لە بازاڕدا دەیکڕیت یان بە دیاری پێشکەشت دەکرێت لە لایەن خاوەنەکەیەوە .

کەنیزەك حەڵاڵە بۆ خاوەنەکەی ئەگەر پیاو بوو کەوا کاری نێوان ژن و مێردی لەگەڵدا ئەنجام بدات بە پێی ئاداب و حوکمە تایبەتەکانی خۆی کە ناتوانین لێرەدا باسیان بکەین .

بەهەرحاڵ ئەو ئافرەتانەی کەوا بۆ کرێکاری هاتوون بۆ وڵاتانی لای خۆمان بە کەنیزەك حیساب ناکرێن .

پ١٢١ / بەڕێزەکەم ڕەفیقێکم زۆر موسڵمان و مولتەزیمە دەڵێت زۆربەی بەیانیان لە دوای ئەوەی نوێژی بەیانی دەکەم و زیکرەکان دەخوێنم و دەخەومەوە خەوی زۆر خراپ دەبینم وەک ئەوەی لەخەومدا داوێن پیسی بکەم و خۆ روت کردنەوە و شتی ئاوا خراپ ، وە دەڵێ : کە لە خەو هەڵدەستم ئەوەندە پێی بێتاقەتم جاری وا هەیە دەست دەکەم بە گریان ، نازانم چی بکەم ؟ ڕێگە چارە بۆ من چی‌یە ؟ ئایا گوناهبار دەبم ؟

وەڵام /

نەخێر گوناهبار نابیت بە تاوانێك کە لە خەودا ئەنجامی بدەیت چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((رفع القلم عن ثلاث : عن النائم حتى يستيقظ وعن الصغير حتى يكبر وعن المجنون حتى يعقل أو يفيق))**[٢٧٤].

واتە : قەڵەمی نووسینی تاوان هەڵگیراوە لە سەر سێ کەس : لە سەر خەوتوو تاوەکو بەخەبەر دێتەوە ، وە لە سەر منداڵ تاوەکو گەورە (بالغ) دەبێت ، وە لە سەر شێت تاوەکو ژیر دەبێتەوە و هۆش دەکاتەوە .

وە ئەو خەوانەش کە دەیبینیت ڕاست نی‌یە و یەکێکە لە فێڵ و هەنگاوەکانی شەیتان و دەیەوێت لە ڕێگای ئەو خەوە خراپانەوە بێزار و بێتاقەت و ناڕەحەتت بکات و بێ ئومێد و بێ هیوات بکات لە چاکەکاری و ڕەحمەتی خوای گەورە ، جا بۆیە دەبێت تۆش زۆر وریا و بە ئاگا بیت لە فێڵ و هەنگاوەکانی شەیتانی دوژمنت ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ١٦٨﴾ **[البقرة]** .

واتە : شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ڕوونی ئێوەیە .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ ٢١﴾ **[النور]** .

---

[٢٧٤] **صحيح سنن النسائي رقم : (٣٤٣٢) .**

واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون وە هەر کەسێ شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێت ئەوا بەڕاستی شەیتان فەرمان دەکات بە خراپەکاری و تاوان و کاری نابەجێ .

**وە ئەگەر هەر خەوێکی خراپت بینی ئەوا ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدە :**

١ ـ سێ جار تف بکە بە لای چەپتدا .

٢ ـ سێ جار بڵێ : (خوایە پەنات پێ دەگرم لە شەیتان و شەڕی ئەم خەوەی کە بینیومە) .

٣ ـ خۆت بخە بە سەر ئەو لاکەتدا (واتە ئەگەر بە لای ڕاستتدا خەوەکەت بینیبوو ئەوا خۆت بخە بە لای چەپدا ، وە ئەگەر بە لای چەپتدا بووبیت ئەوا خۆت بخە بە لای ڕاستتدا) .

٤ ـ هەستە دەستنوێژ بگرە و دوو رکعات نوێژ بکە .

٥ ـ لای کەس مەیگێڕەوە .

ئەمەش بە بەڵگەی ئەم فەرموودانەی خوارەوە :

**عن أَبِي سَلَمَةَ بنِ عبد الرحمنِ أنه قَالَ : سمعت أَبا قَتَادَةَ بن رِبعي (ﷺ) يقُولُ : سمعت رسولَ الله (ﷺ) يقُولُ : ((الرؤيا من الله ، والْحلُم من الشيطَان ، فَإِذَا رأَى أَحدكُم شيئاً يكْرهه ، فَلْينفُثْ عن يساره ثَلاثَ مرات إِذَا استيقَظَ ، ولْيتعوذْ بِالله من شرها ، فَإِنها لَن تضره إِنْ شاءَ الله)) ، قَالَ أَبو سلَمةَ : إِنْ كُنت لأَرى الرؤيا هي أَثْقَلُ علَي من الْجبلِ ، فَلَما سمعت بِهـذَا الْحديثَ فَما كُنت أُباليها[٢٧٥].**

واتە : گوێملێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : خەونی چاك (**الرؤيـا**) لە خواوەیە ، وە خەونی خراپیش (**الحلُم**) لە شەیتانەوەیە ، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە شتێکی بینی پێیناخۆش بوو ئەوا با سێ جار تف بکات بە لای چەپیدا لە کاتێکدا کە بەخەبردێتەوە ، وە با پەنابگرێت بە خوا لە خراپەی ئەو خەونە ، ئەوا ئەو خەونە زیانی

**[٢٧٥] صحيح البخاري رقم : (٥٧٤٧) وصحيح مسلم رقم : (٥٨٦٠) .**

پێناگەیەنێت بە ویستی خوا ، **(أبو سلمة)** فەرموویەتی : مـن خـەونی وام دەبـینی کـە لـە شاخێك نارەحەت و قورستر بوو بەسەرمەوە ، بەڵام کاتێك ئەم فەرموودەیەم بیست ئیتر گوێم پێی‌نەدەدا .

**و رواية : قَالَ أبو سلَمةَ : إنْ كُنت أرى الرؤيا تهمنِي حتى سمعت أبا قَتادةَ يقُـولُ : وأنا كُنت أرى الرؤيا فَتمرضنِي حتى سمعت رسولَ الله (ﷺ) يقُولُ : ((الرؤيا الصالحةُ من الله ، فَإِذَا رأَى أحدكُم ما يحب فَلا يحدثْ بِه إلا من يحب ، وإِذَا رأَى ما يكْره فَلا يحدثْ بِه ، ولْيتفُلْ على يساره [ثَلاثًا] ، ولْيتعوذْ بِالله من الشيطَان الرجِيمِ ومن شر ما رأَى ، فَإِنهـا لَـن تضره))[٢٧٦] .**

واته : **(أبو سلمة)** فەرموویەتی : من خەونی وام دەبینی کە زۆر بێتاقەت و غەمباری دەکردم تـاوەکو لـە **(أبو قتادة)**وەم بیـست دەیفـەرموو : منـیش خـەونی وام دەبـینی کـە نەخۆشی‌دەخستم تاوەکو لە پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیـست دەیفـەرموو : خـەونی چـاك **(الرؤيا الصالحة)** لە خواوەیە ، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی بینی پێیخۆشبوو ئـەوا با بۆ کەس نەیگێڕێتـەوە تـەنها بـۆ کەسـانێك نـەبێت کـە خۆشـیانی دەوێت ، وە ئەگـەر خەونێکی بینی پێیخۆشنەبوو ئەوا بـا نەیگێڕێتـەوە ، وە [سـێ جـار] تـف بکـات بـە لای چەپیدا ، وە با پەنابگرێت بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لـە مهرەبـانی خـوا و لـە خراپـەی ئەوەی کە بینیویەتی ، ئەوا ئەو خەونە زیانی پێ‌ناگەیەنێت .

**و رواية أخرى : عن أَبِي سلَمةَ بنِ عبد الرحمنِ عن أَبِي قَتادةَ (رضي الله عنه) عن رسولِ الله (ﷺ) أنه قَالَ : ((الرؤيا الصالحةُ من الله ، والرؤيا السوءُ من الشيطَان ، فَمن رأَى رؤيا فَكَره منهـا شيئًا فَلْينفثْ عن يساره ولْيتعوذْ بِالله من الشيطَان لاَ تضره ولاَ يخبِر بِها أَحداً ، فَإِنْ رأَى رؤيا حسنةً فَلْيبشر ولاَ يخبِر إِلا من يحب))[٢٧٧] .**

---

[٢٧٦] شرح السنة للبغوي رقم : () واللفظ له ، وصححه الشيخ الألبانـي "صحيح الكلم الطيب" ص : (٨٥) حـديث رقـم : (٥٠) .

[٢٧٧] صحيح مسلم رقم : (٥٨٦٢) .

واتە : خەونی چاك (**الرؤيا الصالحة**) لە خواوەیە ، وە خەونی خراپیش (**الرؤيا السوء**) لە شەیتانەوەیە ، جا هەرکەسێك خەونێکی بینی شتێکی لێی پێناخۆشبوو با تف بکات بە لای چەپیدا و پەنابگرێت بە خوا لە شەیتان ئەوا زیانی پێناگەیەنێت و با بۆ هیچ کەسێکیش نەیگێڕێتەوە ، وە ئەگەر خەونێکی باشی بینی با مژدە پێبدات و بۆ کەس نەیگێڕێتەوە تەنها بۆ کەسانێك نەبێت کە خۆشیانی دەوێت .

**وعن جابرٍ (ﷺ) عن رسولِ الله (ﷺ) قَالَ : ((إِذَا حلَم أحدكُم فَلاَ يخبِر الناس بِتلَعـبِ الشيطَانِ بِه في الْمنامِ))[٢٧٨] .**

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی خراپی بینی با هەواڵ نەدات بە خەڵك بە یاری کردنی شەیتان پێی لە خەودا .

**وعن جابرٍ (ﷺ) عن رسولِ الله (ﷺ) أنه قَالَ : ((إِذَا رأَى أحدكُم الرؤيا يكْرهها فَلْيبصق عن يساره ثَلاَثَاً ولْيستعذْ بِالله من الشيطَانِ ثَلاَثَاً ، ولْيتحولْ عن جنبِه الذي كَانَ علَيه))[٢٧٩] .**

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی بینی پێیخۆشنەبوو ئەوا با سێ جار تف بکات بە لای چەپیدا و سێ جاریش پەنابگرێت بە خوا لە شەیتان ، وە با خۆی هەڵەودیو بکاتەوە لەسەر ئەو لایەی کە لەسەری بووە .

**وعن أَبِي هريرةَ (ﷺ) عنِ النبِي (ﷺ) قَالَ : ((الرؤيا ثَلاَثَةٌ : فَرؤيا الصالحة بشرى من الله ، ورؤيا تحزِين من الشيطَانِ ، ورؤيا مما يحدثُ الْمرءُ نفْسه ، فَإِنْ رأَى أحدكُم ما يكْره فَلْيقُم فَلْيصل ولاَ يحدثْ بِها الناس))[٢٨٠] .**

واتە: خەون سێ جۆرە : خەونی چاك مژدەیە لە لایەن خواوە ، وە خەونی بێتاقەتکەر و غەمبارکەر لە لایەن شەیتانەوەیە ، وە خەونی ئەوەی کە مرۆڤ لە ناخی خۆیدا دەیلێێتەوە ، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی بینی پێیخۆشنەبوو ئەوا با هەڵسێت نوێژ بکات و خەونەکەشی بۆ کەس نەگێڕێتەوە .

---

[٢٧٨] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٣٩١٣) .

[٢٧٩] صحيح مسلم رقم : (٥٨٦٤) .

[٢٨٠] صحيح مسلم رقم : (٥٨٦٥) وصحيح سنن أ داود رقم : (٥٠١٩) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٢٢٧٠) .

**وە بۆ ئەوەی جارێکی تر لەم جۆرە خەوە خراپانە نەبینیتەوە ئەوا ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدە :**

١ ـ تەوبە بکە لە هەموو تاوانەکانت و بگەڕێرەوە بۆ لای خوا و داوای لێبکە و لێی بپاڕێرەوە کە پەنات بدات لە هەموو تاوانێك و پەناشی پێبگرە لەوەی کە خەونی خراپ ببینیت .

٢ ـ زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران و پێش خەوتن و پاش خەوتن و ڕۆیشتنە دەرەوە لە ماڵ و هاتنە ژوورەوەش بۆ ماڵ و زیکرەکانی پاش نوێژە فەرزەکان بخوێنە بە گشتی و بە تایبەت زیکرەکانی پێش خەوتن و بە تایبەت تریش خوێندنەوەی **(آية الكرسـي)** و دوو ئایەتی کۆتایی **(سورة البقرة)** .

٣ ـ بیروباوەڕت پاك بکەرەوە و پشت بە خوا ببەستە و بیرت مەدەرە دەست شەیتان و وەسوەسەکانی و شوێنی هەنگاوەکانی مەکەوە و زۆر بە ئاگا و وریا بە لە فێڵەکانی .

وە ئامۆژگاریت دەکەم بە خوێندنەوەی کتێبی : (بیروباوەڕت وەربگرە لە قورئان و سوننەت) کە لەم سایتەدا بڵاوکراوەتەوە .

دواکارم خوای پەروەردگار ئێمەش و تۆش بپارێزێت لە فێڵ و هەنگاوەکانی شەیتان و شوێنکەوتوانی ، **والسلام عليكم ور ة ا وبركاته** ...

**پ ١٢٢ / بەڕێزان من زۆر زۆر ئەترسم بەزۆری لە خەوندا ، وە زۆر جار هەر لە خۆمەوە شت دێتە پێش چاوم و لە پڕا دائەچەڵەکێم و دڵم پەلە پەل ئەکات و بەو هۆیەیشەوە منداڵێکیشم لەبارچووە ، زۆر سوپاستان ئەکەم ئەگەر چارەیەکم بۆ بدۆزنەوە ؟**

وەڵام /

خوشکی بەڕێز : ئەو ترسە لە ڕێگەی جنۆکەوە بۆت پەیدا دەبێت ، هەر ئاوانیشن کە لە کاتی خەوتندا خەوی ترسناك و سامناك و نابەجێ دەهێننە پێش چاوت و خەوی خراپ دەبینیت .

چارەسەری ئەم حاڵەتەش بەوە دەبێت کەوا ئەم کارانەی خوارەوە بە شێوازێکی ڕێك و پێك و تەواو وئەنجامبدەیت :

١ ـ نابێت بە هیچ شێوەیەك وێنەی گیان لەبەر لە ماڵتاندا هەبێت ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لاَ تدخلُ الْملائكةُ بيتاً فيه كَلْب ولاَ صورةٌ))**[281].

واتە : فریشتەکان ناچنە نێو ماڵێکەوە سەگ یان وێنەی تێدا هەبێت .

جا ئەگەر بە هۆی وێنەوە فریشتەکان نەچنە ناو ماڵێکەوە ئەوا ئەو ماڵە دەبێتە جێگای شەیتان و جنۆکەکان .

٢ ـ نابێت بە هیچ شێوەیەك لە ماڵتاندا گۆرانی و مۆسقا لێبدرێت ، چونکە گوێ گرتن لە گۆرانی و مۆسقا تاوانە و سەرپێچی فەرمانی خوایە و فریشتەکان و ئیمانداران بێزار دەکات ، وە بە پێچەوانەوە گۆرانی و مۆسقا شەیتان و جنۆکەکان دڵخۆش دەکات و هاندەریانە بۆ کاری خراپە و تاوان .

٣ ـ دەبێت لە ماڵتاندا قورئان بخوێنرێت (چ کەسێك بیخوێنێت یان بە کاسێت لێبدرێت) بە تایبەت **(سورة البقرة)** بە کاملی ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((اقْرَءُوا سورةَ الْبقَرة في بيوتكُم ، فَإِن الشيطَانَ لا يدخلُ بيتاً يقْرأُ فيه سورةُ الْبقَرة))**[282].

واتە : لە ناو ماڵەکانتاندا **(سورة البقـرة)** بخوێننەوە چونکە شەیتان ناچێتە ناو ماڵێکەوە کەوا **(سورة البقرة)**ی تێدا بخوێنرێت .

٤ ـ دەبێت بەردەوام پەیوەست بیت بە خوێندنەوەی زیکرەکانەوە و دایم دەم بە زیکری خوا بیت ، وە بە تایبەت ئەم زیکرانە :

---

[281] **صحيح البخاري رقم : (٣٢٢٦) و (٣٢٢٥) و (٣٣٢٢) و (٤٠٠٢) و (٥٩٤٩) و (٥٩٥٨) وصحيح مسلم رقم : (٥٤٨١) و (٥٤٨٢) و (٥٤٨٦) .**

[282] **صحيح الـجامع الصغ رقم : (١١٧٠) .**

- زیکری بەیانیان و ئێواران .

- زیکری دوای نوێژە فەرزەکان .

- زیکری پێش خەوتن و پاش لە خەو هەستان .

- زیکری لە ماڵ دەرچوون و هاتنە ژوورەوە بۆ ماڵ .

- زیکری پێش جلوبەرگ داکەندن و پاش لەبەر کردنی .

- زیکری پێش چوونە سەر ئاو و پاش دەرچوونە دەرەوە لە سەر ئاو .

- هەروەها هەموو زیکرەکانی تر کە لە سوونەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە ، بۆ ئەم مەسەلەیە دەتوانیت سوود ببینیت لەم کتێبە : **(حصن المسلم من أذكار اليوم والليلة)** .

وە بە تایبەت بۆ تۆ زۆر پێویستە کەوا کەمتەرخەم نەبیت لە زیکرەکانی پێش خەوتن و بە تایبەت تریش (**آية الكرسي**) و (دوو ئایەتی کۆتایی **سورة البقرة :** ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ ...﴾) و هەر سێ سورەتی : **(قُلْ هو الله أحد ...) + (قُلْ أعوذُ بِرب الناسِ ...) + (قُلْ أعوذُ بِرب الْفَلَقِ ...) .**

ئەگەر هەموو ئەم کارانەت ئەنجام دا لەگەڵ پشتن بەستن بە خواوە ئەوا بە ویستی خوا چاك دەبێتەوە و ئەو ترسەت نامێنێت .

وە سەبارەت بە لەبارچوونی منداڵەکەتیشەوە ، ئەوا پێدەچێت دەستی جنۆکەی تێدا هەبێت و ئەوان لەباریان بردبێت ، وە ئەم حاڵەتەش لە کوردەواریدا پێی دەڵێن (مۆکڵە) .

چارەسەری ئەمەش بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی پێشەوە دەکرێت ، لەگەڵ ئەوەی کە دەبێت پێش جووتبوون مێردەکەت ئەم زیکرە بخوێنێت : **(بِسم الله ، اللهم جنبنا الشيطانَ وجنبِ الشيطانَ ما رزقْتنا)** .

چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((لو أن أحدكُم إذَا أراد أنْ يأتي أهلَه فَقَالَ : بِاسم الله ، اللهم جنبنا الشيطَانَ وجنبِ الشيطَانَ ما رزقْتنا ، فَإنه إنْ يقَدر بينهما ولَد فـي ذَلك لَم يضره شيطَانٌ أبداً))[٢٨٣].**

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێتە لای خێزانەکەی و بڵێت : (بە ناوی خواوە ، خوایە بە دوورمانگرە لە شەیتان و شەیتان دووربخەرەوە لەوەی کە پێمان دەبەخشیت) ئەنجا ئەگەر خوا دایناب کەوا لەو جووتبوونەوە منداڵیان ببێت ئەوا هەرگیز هیچ شەیتانێك زەرەر و زیانی پێناگەیەنێت .

داواکارم لە خوای بە توانا و زانا کە ئێمەش و تۆش بپارێزێت لە شەیتان و فێڵ و پلانەکانی و یاریدەدەرەکانی .

**پ ١٢٣ / هەندێ لە کەناڵە تەلەفزۆێنییەکان بەرنامەی پێشبڕکێیان هەیە ، لەو بەرنامانە پرسیار ئاڕاستەی بینەران دەکەن وە بۆ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانە دەبێت بینەر کورتە نامەی مۆبایل بنێرێت و لەو ڕێگەیەوە وەڵام بداتەوە ، پرسیارەکەم ئەوەیە : ئایا لەڕووی شەرعییەوە ئەو خەڵاتەی بەو شێوەیە بەدەست بێت حەڵاڵە یان نا ؟ بەتایبەت هەندێ کەس دەیەها کورتە نامە دەنێرێن بۆ ئەوەی هەلی بردنەوەیان زیاتر بێ وەک ئاشکراشە ناردنی ئەو کورتە نامانە پارەلەدەست خاوەنەکەی دەدات .**

وەڵام /

بەشداری کردن لەو جۆرە پێشبڕکێیانە بۆ بە دەست خستنی خەڵات حەرامە و دروست نییە چوونکە دەچێتە ڕیزی قومارەوە لە بەر ئەوەی نازانرێت ئایا چیت بۆ دەردەچێت و بە چەندێکیش بۆت دەردەچێت !

هەروەها ئەمە دبێتە هۆی سەرف کردن و دۆڕاندی پارەیەکی زۆر بە بێ ئەوەی بزانیت هیچت دەست دەکەوێت یان نا ؟ ئەمەش خوودی قومارە ، هەروەها لە دەست دانی کاتێکی زۆر لە شتێکی سەرئەنجام نادیاردا کە ئەمەش لە ئیسلامدا دروست نییە ،

---

[٢٨٣] **صحيح البخاري رقم : (٧٣٩٦) وصحيح مسلم رقم : (٣٥١٩) .**

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((لا تزولُ قَدما عبد يوم الْقيامة حتى يسألَ عن عمره فيم أفْناه ... وعن ماله من أين اكْتسبه وفيم أنفقَه))**[٢٨٤].

واتە : هیچ عەبدێك لە ڕۆژی قیامەتدا هەنگاوێك نانێت تاوەکو پرسیاری لێدەکرێت سەبارەت بە تەمنی ئایا لە چیدا سەرفی کردووە ... وە سەبارەت بە پارە و ماڵی ئایا لە کوێیەوە دەستی کەوتووە و لە چیدا سەرفی کردووە .

جا ئامۆژگاریت دەکەم بە سەرف کردنی پارە و کاتەکانتدا لە کاری خێردا و بۆ خزمەت کردنی ئایینەکەت بۆ ئەوەی لە دوای مردنت سودی لێببینیت .

**پ١٢٤ / کە قورئانی پیرۆز ئەخوێنمەوە لە هەندێک لە لاپەڕەدا خەتێک بە ژێر یەکێک لە ووشەکاندا هاتووە ئینجا نازانم ئەبێت لەو کاتەدا چی بکەم ؟**

وەڵام /

ئەو خەتە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەوا سوننەت وایە ئەگەر ئەو ئایەتەت خوێندەوە کەوا خەتێکی بە سەرەوەیە یەك جار سوجدەی خوێندنەوەی قورئان **(سجدة التلاوة)** ببەیت و لە کاتی سوجدە بردنەکەدا بڵێیت : **((سجد وجهي للذي خلَقَه وشق سمعه وبصره بِحولـه وقُوته))**[٢٨٥].

**پ١٢٥ / دروستە پێش خەوتن قورئان هەڵبکەیت و ئەنجا بخەویت ؟**

وەڵام /

بەڵێ دروستە ، چونکە قورئان خوێندن لە ماڵدا دەبێتە هۆی دابەزینی ڕەحمەتی خوا بە سەر ئەو ماڵەدا ، وە لەوانەیە فریشتە و جنۆکەکان گوێی لێ بگرن و سوودی لێببێنن ، وە دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی شەیتان و جنۆکە خراپەکان لە خۆتان و ماڵ

---

[٢٨٤] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٢٦) .

[٢٨٥] صحيح سنن أبـي داود رقم : (١٤١٤) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٥٨٠) .

و منداڵتان بە تایبەت سورەتی **(البقرة)** چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((اقْـرءُوا سورةَ الْبقَرة في بيوتكُم ، فَإِن الشيطَانَ لا يدخلُ بيتاً يقْرأُ فيه سورةُ الْبقَرة))**[٢٨٦].

واتە : سورەتی **(البقرة)** بخوێنن لە ماڵەکانتاندا چونکە شەیتان ناچێتە ناو ماڵێکەوە کە سورەتی **(البقرة)** تێدا بخوێنرێت .

**پ ١٢٦ / مـن ماوەیـەک لەمەوبـەر سـەفەرم کردبـوو بـۆ دەرەوە لـە کـاتی گەڕانەوەم دیاریم بۆ هاوڕێکانم هێنا جا بەشێک لەم هاوڕێیانەم کچن ، جا پرسیارەکەم ئەوەیە : لـە شـەرعدا هیچ ڕێگرێـک هەیـە مـن ئـەم دیاریانـە ببەخـشم بەتایبـەتی بـۆ کچەکان ... من بە خۆم کوڕم ؟**

وەڵام /

برام نابێت کوڕی موسڵمان هاوڕێی کچی هەبێت وەکو چۆن هاوڕێی کوڕی هەیە ، بـە هەمان شێوە ناشبێت کچی موسڵمان هاوڕێی کوڕی هەبێت هـەروەك چـۆن هـاوڕێی کـچی هەیە ، چونکە هەبوونی پەیوەندی و تێکڵاوی لە نێوان دوو ڕەگەزی جیـاوازدا دەیانخاتـە نێو چەندین هەڵە و تاوانەوە وەك نەزەر کردن و گفتۆکۆ و دەمەتەقێ کـردن و بـە یـەکتر گەیـشتن و یـەکتر بیـنین و نامـە بـۆ یـەکتر نـاردن و ... چـەندین شـتی تـریش کـەوا قەدەغەکراون لە شەرعدا .

کەواتە دیاری بردن بۆ ئەو کـچانەی کـەوا پەیوەنـدی هاوڕێیـەتی لـە نێوانتانـدا هەیـە کارێکی ناشەرعی و نادروستە چـونکە بـوونی خـوودی هاوڕێیەتیەکـە نادروسـتە و نابێـت قوڵتر بکرێتەوە بەو جۆرە دیاریانە لەبەر ئـەوەی دیـاری بـۆ یـەکتر بـردن خۆشەویـستی دروست دەکات و هەبوونی خۆشەویستیش لە نێوان کوڕان و کچاندا حەرامە و قەدەغەیـە .

---

[٢٨٦] **صحيح الـجامع رقم : (١١٧٠) .**

وە ئامۆژگاریت دەکەین بەوەی کە ئەو شتانە بە دیاری بدەیت بە خزم و کەسوکاری خۆت و برادەرە باوەڕدار و لە خواترسەکانت بۆ ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی و خۆشەویستی ئیمانی لە نێوانتاندا قوڵ تر بێتەوە وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((تهادوا تحابوا))**[287].

واتە : دیاری ببەن بۆ یەکتر بۆ ئەوەی خۆشەویستی بکەوێتە نێوانتانەوە .

**پ١٢٧ / من حەزم لێیە بچمە دەرەوەی وڵات ، ئایا دەتوانم واجباتی دینیم بەجێ بهێنم ؟ ئامۆژگاری بەرێزتان بۆ من چیە ؟ تکایە وەڵامەکەم بنێرن بۆ ئیمەیڵەکەم .**

وەڵام /

برای بەڕێزمان ئامۆژگاری ئێمە بۆ تۆی بەڕێز ئەوەیە کە :

١ ـ لە خوا بترسی و بیری ئەوە نەکەیتەوە کە بڕۆیتە دەرەوە ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((برئت الذمةُ ممن أقَام مع المُشرك في ديارهم))**[288].

یان سەبارەت بە موسڵمان و بێ باوەڕ فەرموویەتی : **((لا تتراءى نارهما))**[289].

واتە : بێ بەش و دوورە لە ئیسلام ئەو کەسەی کە لە نێوان بێ باوەڕاندا دەژێت ، چونکە موسڵمان و بێ باوەڕان ئەبێ ئەوەندە لەیەکەوە دووربن ئاگر و ڕووناکی یەکتر نەبینن .

٢ ـ برام لەوانەیە لای بەڕێزتان ئاشکرابێ بارو حاڵی زۆر لەوانەی کە ڕۆشتونەتە دەرەوە کە چۆن تووشی سەرگەردانی و دوور لە ئاینی بوون و تووشی چەندەها شتی قەدەغە کراو بوون لە ئەنجام دانی داوێن پیسی و خواردنەوەی مەی و مادەسڕکەرەکان و خواردنی سوو (ڕیبا) ، یان چەندەها تاوانی تر ، داواکارم لەخوای پەروەردگار من و تۆش لە هەموو ئەوانە بپارێزێ .

---

[287] صحيح سنن أبي داود رقم : (١٦٠١) .

[288] صحيح الجامع الصغير رقم : (٢٧١٨) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٧٦٨) .

[289] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٦٣٦) .

٣ ـ خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴿١٦٨﴾﴾ [البقرة] .

واتە : شوێنی وەسوەسەکانی شەیتان نەکەون ، جا برام ئەوەی کە دەوترێت : (ئەگەر کەسێك بتوانێ واجباتی ئایینی خۆی بەجێ بێنێ دەتوانێت بڕوات بۆ دەرەوە)!!! وەسوەسەی شەیتانە بۆ موسڵمان دەیکات بۆ فریودانیان ، داواکارم لە خوای پەروەردگار تۆ بپارێزێ لەوەی لەوانە بیت کە شوێن ئەم وتەیە بکەویت ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هیچ جیاوازی یەکی نەکردووە لە نێوان ئەمەی کە دەتوانێت لەگەڵ ئەوەی کەناتوانێت ، جا برام بە ئاگابە لە فریوی شەیتان چونکە تەڵەکەی زۆرە.

٤ ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ : **((من ترك شيئاً لله عوضه الله خيراً منه))[٢٩٠].**

واتە : ئەو کەسەی لەبەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار واز لە شتێك بێنێ خوای پەروەردگار لەوە باشتری بەنسیب دەکات .

جا براکەم تۆش واز لەبەر ڕەزامەندی خوا واز لەو ڕۆشتنە بێنە ، داواکارم خوای پەروەردگار لەوە باشترت بە قسمەت بکات .

٥ ـ برای بەڕێزم لەوەش بترسە کە ئەم ئایەتە تۆ بگرێتەوە کەخوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾﴾ [النساء] .

پێشەوا (**ابن كثير**) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی : (ئەم ئایەتە گشتییە و هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە نیشتەجێ دەبن لە نێو بێباوەڕاندا ، و توانای هیجرەتی هەیە لەو وڵاتانەوە بۆ وڵاتی موسڵمانان)[٢٩١].

وە پێشەوا (**أبو بكر الجصاص**) دەفەرموێت : (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر قەدەغە کردنی مانەوە لە وڵاتی بێباوەڕاندا)[٢٩٢].

---

[٢٩٠] رواه أحمد بسند صحيح قاله الألباني "جلباب المرأة المسلمة" ص : (٤٧) .

[٢٩١] تفسير القرآن العظيم : (١ / ٥٤٣) .

[٢٩٢] أحكام القرآن : (٣ / ٢٢٨) .

جا برای بەڕێزم چۆن ڕێگە بە خۆت دەدەیت بە بیرکردنەوەش بێت بڕۆی بۆ وڵاتی بێ باوەڕان ، خوای پەروەردگار پارێزەرت بێت لەو تاوانەو هیدایەتی من و تۆش بدات بۆ چاکەی دونیاو دوارۆژمان .

**پ١٢٨ / بە کار هێنانی دەرمان بۆ ئەوەی ئەصڵەع نەبێت یان پرچ چاندن وە یان نەشتەگری جوان کاری ئایا حەرامە ؟**

وەڵام /

ئەم پرسیارە سێ برگەیە بۆیە وەڵامەکەشی دەبێتە سێ بەشەوە :

- بە کار هێنانی دەرمان بۆ ئەوەی ئەصڵەع نەبێت : ئەگەر ئەو دەرمانەی کەوا بە کاردەهێنرێت زیانی نەبێت ئەوا دروستە و هیچی تێدا نی‌یە چونکە مانەوەی مووی سەر بەشێکە لە جوانی مرۆڤ .

- پرچ چاندنیش دەبێت بە دوو بەشەوە :

ئەگەر پرچی مرۆڤێکی تر بە کار بێنێت ئەوا دروست نی‌یە .

بەڵام ئەگەر لە پرچی خۆیی بۆ بچێنرێت ئەوا دروستە **إن شاء ا** .

- نەشتەگری جوان کاری ئەگەر بۆ لابردنی کەموکوڕییەك (عەیبەیەك) بێت ئەوا هیچی تێدا نی‌یە و دروستە ، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك لوتی لار بێت و ڕاستیکاتەوە ، یان ئەگەر دانێکی زیادی هەبێت و ئازاری بدات یان بەنجەیەکی زیادی هەبێت ئەوا لایدەبات .

بەڵام ئەگەر بۆ لادانی کەموکوڕییەك (عەیبەیەك) نەبوو ئەوا حەرامە و دروست نی‌یە وەك لابردنی مووی ڕوومەت یان شاش کردنی دانەکان .

**پ١٢٩ / سەردانی گۆڕستانی گاور دروستە ؟**

وەڵام /

ئەگەر لە وڵاتێکدا بیت کە گۆڕستانی موسڵمانانی تێدا هەبێت ئەوا نابێت بچیت بۆ سەردانی گۆڕستانی بێباوەڕەکان و موشریکەکان ، وە ئەگەر گۆڕستانی موسڵمانانی تێدا

نەبوو ئەوا بە مەرجێك دروستە بچیت کەوا بە مەبەستی بیرخستنەوەی مردن و قیامەت بچیت و ناشبێت سەلامیان لێبکەیت بەڵکو دەبێت بڵێیت : (موژدەی ئاگرتان لێبێت) .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **((حيثُما مررت بِقَبرِ كافرٍ فَبشره بِالنار))**[٢٩٣] .

واتە : هەر چ کاتێك بە لای گۆڕی بێباوەڕێکدا تێپەڕ بوویت ئەوا موژدەی ئاگری بدەرێ .

**پ ١٣٠ / ئایا دەبێت بە پێڵاوەوە بچیتە نێو گۆڕستانەوە ؟**

**وەڵام /**

دروست نی‌یە بە پێڵاوەوە بە نێو گۆڕستانی موسڵمانانندا ڕێبکەیت ، لەبەر ئەم فەرموودەیە :

**عن بشير ابنِ الخصاصية (رضي الله عنه) قَالَ : ((بينا أماشي رسولَ الله (ﷺ) ... فَأتى على قُبــورِ المسلم ... فَبينما هو يمشي إذْ حانت منه نظْرةٌ فَإِذَا هو بِرجلٍ يمشي بين القُبورِ عليه نعلَان فَقَالَ : يا صاحب السبتيتين ألقِ سبتيتك ، فَنظَر فَلَما عرف الرجلُ رسولَ الله (ﷺ) خلَع نعلَيه فَرمى بِهما))**[٢٩٤] .

واتە : جارێکیان من لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ڕێم دەکرد ... ئەنجا هات بۆ لای گۆڕستانی موسڵمانان ، جا لە کاتێکدا کە ڕێی دەکرد بینی پیاوێك لە نێو گۆڕەکاندا بە جوتی پێڵاوەوە ڕێ دەکات ، پێی فەرموو : ئەی خاوەنی پێڵاوە (سبتیەکە) جووتە پێڵاوەکەت فڕێدە ، ئەو پیاوەش کاتێ بینی پێغەمبەری خوای (ﷺ) ناسیەوە و پێڵاوەکانی داکەند و هەردووکیانی فڕێدا .

*** نوکتە و سوعبەت کردن :**

---

[٢٩٣] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٨) .

[٢٩٤] صحيح الأدب المفرد رقم :(٨٢٩) .

**پ ١٣١ / ئـافرەتێکم زۆر حـەز بـە نوکتـە دەکـەم ، لـە لای برادەرەکانـدا زۆر سوعبەت و نوکتە دەکەم تا چەند من تاوانبارم ؟ تکایە وەڵامم بدەنەوە لەگەڵ ڕێزی بێپایانم بۆتان .**

وەڵام /

نوکتـە وتـن و سـوعبەت کـردن دەبێـت بـە دوو بەشـەوە : یـان ڕاسـتە و حەقـە یـان ناڕاستە و درۆیە و تاوانە و وتەی نابەجێیە .

١ ـ جا ئەگـەر ڕاسـت و حـەق بـوو ، ئـەوا دروسـتە چـونکە پێغەمـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((إني لأمزح ولا أقولُ إلا حقاً))**[٢٩٥].

واتە : من سوعبەت دەکەم بەڵام هیچ ناڵێم ئیللا حەق و ڕاستی نەبێت .

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتوە هاوەڵان وتیان بە پێغەمەری خوا (ﷺ) : **((يا رسولَ الله إنك تداعبنا ؟ قَالَ : إني لا أقولُ إلا حقاً))**[٢٩٦].

واتـە : ئـەی پێغەمـەری خـوا تـۆ سـوعبەتمان لەگەڵـدا دەکـەیت ؟ فـەرمووی : مـن سوعبەت دەکەم بەڵام هیچ ناڵێم ئیللا حەق و ڕاستی نەبێت .

بۆ نموونە یەکێك لەو سوعبەتانەی پێغەمەری خوا (ﷺ) :

**((أتت عجوز إلى النبي (ﷺ) فَقَالَت : يا رسولَ الله ادع الله أنْ يدخلَنِي الْجنةَ ، فَقَالَ : يا أم فُلانةَ إن الْجنةَ لا تدخلُها عجوز ، قَالَ : فَولت تبكي ، فَقَالَ : أخبروها أنها لا تـدخلُها وهي عجوز ، إن الله تعالى قَـالَ :** ﴿ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ ﴾ **[الواقعة]))**[٢٩٧].

واتە : پیرەژنێك هات بۆ لای پێغەمەر (ﷺ) و وتی : ئەی پێغەمەری خوا (ﷺ) دوعـام بۆ بکە لای خوا کە بمخاتە بەهەشتەوە ، پێغەمەریش (ﷺ) فەرمووی : ئەی دایکی فلانـە

---

[٢٩٥] صحيح الـجامع الصغ رقم : (٢٤٩٤) .

[٢٩٦] صحيح سنن الترمذي : (١٩٩٠) .

[٢٩٧] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٩٨٧) .

بەهەشت پیرەژنی تێ ناچێت ، ئەویش ڕۆیشت بە گریانەوە ، ئەنجا پێغەمەر (ﷺ) فەرمووی : هەواڵی بدەنێ کەوا ناچێتە بەهەشتەوە بە پیری ، خوای پایەبەرز فەرموویەتی : ﴿ئێمە ئافرەتانی بەهەشتمان دروست کردووە ، کراون بە کچە عازەب ، خۆیان خۆشەویست دەکەن لای مێردەکانیان و هەموویان هاوتەمەنن﴾ .

ئەوەش بزانە سوعبەت کردنی ڕاست و حەق هەرچەندە دروستە بەڵام نابێت ببێتە پیشەی مرۆڤی ئیماندار و بە زۆری ئەنجامی بدات ، چونکە زۆر سوعبەت کردن و نوکتە وتن پێکەنینی زۆری لەگەڵدا دەبێت ، زۆر پیچکەنینش دڵ ڕەق دەکات و دەیمرێنێت وەك پێغەمەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((ولا تكثر الضحك فإن كثرة الضحك تميت القلب))**[298] .

واتە : زۆر پێمەکەنە چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێت .

٢ ـ بەڵام ئەگەر سوعبەت و نوکتە وتن ناڕاست و درۆ و تاوان و نابەجێ بوو ئەوا حەرامە و نابێت لە موسڵمان بوەشێتەوە ، چونکە ئاشکرایە (درۆ کردن ، وتەی نابەجێ) حەرامە با ئەگەر بەرگی سوعبەت و نوکتەشی بە بەردا بکرێت .

وە ئەگەر نوکتە وتن و سوعبەت کردنی درۆ بۆ ئەوە بێت دەوروبەر بهێنیتە پێکەنین ئەوا تاوانێکی زۆر ترسناك و گەورەیە ، پێغەمەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **((ويلٌ للذي يحدثُ فيكْذب ليضحك به القوم ويلٌ له ويلٌ له))**[299] .

واتە : تیاچوون (یان دۆڵێك لە دۆڵەکانی دۆزەخ) بۆ ئەو کەسەی کە قسە دەکات و درۆ دەکات بۆ ئەوەی خەڵك بهێنێتە پێکەنین ، تیاچوون (یان دۆڵێك لە دۆڵەکانی دۆزەخ) بۆی ، تیاچوون (یان دۆڵێك لە دۆڵەکانی دۆزەخ) بۆی .

---

[298] صحيح الجامع الصغير رقم : (١٠٠) .
[299] صحيح أبي داود رقم : (٤٩٩٠) .

وە ئەوەش بزانە هەندێك جار نوکتە و سوعبەت کردن گاڵتە کردنی تێدایە بە خوا و پێغەمبەر (ﷺ) و دروشمەکانی ئاینی ئیسلام ئەمەش کوفرە و مرۆڤ لە دین دەردەکاتە دەرەوە .

وەك خوای گەورە لە بارەی دووڕووەکانەوە فەرموویەتی : ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ ﴿٦٦﴾ ﴾ [التوبة] .

واتە : ئەگەر پرسیاریان لێبکەیت ، دەڵێن : ئێمە تەنها ڕاماندەبوارد و گاڵتەمان دەکرد ، بڵێ : ئایا ئێوە بە خوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد ، بیانو مەهێننەوە ئێوە کوفرتان کردووە دوای باوەڕهێنان ، واتە بەو گاڵتە و سوعبەتە لە ئیمان هەڵگەڕاونەتەوە و کافر بوونەوە .

کەواتە دەبێت زۆر بە ئاگا بیت لە کاتێکدا کە سوعبەت یان گاڵتە یان یاری دەکەیت یان نوکتە دەڵێیت ، جا بۆ ئەوەی تاوانبار نەبیت ئەوا دەبێت ئەم ئایەت و فەرموودانەت لە پێش چاو بێت .

**پ١٣٢ / سلاوتان لێبێ : من پرسیارێکم هەیە سەبارەت بە خوێندنەوە هەرچەندە بخوێنمەوە ئەگەر زۆر جاریش بەڵام هەر لە بیری دەکەم زۆر فکر دەکەم داڵغەی لێ دەدەم ئایا ئەمەیە هۆکار یان ڕێگە چارەیەکی تر هەیە ؟ هیوادارم وەڵامێکی تەواوم بدەنەوە ئەگەر زانستیش بێت یان ئایینی زۆر مەمنوون دەبم .**

وەڵام /

چەند ڕێنماییکت دەکەین بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە :

١ ـ لە خوا ترسان و خۆپاراستن لە تاوانەکان ، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ ﴾ [الطلاق] .

واتە : هەرکەسێك لەخوا بترسێت و خۆپارێزی بکات لە تاوان ئەوا خوا دەرگای لێدەکاتەوە و لەناڕەحەتی دەری دەکات .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ﴿٢٩﴾ ﴾ **[الأنفال]** .

واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە لە خوا بترسن و خۆپارێزی بکەن لە تاوان ئەوا خوا ڕووناکێیەکتان پێ دەبەخشێت کەوا حەق و ناحی پێ جیابکەنەوە لە یەکتر .

وە ئیمامی شافعی دەفەرموێت :

**شكوت إ وكيعٍ سوء حفظي فأرشد إ ترك الـمعاصي**

**وقـال : إن الـعلـم نـور ونـور ا لا يعطى لـعاصي**

واتە : شکاتی خراپێتی لەبەرکردنم کرد لە لای ئیمامی وەکیع ئەویش ڕێنمایی کردم بۆ وازهێنان لە تاوانەکان و فەرمووی زانست نور و ڕووناکییە و نور و ڕووناکی خواش نادرێت بە تاوانبار .

٢ ـ دیاری کردنی کات و شوێنی گونجاو بۆ خویندن و خوێندنەوە .

أ / بۆ نموونە باشتر وایە خویندن و خوێندنەوە لە دوای ئەنجامدانی نوێژی بەیانی و دوای نیوەڕۆ و پێش خەوتن و کاتی بێ مەشغەڵەتدا ئەنجامبدرێت .

ب / شوێنێکی پاك و بێ قەرەباڵغی و فێنك هەڵبژێریت .

٣ ـ دوعاکردن و داواکردن لە خوا بۆ بیر تیژکردن و لەبەر کردن .

٤ ـ خواردنی مێووژ .

٥ ـ خوێندنەوەی قورئان و کتێبی بە سوود و بایەخدار وەك گۆڤاری ڕێگای ڕاست و کتێبەکانی زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست و زنجیرەی پەروەردە و بانگەواز و هاوشێوەکانی لە بڵاوکراوەکانی ئەهلی سوننە .

**پ١٣٣ / ئایا ئەم پرۆژانە کە لە کەناڵە ڕاگەیاندنەکانەوە ئامادەی دەکەن**

وەڵام /

هەموو ئەو جۆرە کردەوانە بەو شێوازە بیدعەن و ناشەرعین ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو شێوازە و لەو کاتانەدا لەو جۆرە کردەوانەی نەکردووە و هانی موسڵمانانیشی نەداوە بۆ کردنیان بەو شێوەیە ، هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەری (ﷺ) کاری لەو شێوازەیان نەکردووە لە کاتێکدا کە ئەوان لە موسڵمانان زیاتر حەزیان لە کاری خێر و چاکە بووە کە چی ریوایەت نەکراوە کەوا کارێکی لەو شێوازەیان کردبێت کەواتە بیدعەیە و ناشەرعیە ..

جا ئەگەر دەتەوێت ببیتە کەسێك لەوانەی کەوا زۆر یاد و زیکری خوا دەکەن ئەوا دەبێت ئەوا کتێبە باوەڕپێکراوانە بخوێنیتەوە کە باسی زیکرە سوننەت و شەرعیەکانی تێدایە وەك **(حصن المسلم) و (صحيح الكلم الطيب) و (الوابل الصيب)** ...

# کورتەیەك سەبارەت بە

# ماڵپەڕی بەهەشت

## السلام عليكم ور ة ا وبركاته :

**پێناسەیەکی کورتی ماڵپەڕی بەهەشت :**

ماڵپەری بەهەشت (www.ba8.org) ماڵپەڕێکی سەلەفی زانستی پەروەردەییە و لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئەو ئیسلامەیە کە سەلەفی صالح ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی (ﷺ) ـ لەسەری بوون ، وە سەر بە هیچ گروپ و لایەنێکی حیزبی نییە .

**ڕۆژی دامەزراندن :**

ماڵپەڕی بەهەشت لە **(١٠ / ٣ / ١٤٢٧)** کۆچی بەرامبەر بە **(٨ / ٤ / ٢٠٠٦)** دامەزراوە .

**ئامانجمان :**

١ ـ ئاشناکردنی کۆمەڵگایە لە ئیسلامی ڕەسەن و دروستکردنی تاك و کۆیەتی بۆ تێگەشتن لە سەرچاوەکانی کە بریتین لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیح .

٢ ـ ئاشکرا کردنی ئەو شتانەی کە نامۆن بە ئیسلام و خراونەتە نێویەوە بە چەندین دەستەواژەی دەنگ و ڕەنگ و نوسراو لە بوارەکانی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ئاکار و پەروەردە و زانست و پزیشکی و گەشەی کۆمەڵایەتی ...

**ماڵپەری بەهەشت ئەو کتێب و بابەت و لێکۆڵینەوە شەرعیانە بڵاودەکاتەوە کە دەبنە هۆی :**

١ ـ شارەزاکردنی موسڵمانان و پەروەردەکردنیان لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام ، ئەمەش دەستەبەر دەبێ بە گەڕانەوە بۆ پەیڕەوە رەسەنەکەی ئیسلام ، کە بریتییە لە قورئان و سوننەت ، بە تێگەشتنی پێشین و پێشەوایانی ئوممەت .

٢ ـ پاك کردنەوەی بیروباوەڕ و ڕەوشتی موسڵمانان لە دیاردەکانی شیرك و کوفر و تاوان .

٣ ـ پاڵاوتن و تەصفیەکردنی ئاینی ئیسلام لە بیدعە و بۆچونە داهێنراوەکان .

٤ ـ وریا کردنەوەی موسڵمانان لە شوێنەواری خراپی ڕیوایەتە لاواز و هەڵبەستراوەکان .

٥ ـ پتەوکردنی برایەتییەکی ڕاستەقینە لەسەر بناغە فراوانە جێگیرەکەی ئیسلام و نەهێشتن و کەمکردنەوەی دەمارگیری مەزهەبی و حیزبی کە زاڵبووە بەسەر بیروهۆشی زۆرێك

لە موسڵمانان ، وە بووەتە مایەی پارچەپارچە بوونیان و تەسك كردنەوەی برایەتی و هاوكاری لە چوارچێوەیەكی مەزهەبی و حیزبی دا .

**بەشە سەرەكیيەكانی ماڵپەڕی بەهەشت:**

ماڵپەڕی بەهەشت لە چەندین بەشی جۆراوجۆر پێك هاتوە كە بریتین لەم بەشانەی خوارەوە لەگەڵ كورتەیەك لە باس كردنی بەشەكە :

١ ـ **قورئان و تەفسیر** : لەم بەشەدا هەموو ئەو بابەتانەی كە پەیوەندی بە قورئانی پیرۆز و تەفسیرەوە هەبێت بڵاودەكرێتەوە و لە ئایندەدا بە یارمەتی خوای گەورە هەموو تەفسیری قورئانی پیرۆز بە كوردی لەم بەشەدا دادەنرێت .

٢ ـ **پێغەمبەری خوا** (ﷺ) : لەم بەشەدا هەموو ئەو بابەتانەی كە پەیوەندی بە خودی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هەبێت بڵاودەكرێتەوە و لە گرنگترین ئەو بابەتانەش : (تایبەتمەندیەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، هۆكارەكانی سەرخستنی پێغەمبەر (ﷺ) ...) .

٣ ـ **بیروباوەڕی دروست** : لەم بەشەدا هەموو ئەو بابەتانەی كە پەیوەندیان بە بیروباوەڕ و عەقیدەی موسڵمانانەوە هەبێت بڵاودەكرێەوە بۆ ئەوەی بیروباوەڕیان لە هەموو خورافیات و شیرك و هاوەڵبڕیاردان پاك بكەنەوە .

٤ ـ **كتێبخانە** : ئەم بەشە یەكێكە لەبەشە هەرە بەسوود و گرنگەكانی ماڵپەڕی بەهەشت كە تیایدا زیاتر لە (**١٢٥**) كتێبی كوردی لە بوارەكانی : (عەقیدە ، عیبادەت ، ئافرەتان ، لاوان ، مانگی ڕەمەزان ، موعامەلات ، مێژوو ، هەمە جۆر ....) بڵاوكراوەتەوە و هەموو هەفتەیەكیش كتێبێكی نوێ بڵاودەكرێتەوە .

٥ ـ **گۆڤار** : لەم بەشەدا سەرجەم ژمارەكانی گۆڤاری ڕێگای ڕاست بڵاوكراوەتەوە .

٦ ـ **بڵاوكراوەی زانست** : لەم بەشەدا سەرجەم ژمارەكانی بڵاوكراوەی زانست بڵاوكراوەتەوە .

٧ ـ **پەرستیش و عیبادەت** : لەم بەشەدا هەموو ئەو بابەتانەی كە پەیوەندیان بە پەرستش و عیبادەتەوە هەبێت بڵاوكراوەتەوە .

٨ ـ **ئافرەتان** : لەم بەشەدا كۆمەڵێك بابەتی زۆر بڵاوكاوەتەوە سەبارەت فیقهی شەرعی ئافرەتان و مەرجەكانی باڵاپۆشی و خراپی سفوری و ... زۆر بابەتی هەمە جۆری تر .

٩ ـ **لاوان** : لەم بەشەدا ئەو بابەتانە دانراون کە تایبەتن بە لاوان و ئامۆژگاری بە سوودی تێدایە بۆ لاوان تاوەکو خۆیان لە هەموو فیتنە و فەسادێك بپارێزن .

١٠ ـ **منداڵ و پەروەردە** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك بابەتی بە سوود بڵاوکراوەتەوە سەبارەت بە چۆنێتی پەروەردە کردنی منداڵ .

١١ ـ **گەشەپێدانی مرۆیی** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك بابەتی بە سوود بڵاوکراوەتەوە سەبارەت بەوەی کە چۆن دەبێتە کەسێکی سەرکەوتوو لە ژیانـدا .... لەگەڵ زۆر بابەتی بە سوودی تر .

١٢ ـ **بەهەشتی تەوبەکاران** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك بابەتی بە سوود بڵاوکراوەتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە و خۆیان لە تاریکی تاوان و خراپەکاری ڕزگار دەکەن بۆ ڕوناکی خواپەرستی ، نمونەی ئەو بابەتانەی کە لەم بەشەدا دانراون : چۆن تەوبە بکەم ؟ مەرجەکانی تەوبە کردن چیە ؟ نیشانەکانی قەبوڵ بونی تەوبە چیە؟ بۆچی تەوبە بکەم؟ ...

١٣ ـ **مێژووی موسڵمانان** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك بابەتی بە سوود بڵاوکراوەتەوە سەبارەت بە مێژووی موسڵمانان .

١٤ ـ **ژن هێنان و شوو کردن** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك بابەتی بە سوود بڵاوکراوەتەوە بۆ ئەو کەسانەی کەوا بە نیازی پێکەوەنانی ژیانی هاوسەرگرین .

١٥ ـ **مانگی ڕەمەزان** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك بابەت و کتێب و پرسیار و وەڵامی بە سوود بڵاوکراوەتەوە تایبەت بە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان .

١٦ ـ **سیاسەتی شەرعی** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك بابەتی بە سوود بڵاوکراوەتەوە سەبارەت بە سیاسەتی شەرعی و سەرجەم ئەو دیدار و چاوپێکەوتنانەی کە گۆڤار و ڕۆژنامەکان لەگەڵ مامۆستایانی سەلەفی ئەنجامیان داوە بڵاوکراوەتەوە.

١٧ ـ **پزیشکی** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك بابەت و پرسیار و وەڵامی پزیشکی بڵاوکراوەتەوە .

١٨ ـ **چیرۆك** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك چیرۆکی بە سوود بڵاوکراوەتەوە کە هانی گەنجان دەدات بۆ تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە .

١٩ ـ **زیکرەکان** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك لە زیکری ڕۆژانـەی موسـڵمان بڵاوکراوەتـەوە ، لەگەڵ کۆمەڵە بابەتێك لەسەر فەزڵ و گەورەیی زیکری خوا و سودەکانی .

٢٠ ـ **وەڵامی گومان و ڕەخنەکان** : ئەم گۆشەیە تایبەتە بە وەڵامی گومـان و ڕەخنـەکان لەسەر ئیسلام و قورئان و سوننەت و مێـژووی ئیـسلام ، وە هـەر شـتێك پەیوەنـدی بـە ئـاینی پیرۆزی ئیسلامەوە هەبێت ، ئەمەش دوای ئەوەی بینیمان لە گۆڕەپـانی ڕۆشـنبیری کـوردی‌دا چـەند کـەس و قەڵـەمێك ئەیانـەوێت جـوانی ئیـسلام بـشێوێنن ، وە سـەر لـە نـەوەی نـوێی موسـڵمانان تێـك بـدەن بـە تایبـەت لـە توێـژی خوێنـدکارانی زانکۆ و پـەیمانگاکان لـە ڕێگـەی وەرگێڕانی کەلتوری هەڵەی بێگانە بە ناوی فەلسەفە و عەقڵانیەت و نوێخـوازی و مەعریفـەوە ! لە کاتێکدا هەموو ئەوانە وەڵامی تێروتەسەلیان هەیە و بە توندی لە مێـژووی زێـڕینی ئیـسلامدا ڕەتکراونەتەوە .

٢١ ـ **فیقهی شەریعەت** : لەم بەشەدا هەموو بابەتە فیقهیەکان بڵاوکراوەتەوە وەکو بەشی پاك و خاوێنی ، بەشی نوێژ ، بەشی ڕۆژوو ، بەشی زەکات لە کتێبی (**فقه السنة**) ، وە هەروەها بەشی پاك و خاوێنی لە کتێبی (**الوجیز فقه السنة والکتاب العزیز**) .

٢٢ ـ **حەرامکراوەکان** : لەم بەشەدا هەموو بابەتەکانی کتێبی **( رمات ال إستهان بـها الناس ب ا ذر منـها)** بڵاوکراوەتـەوە کـە بـاس لـە زۆرتـرینی ئـەو بابەتانـە دەکـات کـە لـە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام‌دا حەرامکراون و لە ناو خەڵکی‌دا پشتگوێ خراون و فەرامۆش کراون ، وە هەر باسێکیشی هێنابێ بەڵگەی بۆ هێناوەتەوە لە قورئان و سوننەت بـۆ ئـەوەی خوێنـەر لەسەر چاوڕۆشنی پێ هەڵگرێ و بە بەڵگەوە حەرامەکان بناسێ .

٢٣ ـ **وتـاری مامۆسـتایان** : لـەم بەشـەدا کۆمـەڵێك وتـاری مامۆسـتایانی سـەلەفی بڵاوکراوەتەوە لەوانە وتارەکانی : مامۆستا عبداللطیف ، مامۆستا عبدالکریم ، مامۆسـتا محمـد عبدالرحمن ، مامۆستا ڕێباز چەمچەماڵ ، مامۆستا ڕەمەزان کەرکوك ...

٢٤ ـ **کۆمپیوتـەر** : لـەم بەشـەدا کۆمـەڵێك بابـەت و بەرنامـەی کۆمپیوتـەری بـە سـوود دانراون .

٢٥ ـ **هەمەجۆر** : لەم بەشەدا هەموو ئەو بابەتانـەی کـە لـە بەشـەکانی سـەرەوە جێگایـان نابێـتەوە ئەوا لە بەشی هەمەجۆر دانراون ، ئەمە جگە لەوەی کـە هـەر لـەم بەشـەدا کۆمـەڵێك

بابەت سەبارەت بە بۆنە و یادەکان بڵاْوکراوەتەوە وەکو : درۆی نیسان ، حوکمی ئاهەنگ گێڕان بۆ سەری ساڵی زاینی ، ڤالەنتاین ....

٢٦ ـ **گوڵبژێری فەتوا** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك فەتوای زانایان گوڵبژێرکراون و لەم بەشەدا دانراون .

٢٧ ـ **لینکەکان** : لەم بەشەدا کۆمەڵێك ناونیشانی سایتی زانایان و کۆمەڵێك سایتی سەلەفی کوردی دانراون .

٢٨ ـ **گۆشەی پرسیار و وەڵامی شەرعی** : ئەم گۆشەیە لە هەموو بەشەکانی تر خوێنەری زیاترە ، چونکە زیاتر لە (٥٠٠) پرسیار و وەڵامی شەرعی تێدایە لە بوارەکانی (قورئان ، فەرموودە ، عقیدە ، نوێژ ، زەکات و سەرفترە ، ڕۆژوو ، حەج ، دەست و نوێژ و غوسل ، ئافرەتان ، ژیانی ژن و میردایەتی ، حوکمی خۆشەویستی و دڵداری ، موعامەلات ، ڕاوێژکاری ، هەمەجۆر) وە وەڵامەکان بە پێی بەڵگەکانی قورئان و سوننەت لە لایەن مامۆستایانی سەلەفیەوە وەڵام دراونەتەوە بە شێوەیەکی زۆر جوان و ڕوون ، وە ڕۆژانەش پرسیار و وەڵامی تری بۆ زیاد دەکرێت لە سەرجەم بوارەکاندا.

**لە کۆتایدا :**

داواکارم لە خوای پەروەردگار ئیخلاص بخاتە نێو کار و گوفتارمانەوە و ماڵپەڕی بەهەشت بکاتە توێشویەك بۆ قیامەتمان ، وە داواکارم لە هەموو موسڵمانان لە دوعای خێر بێ بەشمان نەکەن .

**والسلام عليكم ور ة ا وبركاته**

**براتان :باوكی مد**

**بەڕێوبەری**

**ماڵپەڕی بەهەشت**

www.ba8.org

٠٧٧٠١٥١٧٣٧٨